# کاروان

گۆڤارێکی رۆشنبیری ی مانگانەیە

ئەمینداریتی ی گشتی ی رۆشنبیری و لاوان

بەزمانی کوردی و عەرەبی دەری دەکا

20 مایسی 1984 سالی دووەم



لەم ژمارەیەدا


- ● لە یادی نەمراندا : بشیر حسین سعدی 2
- ● مێژوو : عەلی فەتاح دزەیی ، د. کەمال مەزهەر .. 5
- ● رەخنە : مسعود محمد .. 17
- ● لێکۆڵینەوە : نزار محمد سعید ، محەمەد عەزیز مەلا رەحیم .. 26
- ● زمانەوانی : حجی جعفر ، د.وریا عمر امین ، محمد امین هەورامانی 31
- ● دیوانی کاروان : شێرکۆ بێکەس ، ملا مسعود بێبەش ، عصمت محمد بدل ، د. شۆ ، نعمت عبدالله ، محسن ئاوارە ، هاشم محمد مصطفی ، ئیسماعیل تاها شاهین ، رازی .. 49
- ● جیهانی چیرۆک : بکر باراوی ، کەمال عەولا ، صدیق خالد هروری ، دکتۆر هیوا عومەر ئەحمەد ، خالد صالح حسن ، بهجت توفیق عبدالله .. 55
- ● زانیاری : جەلال تەقی ، صدیق شیخ محمود بەرزنجی .. 68
- ● تەندروستی : د. فیصل عارب بلباس ، د.نافیع ئاکرەیی .. 79
- ● رۆشنبیری گشتی : بهجت محمد هروری ، عبدالله بابە علی بەرزنجی . 84


ئەدرەس : هەولێر ـ ئەمینداریتی گشتی رۆشنبیری و لاوان ـ گۆڤاری (کاروان) ت 20882



# کـۆچی دوایـی خوالێ خۆشـبوو

# مەلا حسین شێخ سعدی

بشیر حسین سعدی

1983 — 12 — 22

بە بۆنەی کۆچی دوایی خوالێ خۆشبوو مەلا حسین شیخ سعدي، دەمانەوێ چەند لایەکی ژیان و دانراوەکانی خوالێخۆشبوو ڕوون بکەینەوە بۆ خوێندەوارانی کوردی خۆشەویست.

مامۆستای گەورەمان مەلا حسین شیخ سعدي لە ساڵی 1883 لە شاری هەولێر لە گەڕەکی خانەقا هاتوەتە دونیاوە.

لە خێزانێکی ئایین پەروەردا هەر لە سەرەتای ژیانی باوکی دەیخاتە بەر خوێندنی فەقێیەتی لەمزگەوتی ناو بازاری هەولێر کە بەمزگەوتی گەورە ناسراوە.

هە لەسەرەتای خوێندنی لە ناو هاوڕێکانی بەزیرەك و تێگەیشتوو ناوی دەرکردبوو. پاش ئەوە لەسەر عادەتی فەقێیەکانی ئایینی لە زۆر مەدرەسەی جۆراو جۆر گەڕاوە، لە گوندەکانی سکتان و هیران و شاری کۆیە و هەولێر خوێندنی تەواو کردووە. لە تەمەنی (30) سی ساڵی دامەزراوە بۆ یەکەم جار بەمەلا لە گوندی قەپلان لە ناوچەی دزەیی لە ساڵی 1913 ی زایینی.

ودلەو ماوەی کە مەلایەتی کردووە خەریکی دەرس ووتنەوە بووە بەفەقێیان و، تەماشاکردنی پەرتووکەکانی ئایینی و شەرع و تەفسیرو فەرموودەکانی پێغەمبەر بووە. لەچەند دێیان مەلایەتی کردووە پاش ئەو ماوەیە دوایییەکەی لە ساڵی 1930 هاتودتە گوندی دووگردکان وەلە ساڵی 1947 گوندی بەجێ هێشتووە هاتوەتە شاری هەولێر دامەزراوە بە مەلا لە ئەوقاف لە ساڵی 1948 ی زایینی. وە لە ساڵی 1971 ی زایینی خانەنشین کراوەو، لەو ماوەیەی پاشی خانەنشینی لەماڵەوە دەرنەچووە هەر خەریکی تەماشاکردنی پەرتووك و نووسین و قورئان خوێندن بوو. هەتا لە بەرەبەیانی ڕۆژی یەکشەم سەعات (10) ی بەیانی لە بەرواری 1982/12/11. کۆچی دوایی کرد. لە تەمەنی سەد ساڵی دا.

### * دانراوەکانی خوالێخۆشبوو *

1 ـ تەفسیری هەر (30) سی جزئی قورئانی پیرۆز بەزمانی کوردی.

لە سەرەتای ژیانی بیری لەوە کردووتەوە کە تەفسیری قورئانی پیرۆز بکاتە کوردی. لەو کاتەی کە مەلایەکانی ئەو سەردەمە هەموو دانراوەکییان یان بە عەرەبی یان بە فارسی بووە هەتا نامەی نێوان خۆشیان بەشی زۆری هەر بە فارسی بووە وەخۆی ئەی فەرموو ئەگەر لەکاتی دەرس گوتنەوەشدا بگەیشتبانایە ئایەتێك دەیانگوت لێ گەڕێ ئەمە ئایەتە مەعنا لێدانەوەی دروست نییە کافر دەبی.

ئەویش لەوەڵامی ئەوانە دەیگوت باشە ئەی ئەم قورئانە پیرۆزە بۆ ئەمە نەهاتووە کە خەڵکی تێی بگا؟. ئەم قورئانە

پەیامێکە خودا ناردوویەتی یە خوارەوە بۆ خەڵکی کە ڕێگای ڕاستی یان نیشان بدا. وەراژەی مرۆڤایەتی بکا جا ئەگە لە ناو کوردەواری مانای نەزانرێ چۆن دەتوانرێ پەیڕەوی بکرێ.

بۆیە هەروەك خۆی زۆر جار ئەیفەرموو دەستم کرد بە کۆکردنەوەی زیاتر لە پانزە تەفسیری جۆر بەجۆر وەدەستم بەدانانی ئەم تەفسیرە کوردی یە کرد هەر لە ساڵی (1925) هەتا ساڵی (1930). لەم ساڵەدا کە دەکاتە ساڵی (1350) ی کۆچی لە یەکی مانگی ڕەجەب تەواو بوو. ئەم تەفسیرە دەکەوێتە شەش بەرگەوە. هەتا ئێستاش سێ بەرگی لێ چاپ کراوە. بە رگی یەکەم و دووەم و سێیەم. ئێستاش خەریکی چاپ کردنی بەرگی چوارەمی ئەم تەفسیرەین. ئەمانەتی ڕۆشنبیری و لاوان یارمەتی بەرگی یەکەم و دووەمی دا بەسوپاسەوە.

2 ـ هەڵبەستەکانی: ـ خواڵێخۆش بوو نووسین و مطالعەو دانان بەشێك بوو لەژیانی هەڵبەستی زۆریشی بەکوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی داناوە بەڵام ئەوەی جێی داخە ئەوەیە لە ساڵانی 1940 واتە چلەکان صالح زەکی بەگ متصرفی هەولێر دەبێ. داوای دیوانەکەی لێ دەکا ئەویش دەیداتێ ئیتر بۆی ناگەڕێنێتەوە بەم جۆرە بەشی زۆری هەڵبەستەکانی بزر بوون وەئەوەی کە ماوە ئەم هەڵبەستانەیە کە لەم دیوانە نەبووە یان پاش ئەوکاتە دایناوە بۆ نموونە ئەوا لە خوارەوە چەند هەڵبەستێکتان دەخەینە بەرچاو. بەشی زۆری هەڵبەستەکانیشی فەلسەفی و ئایینی یە وە هەندێکیشیان (غەزەل)ن واتە هەڵبەستی دڵداری بوون وە ناز ناوی لە هەڵبەستدا (فانی)یە. وەلەم دوایی یەدا لەهەندێ لەهەڵبەستەکانیدا ناز ناوی «کاکە» ی بە کار دەهێنا.

**هەڵبەستی فەلسەفی.**

گوڵ لەبەر مەغروری کەی هەیتی سەری پەروایی من
کەی لەسەر کێشی درك دەڕوا لەژێری پایی من
بۆ شکستی من فیراقت هیچ قصورێکی نەکرد
کاغەزێکی پڕ لە پێچ و لوچە سەر تاپایی من
هەر وەکوو نەقشی قەدەم من سەرفیرازیم بۆ چی یە
خاکساری تێ دەگەی بنواری یە سیمایی من
دامەنت بۆ لادەدەی (فانی) لە دونیا کەی دەگا
ناوی ئەم بەحرە بەپشتی پێی ئیستیغنایی من

**هەڵبەستی ئاینی**

**چوار خشتەکی: ـ**

ئەی لەئەندامی مەدینەت جسمی تو ڕووحی ڕەوان
دینی پاکت دایە بەر خۆی قاف تاقاف جیهان
مەه لە ئیعجازت دوو لەت بوو دینی گرتە خۆی
مەسکەنت بوونی مەدینە قابە قەوسەینت مەکان

واتە: مەه بە فارسی مانگە ئەو مانگە ووشەی (دین) کەوتە ناوی ئەبێ بەمەدینە.

(م دین ه) مەدینە.

لەم هەڵبەستەشدا باسی ژیانی ڕۆژانەی خۆی دەکا لەو کاتەی لە دەشتی هەولێر مەلایەتی کردووە ئەڵێ:

گەه مەدرەسەو گەه تەکیە گەه جێم نادی ئاغەوات
دانیشتوو لەیەك جێگا شارەزای ئەطوارنی یە
لەجەهلی دەشتی هەولێر دڵم ڕوناك ساخە
صەیقەلی ئاوێنەی من بە غەیری ژەنگار نی یە
مەرتەبەی ناکەس و هیچ لای ناکەسان بلندە
بۆیە کە جێگای درك غەیری سەر دیوار نی یە
تاڵ و شیرنی قسەم تابعی حاڵی خۆمە
ناڵەیی زیندانی غەم نەغمەیی گوڵزار نی یە
دڵ کە سووتا مەحو بوو (فانی) چە باکت هەیە
بەردی حادثە بابێ بادەیی سەر شار نی یە

**«هەڵبەستی فەلسەفی»**

**چوارخشتەکی: ـ**

باکم چی یە لەدەوری فەلەك چی دەکا بکا
جارێ منی بلند نەکرد چونم لەعەرد دەدا
بێ باکە (فانی) لەفەقرو فەنا چونکی هەردەمێ
دەستم لەسەر دڵم بێ گەوهەر بێ عەدەد دەدا

**«غەزەل»**

دانەی دورە دندانی بەقەد سەروە مەمەی مەی
حوسنی خەتەری تورك و عەرەب هیندو کووردەی ڕەی
بەم جیسمە پەری جان و ئەندامی درەخشان
مروەت نی یە تۆ لاف تەقابول لەجو دەی دەی

یەك بۆ سەكە سەر شارە لەجامی لەبی سورخت
كەی بوی بووە جمشیدو كەی آسكندرو كەی كەی
پێم گوت وەرە پڕ نەشئەیە ماچی لەبی لەعلت
فەرمووی بڕو مردووت مرێ جێگەی نییە هەی هەی
(فانی) وەمەكە عومری عەزیزت بەفەنا چێ
بێ فائدە مایەت مەكە وەك حاتەمی طەی طەی

**هەڵبەستی نیشتمانی: -**

لەساڵی 1942 لەكاتی شەڕی جیهانی دووەم هەڵبەستێكی دوورو درێژی داناوە بۆ نەتەوەكەی خۆی كەسەرە تاكەی ئەمەیە: -

وەرن ڕێك كەوین ئەی كوردی هەژار
بێ ترس بەردێك بۆ قەل چەند هەزار
لەپاش صلاحو مظفر الدین
تاكەی زەبوون بین ژێر دەستی ئەغیار

وەدەربارەی هەڵبەستی ئایینی شاكاری ئەم مەیدانەی وەرگێڕانی قەسیدەی بوردیەیە بۆ سەر زمانی كوردی. بۆ وێنە ئەم نمونەیەی خوارەوە دەخەمە بەر چاو.

1 - أمن تذكر جیران بذی سلم
مزجْتَ دمعاً جری منٍ مقلة بدم

ئەرێ لەیاد كردنەوەی مەحبوبێكی بەسەلەم
بەخوێن تێكەڵ كراوی رژاندن فرمێسكی غەم

2 - أم هبَّت الریح من تلقاء كاظمة
وأومض البرق فی الظلماء من اِضم

یا بای مەدینەت بۆ هات بێنی مەحبوبی هێنا
یا بروسكی تاریكی پێی نیشان داوی (اِضم)[1]

3 - فما لعینیك أن قلت أكففاهمتا
وما لقلبك أن قلت أستفق یهم

چیتان چاوت گەر بڵێ مەگرین لەئاو هەڵدەڕێژن
بڵێ ئەی دل بەهۆش بە ئەخزیتە حیرەتو غەم
وەلە پاش هەر دێڕەك لەم قەسیدەیە ئەم بەندەی دەگێڕدرێتەوە

(مولای صل وسلم دائماً أبداً)
(على حبیبك خیر الخلق كلهم)

خوایە بڕێژە ڕەحمەت بەسەر چاترینی عالەم
لەگەڵ ئالو ئەتباعی شەوو ڕۆژ بەهەموو دەم

**3 - وەرگێڕانی فەرموودەكانی پێغەمبەر بۆ سەر زمانی كوردی**

لە ساڵی 1949 خوالێخۆشبوو تووشی نەخۆشی سەر سووڕان هات، نەی دەتوانی بگەڕێو شەویش خەوی كەم ببوو لەم كاتە بیری كردەوە لەوەرگێڕانی فەرموودەكانی پێغەمبەر بۆ سەر زمانی كوردی. لەو ماوەیەدا. وەهەر لەساڵی 1949 هەتا ساڵی 1959. واتە دەساڵ هەر خەریكی ئەم كارە بوو. توانی كتێبی بوخاریو مسلمو جامع الصغیر كەدەكەوێتە شەش بەرگی گەورە وەربگێڕێتە سەرزمانی كوردی كەهێشتا بەچاپ نەگەیینراوون.

**4 - چوارینەكانی عمر الخیام:**

پاش ئەو ماوەیە خەریكی وەرگێڕانی چوارینەكانی عمر الخیام بوو لە فارسییەوە بۆ عەرەبی بەناوی حقائق الخیام. كە هێشتا لەچاپ نەدراوە وەخوالێخۆشبوو زۆر ئەو پەرتووكانەی دەخوێندەوە كەباسی علمی (وحدة الوجود) دەكا هەر لەسەر ئەم مەبەستە چوارینەیەكی هەیە دەڵێ:

ئەی كەرەمت هەم نەفەسی بێ كەسان
بێ توو نییە هیچ كەسی بێ كەسان
بێكەسمو هەم نەفەسم هەر ئەتووی
روو لەچەكەم ئەی كەسی بێكەسان

ئا بەم جۆرە ئەم ژیانەی هەمووی لە خواپەرستیو راژەی ئایینی ئیسلامیو ئەدەبی كوردی بردووەتە سەر. داوا كارین لە یەزدانی پاك بیبوریو بیباتە ڕیزی خۆشەویستانی خۆیو وێنەی زۆر بكات لە ناو نەتەوەكەمان.

# هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی کتێبی مێژووی دوکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد

عەلی فەتاح دزەیی

دوکتۆر (کەمال مەزهەر) ، هەمیشە کتێبی مێژوویی ئەوتۆ پێشکەش بە کتێبخانەی کوردی دەکا کە لە هەموو بارێکەوە شانازی پێوە دەکرێت و کەلێنەکی گەورە لە زانیاری مێژوو دەربارەی نەتەوەکەمان پڕ دەکاتەوە . تازەترین بەرهەمی خستوویەتی یە بەردەستی خوێنەرەکانی کتێبی (مێژوو)ە . ئەمەشیان لەوانیتری کەمتر نیە ئەگەر بالاتر نەبێ . ئەم کتێبە ساڵی (1983) لە (384) لاپەڕەدا بەچاپێکی خاوێن ، بەکاغەزی سپی لەبەرگێکی جواندا چاپ و بلاوکراوەتەوە .

دانەر ، کتێبەکەی پێشکەش بەمێژوو نووسەکانی کوردی پێشخۆی کردووە : (شەرەفخان) . (مەلا مەحموودی بایەزیدی) ، (موحەممەد ئەمین زەکی) . خۆزیا ناوی (حوسێن حوزنی موکریانی)ش لەریزی ئەمانە ، دابنرایە .

ناوەرۆکی کتێبەکە . بەسەر سێ بەشی سەرەکیدا ، دابەش کراوەو دەتوانرێ بەشی بیبلیۆگرافیاکەی ، بە هی چوارەم دابنرێ . بەشەکانیشی بەم جۆرەی خوارەوەن :

بەشی یەکەم :

چەند تێبینییەك دەربارەی مێژوو .

بەشی دووەم :

- مێژووی مێژوو
- مێژوو لەقۆناغی دەرەبەگی و سەردەمی ڕێنیسانسدا
- ڕێبازی ڕۆمانسی لەمێژوودا .
- مێژود لەتەرازووی سۆشیالیزمی یۆتۆبی و لیبرالیدا .
- مێژوو لای هیگل و مارکس .
- زانستی مێژوو لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەمدا
- زانستی مێژوو دوای شەڕی یەکەمی جیهان

بەشی سێیەم :

- کوردو مێژوو
- ڕۆژنامە نووسی کوردو مێژوو .
- دەستەی دووەمی مێژوو نووسانی کورد
- دواکورتەی لاپەڕەی مێژوو نووسیی کوردی نوێ

ئەنجام .

بەشی چوارەم (لە کتێبەکەدا ئەمەنیە) .




کورتەی بیبلیۆگرافیای مێژوو نووسیی کوردی .

زنجیرەی بەش و باسەکانی کتێبەکە ، وەکو لەسەرەوە باسکرا وەهایەو ، دەقی پێرستەکەشی هەر بەم جۆرە . ناوی بەشەکانی و ناوی باسەکانی‌یان وەکو یەکتر ، بە تیپیی درشت چاپ کراون . ئەمەش وا لەخوێنەر دەکا نەتوانێ بێ وورد بوونەوە زنجیرەی باسەکان بەیەکتر بلەکێنێ . دەبوایە ئەم لایەنە رەچاو بکرایەو ناوی باسەکان بەتیپی ووردتر چاپ بکرایەو ژمارە شیان بۆ دابنرایە .

●

بەشی یەکەمی کتێبەکە لەبارەی زانستی مێژووە . پەیوەندی ئەم زانستە بەزانستی‌یەکانیکە دیاری دەکا . لێرەدا مانای (مێژوو) لێکدراوەتەوەو دوو لایەنی بنەرەتی شیی کراوەتەوە :

یەکەم : کێ یەمێژوو دروست دەکات و رووداوەکانی بەرپا دەکات ؛ مرۆڤی دەسەلاتدار ؟ یا کۆمەلانی خەلك ؟

دووەم : ئاخۆ مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوە ؟

دانەر ، بەدرێژی ئەم دوولایەنەی روون کردۆتەوەو ، وەلامی پرسیارەکانی داوەتەوە ، دەوری مرۆڤی هەلبژاردەو ، کۆمەلانی خەلك و هۆیەکانی دەوروبەر ، لەبزواندنی رەورەوەی مێژوو ، دیاری دەکا .

هەروەها گەلێك کەسیی ناودارو گەلێك رووداوی مێژوویی دەخاتە ژێر تیشکی لێکۆلینەوە . سروشتی کەسەکان و بنچینەی رووداوەکان بەووردی شی‌دەکاتەوە . هەروەهاش ، باسی لەکارو فرمانی مێژوو نووسی کردووەو زۆر وێنەی نیشانداوە . یەکێك لەمانە ، کتێبی (ماری ئەنتوانێت)ی نووسەری بەناوبانگی نەمسایی (ستیفان زفایچ)[1]ە . لێرەدا بەرامبەر بەتێبینی‌یەکانی دانەر ، دەمەوێ ئەم لایەنەش بخەمە بەرچاو .

راستە هەزاران سەری لەهی ئەم شاژنە جوانتر هەبوون ، گەر بهاتایە رووداوەکانی ئەو رۆژی فەرەنسا رێگایەکی پێچەوانەی بگرتایە ، لەجیاتی سەری ئەم قووت دەکران . بەلام سەری ئەمیش تەنیا سەر نەبووە بەلکوو یەکێك بووە لە هەزار . زۆری وەك (مەدام رۆلان)[2] و (لافوازیە)[3] بە دەستی هەمان (دێوەزمە) بێ‌سەر کرابوون . تەنانەت (رۆبسپیر) یش ، نۆرەی هاتووەو ئەم باجی سەرەی داوە . لام وایە هەلسەنگاندنی خوێنی رژێنراو کارێکی ئەوەندە ئاسان و ئاسایی نیە .

بەشی دووەمی کتێبەکە لەبارەی مێژووی مێژووە . لە حەوت باسەکانی ئەم بەشەدا ، پوختەی بەسەرهاتی زانستی مێژوو ، سەرچاوەکانی ئەم زانستەو قۆناغەکانی باس کردووە . راستی‌یەکەی لە چوارچێوەیەکی فراوان و پانو رامیدا ، لەسەرەتای پەیدا بوونی‌یەوە دواوە تاوەکو رۆژانی ئیمپرۆمان . تەماشای ئەفسانەو داستانەکانی ، سۆمەری و یۆنانی و هیندی کردووە . لەمێژوو نووسەکانی یۆنانی و رۆمانی و لەوانەی سەدەکانی ناوەراست دوواوە تا گەیشتۆتە سەردەمی (رێنیسانس ـ نهضە) . لێرە بە دواوە ،

بە پشوویەکی درێژتر ، قۆناغ بە قۆناغ شوێنپێی ئەم زانستەی هەڵگرتووەو لەهەموو قوژبنێکەوەش سەرنجی داوەتێ . بە کورتی ، هەڵوێستی پیاوانی کلیسە (ئەکلیرۆس) ، ئەنسیکلۆپیدی‌یەکان ، زاناکانی زانستی کۆمەڵایەتی (علم الاجتماع ، فەیلەسووفەکانی ئایدیالی‌و ماتیریالی (مثالی‌و مادی) ، بەرامبەر بەمێژوو روون کردۆتەوە جگە لەمەش ، لە سەرتاسەری باسەکانی ئەم بەشەدا ، زۆر بە ووردی ڕاو بۆ چوونی تایبەتی‌ی خۆی دەربریوە .

خۆزیا لەم بەشەدا ، دانەر کەمێکی لەبارەی (ئەرکیۆلۆژی) بنووسیبایەو دەوری زاناکانی ئەم زانستەی بنرخاندایە ، کە پەردەی ئەستووری هەزاران ساڵەیان لەسەر رووی جوانی شارستانی‌یە کۆنەکان هەڵماڵیوە .

دەشبوایە پێوەندی زانستی مێژوو بەزانستی کۆمەڵایەتی روونتر بکرایە . دوور نیە ، خوێنەری ئاسایی ، (سان سیمۆن) و (فۆرێە) ، بە دوو مێژوو نووس بزانن نەك دوو زانای زانستی کۆمەڵایەتی (علم الاجتماع) ، جگە لەمەش مەبەستی سەرەکی ئەم فەیلەسووفانە (هوبس)و (مۆنتسکیۆ)و (رۆسۆ) ئەوە بووە ، کە لە رێبازی فەلسەفەدا ، لە چۆنیەتی پەیدا بوونی رژێم‌و دەسەڵاتی سیاسی (لەنێوکۆمەڵا) ، بکۆڵنەوە ، بۆیەکا ، نووسینەکانیان پتر پێوەندی‌یان بەزانستی حقووقەوە هەیە هەتاوەکو مێژوو .



بەشی سێیەمی کتێبی مێژوو ، لەبارەی مێژووی نەتەوەکەمانە . راستی‌یەکەی ئەم بەشە ، شا گوڵی چەپکی کتێبەکەیە . دانەر ، لەچوار باسەکانی ئەم بەشەدا ، ژینامەی مێژوو نووسەکانی کوردی تۆمار کردووەو لە نووسینەکانی‌یان دواوە ، چ ئەوانی بەزمانی دیکە کتێبی مێژوویی‌یان داناوەو چ ئەوانەی ، بە زمانێتر ، یا بەزمانی کوردی مێژووی کوردو کوردستانیان تۆمار کردووە .

زۆر لە جێ‌یەتی کە لە (ابن الاثیرو ابن المستوفی‌و ابن خلکان)ەوە دەستی پێکردووەو ناویانی لە سەرەتای دەفتەری مێژوو نووسانی کورد نووسیوە .

لەکۆڕی مێژووناسانی خۆمانەدا ، جێگای شەرافەتمەندی بۆ (شەرەفخان) تەرخان کردووەو ناز ناوی (باوکی مێژوو نووسانی کوردی) بۆ داناوە ، دیارە ئەمەش رەوای خۆیەتی . بەدرێژی لەبارەی ژیانی ئەو مێرە گەورەو ئەو مێژوو نووسە رەسەنەی نووسیوەو ، لە هەموو لایەکی یەکەمین مێژووی کوردو کوردستان (شەرەفنامە)ی کۆڵیوەتەوەو ناوەرۆکی بەووردی هەڵسەنگاندووە .

بۆ (مەلا مەحموودی بایەزیدی)ش چەند لاپەرەی بەنرخی پڕ کردۆتەوە باسی لەبەرهەمەکانی کردووەو ئەو راستی‌یەی دەربریوە کە هەم بۆ یەکەمین جار (شەرەفنامە)ی وەرگێڕیوەتە سەر زمانی کوردی‌و هەم یەکەم مێژوو نووسی کوردە . بەزمانی نەتەوەیی مێژووی نەتەوەکەی تۆمار کردووە . شایانی باسیشە کە (مەلا مەحمود) هاو شاری شاعیری گەورەمان (ئەحمەدی خانی) بووە .

پایەی بەرزی (ئەمین زەکی بەگ) لەمەیدانی نووسینی مێژووی کوردو کوردستاندا . بەزمانی کوردی‌و لەسەر رێبازی تازەی زانستی مێژوودا زۆر بەووردی دیاری کراوە لەشاکارەکانی دواوە . دانەر ، باسی لەژیانی ئەم زانایە بێ‌هاوتایە کردووەو وێنەیەکی ئەوەندە جوان‌و شیرینی بۆ کێشاوە کە بەراستی (نووری لە نێوچەوانی دەباری - مێژوو - ل 157) .

ئەو چەند لاپەرەی کە بۆ خواڵێخۆشبوو (مامۆستا موحەممەد عەلی عەونی)ی نەخشاندووە ، شوێنیان لەکتێبەکەدا دیارە . هەر کاتێ (شەرەفنامە) پاشا کارەکانی (ئەمین زەکی بەگ) بێنە زەمینەی باس کردن ، ناوی ئەم زانایە بەرزە ، وەکو پەیکەرێك خۆی دەنوێنێ . شوێنی مامۆستا (عەلی عەونی) لە بڵاوکردنەوە ، بەتایبەت لە راگەیاندنی مێژووی کورد وکوردستان بەجیهانی عارەبیدا ، ئەوەندە بەرزە ، نەهاوتای هەیەو نەبوی دەبێت . لێرەدا ئەم تێبینی‌یە دەمەبەر سەرنجی دانەر :

لەو کتێبی کە دەربارەی رۆژ نامەی (تێگەیشتنی راستی)ی نووسیوە ، (پەراوێزی - ل 62) ، کتێبی (القضیة الکردیة)ەی بەنووسینی (موحەممەد عەلی عەونی) تۆمار کردووە . کەچی لەم کتێبەیدا (مێژوو - ل - 189) هەمان کتێبی

داوەتە پاڵ (میر جەلادەت بەدرخان) ئەمجا دەبێ ئەوەمان بۆ یەکالا بکاتەوە ، لەو دوانە کامەیان (دوکتۆر بلەچ شێرکۆ)ی دانەری (القضية الكردية) بووە .

(حوسێن حوزنی موکریانی) ش ، لەو شوێنە دانراوە کە شایانیەتی ، چەند پەڕەی لەبارەیەوە نووسیوە . ئەوەی روون کردۆتەوە کە یەکەم مێژوو نوس بووە ، دووای (مەلا مەحموود) ، بەزمانی کوردی مێژووی نەتەوەکەی نووسیوەو ، هەر ئەمیش زاراوی (مێژوو)ی بەرامبەر ووشەی (تاریخ) لە (سارستەی ـ لەمێژەوە) دارشتووە" . نەخشی ژیانی پڕ لە مەینەتی ئەم (داماو)ەی کێشاوەو لە چاپخانەی (زاری کرمانجی) دواوە ، کتێبو نووسینە زۆرەکانی نرخاندووە . خۆزیا لێرەدا یادێکی (گیوی موکریانی) بکردایەوە . وابزانم کەم کتێبی براگەورەکەی هەن کە لەچاپکردنیاندا بەشدار نەبووبێ .

پوختەی ژینامەی (میر جەلادەت بەدرخان) ، چەند لاپەرەی قەشەنگی ئەم کتێبە دەرازێنێتەوە . دانەر ، بەکورتی ، لەهەموو لایەکی هەوڵو تەقەلای ئەو میرە زاناو لێهاتووە دواوە ، کەداویەتی بۆ بڵاوکردنەوەو بۆ نووسینی ووتارو کتێبی مێژوویی لەبارەی نەتەوەکەیەوەو بەچەند زمانێکەوەش . هەر لەم زەمینەدا . خەباتی بەردەوامی بنەماڵەی بەرزی (بەدرخانی)ی چاك نرخاندووە .

شوێنی ماموٚستا (عەلی سەیدۆ گۆرانی)و نووسینەکانی لەم کتێبە نایابەدا ، گەلێك بەرچاوە . رەنگە ، کەم لەخوێنەران ئەم زانایە گەورەو ئەم کوردە دلسۆزە بناسن ، ئەو کوردەی کە لە دەرەوەی خاکی کوردستان هاتۆتە جیهانو چاوی کردۆتەوە ، کەچی هەرگیز نەتەوەو رەگەزی خۆی لە بیرنەکردووە . دوای ئەوەی کە بروانامەی (بەکەلۆریۆس)ی لەزانکۆی ئەمەریکی ، لە (ربیرووت وەرگرتووە ، بەگەورەیی‌و ، بە هۆی کتێبو گۆڤارە کوردی‌یەکانی کە (میر جەلادەت بەدرخان) دەری دەکردن ، خۆی فێرە زمانی کوردی کردووەو ، گەلێك کتێبو ووتاری بەنرخی لەبارەی نەتەوەکەی نووسیوە . ئەو دەمەی من (نووسەری ئەم ووتارە) لە زانکۆی (دیمەشق)م دەخوێند ، ساڵی (1956 یا 1957) ، لەسەر داخوازی‌ی (رەوشەن خانم بەدرخان)و لەماڵە گەورەی ئەم خانمە کوردە بەرێزەدا بەدیداری ماموٚستا (عەلی سەیدۆ گۆرانی) گەیشتووم . ئەو کاتە (کۆنسوڵ)ی (ئوردون) بوو لەشاری (جیدا)ی سعوودی‌یە . خۆی . چۆنیەتی فێر بوونی زمانی کوردی‌ی ، وەکو بۆ دانەری (مێژوو)ی نووسیوە (مێژوو . ل ـ 197 ـ 198) ، ئەوەهاش بۆ منی گێڕاوەتەوە . لەماوەی دانیشتنەکەدا هەر بەکوردی دەدواین . ئێستاش دێتەوە بیرم ، کە شێوەی قسەکردنی (ماموٚستا عەلی سەیدۆ) ، رەنگی چاپەمەنی‌یە کوردی‌یەکانی پێوەوە دیار بوو ، بە شێوازەکی ئەدەبی‌ی زۆر راستو رەوان قسەی دەکرد .

دانەر ئاورێکی تایبەتیشی لەیادداشت نووسەکان داوەتەوەو ، باسیی لەیادداشتەکانی (ماموٚستا رەفیق حیلمی)و (ئەحمەد خواجە)و (ئەحمەد تەقی) کردووە . خۆزیا لەعاستی ناوی یەکەمیان کەمێك بوەستایەو ، لەچەند دیریکدا ، پوختەی ژیانی ئەو گەورە پیاوەی باس بکردایە .

هەروەها ، لەنووسینە مێژوویی‌یەکانی ماموٚستا (عەلائوددین سەجادی) دواوە . بەکورتیش باسیی لەبەرهەمەکانی (مەلا جەمیل رۆژبیانی) کردووەو ئەوەی نیشان داوە کە بۆ یەکەم جار ، ئەم مێژوو نووسە کتێبی شەرەفنامەی لەزمانی فارسی‌یەوە ، وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عارەبی . کتێبی (مێژووی گەلی کورد)ی خوا لێخۆشبوو (سالح قەفتان) یش بەخوێنەر دەناسێنێو باسی لێوە دەکا .

هەر لەم بەشەشدا ، باسێکی تایبەتی نووسیوە لەبارەی ئەو گۆڤارو رۆژنامە کوردی‌یانەی کە ووتاری مێژوویی‌یان تیادا بلاو دەکرایەوە ، باسیی لەووتارەکانی عوسمان سەبری لە (دیمەشق)و دوکتۆر (ناجی عەبباس) لە بەغدایێ کردووە .

ئەمجا دووا باسیی کتێبەکەی بۆ مێژوو نووسانی تازەی کورد هەڵگرتووەو بە ووردی لەنووسینەکانی دوکتۆر (رەحیمی قازی ، عەزیز شەمزینی ، عەبدولرەحمان قاسملوو ، کاوس قەفتان ، ئەحمەد عوسمان ئەبوو بەکر)ی کۆڵیوەتەوەو نرخاندوویەتی ، بەکورتیش ، باسی لە کتێبەکانی دوکتۆر (موحسین موحەممەد حوسێن) کردووە ، نووسینەکانی (فوئاد حەمە خورشید) و (محەممەدی مەلاکەریم)و (زبێر بلال ئیسماعیل)و (عەبدولرەقیب یوسف) و هی‌زۆر نوسەرانی کەشی خستۆتە بەرچاوی خوێنەر . هەروەها ئەو نووسەرانەی لە

زمانیترەوە کتێب یا ووتاری مێژوویی‌یان کردووە بەکوردی ، لەبیر نەکراون .

دیسان هەر لەم باسەدا ، بایەخی زۆر بەجێی بەمێژوو نووسەکانی کوردی سۆڤیەتستان داوەو لەنووسینەکانیان دوواوەو شوێنی دەکتۆر (قەناتی کوردۆییڤ) و دوکتۆر (جاسمی جەلیل)و (جەلیلی جەلیل)و (شاکرۆی محۆ)و .. ئەوانیکەشی لەرشتەی مێژوو نووسانی کوردوا ، دیاری کردوده . وێرای ئەمەش ناوی کۆمەلیك زاناو رۆژ هەلاتناسی هێناوە کە لەبارەی نەتەوەکەمانیان نووسیوە . جگە لەوانەی کە ناوم بردوون ، دانەر ، باسی لە گەلێك نووسەرانیتر کردووە ، کەکتێب یان نامیلکە ، یا ووتارەکی مێژوویی‌یان دەربارەی مێژووی کورد نووسیوەو ، بەپێویستم نەزانی لێرەدا ناویان دووبارە بکەمەوەو لەقەوارەو چوواچیوەی ئەم ووتارە دەربچم . راستی‌یەکەی (دانەری مێژوو) ، کەسیی نەخستۆتە لاوەو خۆی گۆتەنی ئەوی (دەنکە جۆیەکی)[5] دانابێتە سەر خەرمانی مێژووی نەتەوەکەمان ، ناوی‌بە ئەنقەست وون نەکردووە .

شایانی باسە ، کەبەنجەی ناوەتە سەر کەلێنەکی گەورە ، لە کتێبخانەی مێژووی کورددا ، ئەمیش مێژووی کۆنینەمانە . ئەم لایەنەی بە (بوخچەی نەکراوە) داناوە . راستی‌یەکەی ، لەم زەمینەدا ، مێژوونووسەکانمان هێشتا لەو شوێنەدا چەقیون کە پتر لە پەنجا سال لەوەپێش (ئەمین زەکی بەگ) بە خامەی رەنگین سێ جارو چوار جار دەیکێلاو دەیکێلایەوە[6] .

بەشی چوارەمی کتێبی (مێژوو)ش ، دیارە (بیبلۆگرافیا) کەیەو تیایدا ، بەکورتی ، ناوی نووسەری ئەو کتێبو گوڤارو رۆژنامەو وتارانەی نووماز کردووە کە لەبارەی مێژووی نەتەوەکەمانیان نووسیوەو بۆ ئەوەی مێژوو نووسی کورد ، لەکاتی پێویستدا سوودیان لێ ببینێ .

ئیتر . پێش ئەوەی کۆتایی بەم ووتارە بهێنم ، ئەم راستی‌یە دووپات دەکەمەوە کە کتێبی (مێژوو) لەبارەی ناوەرۆکی‌یەوە گەلێك دەولەمەدو نایابە . سەرچاوەکانی زورن‌و رەسەنن . لە سەرتاپا باسەکانیدا هەست بە روخساری مەوزووعی‌ی دانەری دەکرێت‌و بەدەگمەن جلەوی بۆ هەست‌و ورووژانی دەروونیی شل کردووە . جگە لەمەش ، بەزمانێکی رەوانی کوردی‌و بەشێوازەکی ئێجگار شیرین‌و خۆش نووسراوە . دانەر ، هەمیشە بێ‌قورت‌و بێ‌گری بڕ لە رایە ووردو قوولەکانی دەکا ، خوێنەریش ، زۆر بەئاسانی‌و بەبێ ژانی سەر ، لەمەبەستەکانی حالی دەبێ .

لام وایە ئەمەش ئەو پەڕی ئاواتی نووسەرە . بێگومان ئەم کتێبە لە ریزی پێشەوەی کتێبەکانی کتێبخانەی مێژوویی کوردیدا ، جێگای خۆی دەکاتەوە .

بۆ نووسینی ئەم ووتارە سوود لەم سەرچاوانە بینراوە :

**بەکوردی**

1 ـ مێژوو ... دوکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد
2 ـ تێگەیشتنی راستی = = = =
3 ـ خولاصەیەکی تاریخی کوردوکوردستان ـ جلدی اول . موحەممەد ئەمین زەکی

**بە عەرەبی**

1 ـ شرفنامه . الامیر شرفخان البدلیسی . تعریب محمد علي عوني
2 ـ قیمة التاریخ (دراسة فلسفیة) . جوزف هورس . تعریب : نسیب وهیبة الخازن
3 ـ موجز تاریخ العالم . هـ . ج . ویلز . تعریب ، الدکتور عبدالعزیز جاوید
4 ـ آراء روسو الحیة روسان رولان . تعریب الدکتور محمود زاید
5 ـ قصة الآثار الآشوریة إي . روبستن پایك تعریب یوسف داود عبدالقادر

**بە ئینگلیزي**

Ur Of Chaldea — Leonard Woolley

1 ـ مێژوو ل ـ 27 .
2 ـ ژنێکی ناودار بووە .
3 ـ زانایەکی زانستی کیمیا بووە .
4 ـ مێژوو ـ ل ـ 171
5 ـ مێژوو ـ ل ـ 5
6 ـ بنوارە خولاصەیەکی کوردوکوردستان . جلدی اول . ل ـ 4 ـ 5 .

د . کەمال مەزهەر

# سەرنج دەربارەی «مێژوو» ٨٧

ئەو بەرهەمەی سەرنجی خوێنەران رادەکێشێ و خامەیان دەبزوێنێ دەبێ لەژیانی رووناکبیریدا جێگەیەکی بۆ خۆی کردبێتەوە . زۆر زەحمەتیشە هیچ جۆرە کەلێن و ناتەواوی یەك نەکەوێتە ناو کتێبێکی بە قەوارە گەورەی وەك «مێژوو»ەوە[1] . ماوەیەك لەمەوبەر لە وتارێکمدا باسی خەلاتی «مێژوو»م کرد[2] ، وا لەم وتارەشدا چەند سەرنجێکی هاورێ و برایان دەربارەی دەخەمە بەرچاو کە ، کاریان راست ، گەلێك هەلەیان بۆ راست کردوومەتەوە .

## ١ - «مێژوو» لای مامۆستا حیلمی

دەربارەی نرخاندنە بەرزەکەی مامۆستا حیلمی عەلی شەریف لە رۆژنامەی «هاوکاری»دا[3] هەر ئەوەندە دەتوانم بڵێم بێ ئەندازە بەختەوەرم بەرهەمەکانم بەو رادەیە بە دڵی دلسۆزانی پێشەنگی دەستەی رووناکبیری کورد بن . چەند لایەنێکی وتارەکەی پێویستیان بە کەمێك روونکردنەوەیە ، نەك وەلامدانەوە .

کاکە حیلمی :

ئەو قسەیەی لە «مێژوو»دا گوتراوە کە «رەورەوەی مێژوو هەمیشە بەرەوپێش دەروات ، لەوانەیە بۆ ماوەیەك بووەستێت ، بەلام هەرگیز بەرەوپاش ناگەرێتەوە»[4] پوختەی بیروباوەری زانا کەلەکانی مەتریالیزمی مێژوویی یە . راستە هێلی بەیانی ی زانست بێ قۆرت و بێ کۆسپ هەر بەرەوژوور دەبێتەوەو هێلی بەیانی ی مێژوو راستەوخۆ لە نزمەوە روو لە بەرزی ناکات ، بەلام لەگەل هەموو قۆرت و وەستانەکانیشیدا ئینجا رەورەوەی مێژوو هەر بەرەوپێش دەروات . بێگومان عیراقی رۆژگاری هۆلاکۆ بە نیسبەت رۆژگاری هارونە رەشیدەوە گەرانە دواوە بوو ، بەلام هەر بەو رادەیەش بێ گومان ئەو دانە دواوەیە عیراقی لە رژێمی دەرەبەگی یەوە نەگێرایەوە سەر رژێمی کۆیلەیی ، واتە لەگەل هەموو مەینەتی یەکیدا عیراقی ژێردەستەی هۆلاکۆی خوێنرێژ لە رووی ئەمرازی بەرهەمهێنان و جۆری چەوساندنەوەو رووکەشی ژیاری یەوە هێشتا لەسەروو عیراقی سۆمەر و ئەکەدو بابلەوە بوو . راستە زەبرو زەنگی هۆلاکۆو خوێنرێژی ی چەتەولە دێوەزمەکانی گەلێك لە خێرایی بەرەوپێش چوونی رەورەوەی مێژووی عیراقیان بۆ قۆناغی داهاتو کەم کردەوە ، بەلام بەهیچ جۆر بۆیان نەوەستێنرا . لە مێژووی سەرانسەری جیهاندا کۆمەلگایەك نەبووە لە قۆناغێکی مێژوویی یەوە گەرابێتەوە قۆناغێکی پێش خۆی . گەلان هەموویان بەرەوپێش دەچن ، جیاوازی تەنها لە رادەی خێرایی ئەو بەرەوپێش چوونەدا هەیە . هەر لەبەر ئەوەشە دەگوترێ «رەورەوەی مێژوو وەك میلی سەعات وایە ، بەرەو دواوە ناگەرێتەوە» . خۆ ئەگەر وا نەبێ ئەوساکە مێژوو لە یەکێك لە مەرجە سەرەکی یەکانی زانست بێبەری دەبێ .

دەربارەی شوێنی سەردار لە مێژوودا دەلێم : بەداخەوە زوربەی خوێندەواری کورد لەو باوەرەدان هێزدارو زۆردار مێژوو دەنووسنەوەو هەرچی جەماوەرە داشی دامەی بێهەست و گیانی دەستی ئەوانە . بۆ بەرپەرچ دانەوەی ئەو بیرە ، کەبەلای منەوە هەلەیە ، دەبوو لە «مێژوو»دا زیاترپێ



لەسەر ئەو لایەنەی باسەکە دابگرمو بە شێوەیەکی نائالۆزو بەپێی بۆچوونی خۆم وێنەی ڕاستەقینەی درووست بوونی ڕوداوی مێژوویی بۆ خوێنەر بکێشم . ئەو هەوڵە وا ناگەیێنێ من ، وەك مامۆستا حیلمی دەڵێ ، «بایەخ و وەستایەتی و هەڵکەوتوویی سەرکردەی لێوەشاوەو ڕاستەقینەو هەڵبژاردە»م سەرەوژێر کردووە . دەقی قسەکانم دەربارەی سەرکردەو دەوری لە مێژوودا بەم جۆرەیە :

«ئەم بۆچوونە (واتە دەوری سەرەکیی کۆمەلانی خەڵك) وا ناگەیێنێت تاك دەوری لە مێژوودا نییە . سەرداروسەرۆکی داناو چاونەترسو دووربین دەتوانێت دەوری زۆر گەورە ببینێت ، ئەوەی بەر لە هەموو شت لەسەر ڕادەی تێگەیشتنی ئەرکەکانی ڕۆژگار وەستاوە . ئەو سەردارەی بزانێت چی پێویستەو مەرجی سەرکەوتن لەچیدایە هەڵبەت دەتوانێت دەوری چاكو دیار ببینێت . هەر ئەوانەش بۆ خۆیان سەرداری سەرکەوتوو دروست دەکەن»[4] .

پێم وایە لە ناوەرۆکی هەڵسەنگاندنی شوێنی سەردارو سەرۆکدا بە ئەستووری سەرە موویەك جیاوازی لە نێوان بۆچوونی مامۆستا حیلمیو مندا نییە . لەساڵی 1970وە ، لەدەرسی یەکەمدا کە دێمە سەر باسی شوێنی سەردار لە مێژوودا ڕوو دەکەمە قوتابییەکانمو پێیان دەڵێم :

«گەر باشترینو جوانترین کەرەستە بدەینە دەست وەستایەکی ناشی نیمچە کەلاوەیەکمان بۆ دروست دەکات ، وەستایەکی لێهاتووش هەر لەو کەرەستەیە دەتوانێ کۆشکێکی ڕازاوەمان بداتێ !» .

جا خۆشبەختانە دەڵێم بێ ئەوەی ئاگامان لێك بێ مامۆستا حیلمیش لە وتارەکەیدا پەنای بردۆتە بەر هەمان نموونەی ساکارو سەلمێنەر .

دوور نییە ، وەك مامۆستا حیلمی دەڵێ ، لەو هەوڵەدا کە داومە بۆ کەڵك وەرگرتن لەشێوازی جیاوازی زمانی کوردی بۆم نەهاتبێ . دیارە یەکگرتنی تەواوی زمانی کوردی تا ڕادەیەکی زۆر بەستەیە بە یەکگرتنی تەواوی ئابووریی کوردستانەوە کە دەبێتە هۆی تێکەڵی زیاترو پێکەوە بەستنی توندتری ناوچە کوردەوارییە جیاوازەکان . بە داخەوە لەبەر گەلێك هۆی ئاشکرا ڕەوڕەوەی ئەو دیاردە گرنگە زۆر هێدیو لەسەر خۆ بەرەوپێش دەڕوات . بەلام بەپێی تاقیکردنەوەکانی ئەورووپاو ئەو گەلانەی کاتی خۆی هاودۆخی کورد بوون نووسەرو ئەدیبان دەتوانن لە ڕێگەی بەرهەمیانەوە بەوشەو زاراوی هەڵبژاردەو لەبار مۆتوربەی شێوازێکی سەرەکیی زمانی نەتەوەیی بکەنو دەور لە نزیکخستنەوەی دیالێکتەکانیدا ببینن . دانتێ تۆسکانیی هەڵبژاردو بەوشەی شێوازەکانی تر کەلێنەکانی پڕکردەوەو بەو جۆرە بناغەی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی بۆ گەلی ئیتالی داڕشت . با ئەوەیش بڵێین ئەو وشەو زاراوانەی بەلای ئێمەی بە عومرا چوودا گران دێنە گوێ زۆر ئاسانو ڕەوان دەڕژێنە ناو مێشكو دەروونی منداڵەکانمانەوە . تازە گەڕابوومەوە ، لەگەڵ چەند برادەرێکدا چوینە سەرچاوەی زەڵم . لەوێ لەگەڵ منداڵێکدا کەوتمە گفتوگۆ ، لێم پرسی «لە صنفی چەندی ؟» ، بەخەندەوە گوتی «مامۆستا لە پۆلی دووەم» . منیش وەك خەندەکەی ئەو گەشکە بووم . زۆرم پێخۆشە هەندرێنی خوشکەزام لە ڕێگەی زاراوە کوردییەکانەوە دەتوانێ لە زاراوە لاتینییە قورسەکانی ئەناتۆمیاو کاری پزیشکی باشتر تێبگات .

جا لەوانەیە ، بابڵێین (جفات)ی بادینی کەمن کرنووشی بۆ دەبەمو بەخۆشییەوە لەبریتی «نەقابە»و «یەکیەتی» بەکاری دێنم ، کەمێك گران بێتە گوێی ئێمەو مانان .

دوور نییە وەك مامۆستا حیلمی دەڵێ بێ ئاگا «في

الحقيقة»ی عەرەبی کاری تێکردبموو لە بـریتی (ڕاستێکەیو ئەوی ڕاستبیو ڕاستت ئەوێ)ی خۆمانە لە ڕاستیدام بەکار هێنابێ .

بـەڵام ئـەوەیش ڕاستـە کـە زمـان لە گـەشـەکـردنو پەرەسەندندایـەو کار دەکـاتە سـەر زمانـانو زمانـان کاری تێدەکـەن . لەسەرانسـەری دونیادا زمـانێك نیـیە بتوانێ بەگۆشەگیری بخەملێ ، یا پێشکەوێ . بمانەوێو نەمانـەوێ عەرەبیو فارسیو تورکی لەچەند ڕێگەیەکەوە لەزمانی کوردیدا ڕەنگیان داوەتەوە ، هەروەك چۆن ئـەویش ، بەڵام کـەمتر ، لەواندا ڕەنگی داوەتەوە . مـاوەیەکـە ئینگلیزیو فـەرەنسیو ڕووسیو لاتینیش خەریکن بێ قاچاغ تێکەڵ بـەزمانـەکەمـان دەبنو ئـەوەیش تـا ڕادەیـەکی زۆر بـەرەوپـێش چـوونی کوردنیشان دەدات ، بۆیەکا مایەی بەختەوەرییە ، ئەودیاردە ئاساییە لە زمانە هەرە بەتواناکانی وەك عەرەبیشدا بـەدی دەکرێ . تەنانەت هیچ دوور نییە «في الحقيقة»کەی مامۆستا حیلمی کە ئیستە لەناو عەرەبدا لەڕادە بەدەر باوە لە (in fact)ی ئینگلیزییەوە هاتبێ .

نمونەیەکیتر : دووسێ سـەدە لەمەوبـەر نە لەزمـانی عەرەبیی بەتواناداو نە لە زمانی فارسیی پڕ لە ئـاوازداو نە لەهیچ زمانێکی تری گەلانی ڕۆژهەڵاتی دێریندا زاراوێك نەبوو بەناوی «ڕۆژهـەڵاتی نزیـك» یا «ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاست» یـا «ڕۆژهەڵاتی دوور»ەوە . ئەو زاراوانـە لەگەڵ پـەرەسەنـدنی دەسەڵاتی وڵاتە گەورەکان لەنـاو زمانـە ئەوروپاییەکـاندا دروست بـوون ، هـەرچـەنـدە هیـچ کـامێکیشیـان لە ڕووی جوگرافییەوە ڕاست نین ، چـونکە ئـەو وڵاتەی وەك عیـراقو تـورکیا بـۆ ئەورووپـا ڕۆژهەڵاتێکی نـزیکە بـۆ چـینو ژاپـۆن ڕۆژئاوایەکی نزیکە ، یـا ئەو وڵاتـەی وەك کوریـاو ڤێتنام بـۆ ئەورووپا ڕۆژهەڵاتێکی دوورە بۆ سوریەو ئێـران ڕۆژهەڵاتێکی نزیکە .

کـەچی لەگەڵ ئـەوەشدا سـەرتاپـای زمانـان ئەو سێ زاراوەو ، گـەلێکیتـری وەك ئـەوانیـان بێ هیـچ لارییـەك وەرگرتووەو وەك ئەوان بەکاریان دەهێنن . ئەوکارە ، بە هەموو پێودانێك ، دروستو ڕەوایە .

سوپاسی بێپایانم بۆ هەستی بەرزی برای خۆشەویستم حیلمی عەلی شەریف !

**2 - دەربارەی گەڕانەوەی**
**مامۆستا ئەمین زەکی**

وەك لە لاپەڕە 155ی «مێژوو»دا باسم کردووە دەربارەی گەڕانەوەی مامۆستا ئەمین زەکی لە ئەستەمووڵەوە بـۆعیراق دوو ڕاهەیە . بـەپێی یەکـەمیان دەبێ کـۆتایی حـوزەیران - سەرەتای مـانگی تەممـوزی ساڵی 1924 گـەڕابێتەوە . بـەڵام سانیحە خانی کچی خوالێخۆشبوو تا ئیستەش سوورە لەسەر ئەوەی باوکی ناوەندی ساڵی 1923 گەڕاوەتەوە بەغدا .

من بۆخۆم زیاتر لەگەڵ ڕای یەکەمدام ، بەتایبەتی دوای ئەوەی بەڕێـز دوکتۆر ئـەورەحمانی حـاجی مار ف ئـەوەی هێنایەوە یادم کە لە پاشکۆی چاپی یەکـەمی «خلاصـەیەکی تاریخی کوردو کوردستان»دا مامۆستا ئەمین زەکی بۆ خـۆی نووسیویـە کۆتـایی حوزەیـرانی ساڵی 1924 گـەڕاوەتەوە . مامۆستا محەمەد عەلی عەونیش لەپاشبەندی چاپی عەرەبیی ئەو کتێبەدا هەمان ساڵی تۆمار کردووە[4] .

سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوی تریش باسی هەمان ساڵی کردووە . ئەو سەرچاوەیە ڕابەرێکی گشتییە دەربارەی عیراق کە ساڵی 1936 چاپ کراوە[5] ، لە لاپەڕە 574 — 575یدا بەم جۆرە پوختەی ژیانی مامۆستا ئەمین زەکیی بۆ تۆمار کردووین :

«سـاڵی 1880 لە شـاری سلێمـانی لە دایـك بـووە . لە ئەستەمووڵ کۆلیجی سەربازیو ئەرکانی تەواو کردووە . ساڵی 1902 بووە ئەفسەر . هەر ئەو ساڵەش لە لەشکری شەشەمی عوسمانی کەبەغدا بنکەی بوو ، دامەزرا . لە ساڵی 1903وە بووە ئەندازیارو لە ساڵی 1908وە گەڕایەوە سوپاو بـووە ئەفسـەری تۆپۆگرافی .

ساڵی 1910 بووە یەکێك لە ئەندامانی لیژنەی دیارکردنی سنووری نێوان تورکیاو بەلگاریاو پاشان بووە ئەندامی لیژنەی دیارکردنی سنووری نێوان تورکیاو ڕووسیا . لەشەڕی بەلکاندا بـەشدارێی کـردو ساڵی 1913 بـۆ کاری سـەربازی نێـررایە فەرەنسە . کە شەڕی یەکەم دەستی پێکرد گوێزرایەوە بنکەی لەشکری یەکەم . ساڵی 1915 بووە سەرهەنگ . هەر ئەو ساڵەش گوێزرایەوە عیراقو لە زۆربەی شەڕەکانی ئەو بەرەی جەنگەدا بـەشدارێی کـرد . ساڵی 1917 کـرایە یـاریدەری یـەکـەمی سەرکردایەتی لەشکری حـەوتەم لە فـەلەستین ، ئـەوساکـە مستەفا کەمال پاشا[7] فەرماندەی لەشکری حەوتەم بوو . پاش

ماوەیەك گوێزرایەوە لەشكری سێیەم كە لە بەرەی قەفقـاس بوو . دوای ئاگربەس[8] گـوێزرایـەوە «بەشی مێـژووی شەڕ»و زنجیرەیەك بەرهەمی بـایەخـداری دەربارەی شـەڕی عیراق دانا . ساڵی 1924 گەڕایەوە عیراق‌و كرایە پشكنەری فێـرگەی سەربازی‌و ئینجا بووە بـەڕێوەبـەری هەمـان فێرگـەو دوای ئەویش هی فێرگەی مەشق . سـاڵی 1925 لەپەرلەمـاندا بـووە نوێنەری سلێمانی . هەر لەو ساڵەوە تاوەكو ساڵی 1927 بـووە وەزیری هاتوچۆو كاروبار . ساڵی 1927 بووە وەزیری مەعاریف . ساڵی 1929 بووە وەزیری بەرگـری . ساڵی 1931 بـووە وەزیری ئـابووری‌و هـاتوچـۆ ، ساڵی 1933 بـووە كـاركێـڕی گشتی‌ی ئابووری‌و هاتوچۆ ، لەمارتی ساڵی 1935وە بۆ شەشەم جار بووە وەزیری ئابووری‌و هاتوچۆ[9] .

ئینگلیـزەكان لە ڕاپـۆرتێكی نهێنی‌ی خـۆیـانـدا بـاسی مـامۆستـا ئەمـین زەكی بەگیـان بەم جـۆرەی لای خوارەوە كردووە :

«كوردەو خەڵكی سلێمانی‌یە . ساڵی 1880 لەدایك بووە . خوێندەوارێكی چـاكە . بـە فەرەنسی‌و ئـەڵەمانی‌و ئینگلیـزی دەدوێ . لە لەشكری عوسمـانیدا ئـەفسەری ڕوكن بـووە . تەشرینی دووەمی ساڵی 1926 كرایە وەزیری كاروبارو هاتوچۆ . دوا بەدوای ئەوە بووە وەزیری مەعاریف‌و بەرگری . دەوری لەو وەزارەتـانەی تیـایانـدا بەشـدار دەبوو ، كـەم بـوو. لە سیـاسەتیـدا دەیەوێ كـورد بە پشتگیـری‌ی كردنی نـەتەوە پەرستانی كورد ڕازی بكات ، هەوڵیش ئەدا ئەو هەلوەستەی كار نەكاتە سەر پێوەندی‌ی لەگەڵ عەرەبدا . لە هـەڵبژاردنی ساڵی 1930دا دەرنەچوو . تەممـوزی ساڵی 1931 دیسـان بۆوە وەزیری ئابووری‌و هاتوچۆ . تەشرینی یەكەمی ساڵی 1932 وازی هێنا . مارتی 1933 كرایە كارگێڕی گشتی‌ی ئابووری‌و هاتوچۆ ، بەڵام دوای لابردنی ئەو دەزگایە لە مانگی ئەیلولی 1934وە بێ كار مایەوە . مارتی ساڵی 1935 لە وەزارەتەكەی یـاسین هـاشمیدا بووە وەزیری ئابووری‌و هاتوچۆ»[10] .

### 3 ـ «غونچەی بەهارستان»

خۆشم نازانم چۆن ئەوەم بەسەردا تێپەڕیوە كـە كێوی بێستونی بەناوبانگ كەوتۆتە نزیك كرماشانەوە نەك هەمەدان . ڕاستێكەی نەدەبوو بكەومە ئەو هەڵەیەوە ، هیچ نەبێ لەبـەر ئەوەی بۆ خۆم لە ڕێگەی بێستونەوە چومەتە كرمانشا ، بەڵام وا دیارە پیری‌و هیلاكی زۆریان بۆ هێناوم !

برایان حیلمی عەلی شەریف‌و فـەرەیدون عـەلی ئەمـین سەرنجیان بۆ ئەو هەڵەیەی لاپەرە 45ی «مێژوو» ڕاكێشـام . دووەمیـان لەگەڵ چـەند سـەرنجێكی بەجێی زمـانـەوانیـدا «غونچەی بەهارستان»ی مامۆستا حسەین حوزنی موكریانی‌و «كوردستان شوێنی گەرانەوەی دە هەزار یۆنانی لە 401ی پێش میلاددا»ی خوالێخۆشبوو حەسەن فەهمی جاف كردە دیاری‌ی دەستی بۆ «مێژوو» .

لە چـەنـد شـوێنێكی «مێـژوودا» نـاوی «غـونچـەی بەهارستان» هاتووە[11] . بەلام وەك لە «مێژوو» خۆشیدا دیارە من بۆ خۆم «غونچەی بەهارستان»م نەدیبو تاوەكو بتوانم بـە درێژی باسی ئەو كتێبە بكەم كە یەكەم بەرهەمی كوردی‌یە خۆی لە قەرەی زانستی مێژوو داوە . ناوی تەواوی ئەو كتێبە كە 94 لاپەرەیەو ساڵی 1925 لە حەلەب لە چاپخانەی «العصر الجدید» چاپ كراوە بەم جۆرەیە :

**«غونچەی بەهارستان . جێی لێ‌دەركەوتنی‌و ژیانی‌و تەواوی تەمەدونی گەلانی كوردان»[12] .**

لە ناویشەوە دوو جار ناوی كتێبەكەی گـۆڕیوە ، یـەكەمیـان كردوویەتە «تاریخی كوردستان»و دووەم جاریشان كردوویەتە «تاریخی كوردان» .

لە هەموو دێڕێكی «غونچەی بەهارستان»دا بەئاسـانی هەست بە دەریای بێ بنی خۆشەویستی گەل‌ونیشتمـان لای موكریانی دەكەیت . زۆر جار شەپـۆلی ڕەنگ سـەوزو شینی هەستی ڕۆمانسی سەرانسەری ئـەو دەریایـەی داپۆشیـوە . كوردستان لە «غونچەی بەهارستان»دا بۆتە «لانكی تەمەدون‌و پێشكەوتن‌و بلندی بۆ قەبائلی دیكە»و[13] كوردیش بۆتە «بـاوكی ئـەقوامی ئـاری»و یـەكـەم كـەسێـك كـە «قـانـون‌و ئـاین‌و قاعیدەیەكیان هێناوەتە گۆڕێ لە نێو تەواوی بەشەردا» . هەر لەوێدا كورد «ئـەوەڵ كەسێكن (كـاتێك) تـەواوی بەشـەر بە تەوەحوش لە كوێستانان‌و سەحـرایانـدا دەژیان‌و بـە تالان‌و كوشتاری یەك‌و لە حاڵی بەدویاندا ڕایان‌دەبوارد ، ئەوان بـە جوت‌و چاندن‌و دانیشتن لە دێهاتدا بەسەریان دەبردو ڕوو لە بلنـدی‌و پێشكەوتن عـادەتیان گـرت‌و قەبـائـلی دیكـە لێیـان وەردەگـرتن . لەزەمانی پێشـوو بـە چـل قـەڕن پیـاوی زۆر گـەورەیـان لێ پـەیـدا بـوو وە بـە دادو عـەدل‌و ڕەشیـدی‌و

جیهانگیری ی ئیشتیهاری کردووه»[14] .

بەو جۆرە خوالێخۆشبوو دەیویست لاوانی گەل بزوێنێ‌و ، هەستی شانازی لە قولایی دەروونیاندا هەڵکەنێ . لەوەدا حسەین حوزنی موکریانی تاقانە نەبوو . گۆتەی ئەڵەمانەکان کۆتای سەدەی هەژدەو سەرەتای سەدەی نۆزدە گەلێك لەوەی موکریانی زیاتری کرد بۆ ئەوەی هەستی هاوولاتیانی بهێنێتە جۆش‌و خرۆش .

زۆر بەداخەوە «کوردستان ـ شوێنی گەڕانەوەی دەهەزار یۆنانی لە 401ی پێش میلاددا» کە نەوەی دڵسۆزی جاف خوالێخۆشبوو حەسەن فەهمی لە فارسی‌یەوە کردوویەتە کوردی‌و ساڵی 1961 بە لێدووانەوە بلاوی کردۆتەوە»[15] یەکێکە لەو بەرهەمانەی بەسەرمدا تێپەڕیوەو لە بیبلیۆگرافیای «مێژوو»دا ناویم نەهێناوە . هەرچەندە بە ڕەوایی شوێنی حەسەن فەهمی جاف لە «مێژوو»دا دیارە[16] ، بەلام هەڵبەت ئەو بەرهەمەشی پایەو مەقامی لەبەر چاوی ڕووناکبیران بەرزتر دەکاتەوە .

#### 4 ـ مینۆرسکی لە سلێمانی

بۆ چەند باسێکی ڕۆژنامەی «زبان» کە ناوی لە «مێژوو»دا هاتووە دیدەنی ی تایبەتیم لەگەڵ تیپکارانی محەمەد ئەمین ڕەباتی‌و ئەحمەد شوکری (دوکتۆر شۆ)دا کرد لە ڕێگەی ئەوانەوە بەوەم زانی کە کارگێڕانی «ژیان»و «زبان» بەتایبەتی ژمارەکانی ئەو دوو ڕۆژنامەیەیان بۆ کوردناسی بەناوبانگ مینۆرسکی دەنارد لەندەن هەر ئەوانیش باسی هاتنی مینۆرسکی‌یان بۆ بەغداو سلێمانی‌و ، سەردانی لە چاپخانەی مەریوانی لە یەکەمیان‌و لە چاپخانەی شارەوانی لە دووەمیان ، کرد . منیش ئەو باسەم لە پەراوێزێکی «مێژوو»دا بەم جۆرەی لای خوارەوە گێڕاوەتەوە :

«وا دیارە مینۆرسکی دەوروبەری ساڵی 1930 بە بۆنەی یادی نۆسەد ساڵەی کۆچی دوایی شاعیری گەورە ئەبولقاسم فیردەوسی‌یەوە لە ڕێگەی عیراقەوە چۆتە ئێران ، یا لەوێوە بە عیراقدا گەڕاوەتەوە ، لەبەغدا لەگەڵ مامۆستا تۆفیق وەهبی سەری لە چاپخانەی مەریوانی داوە ، لە سلێمانیش لەگەڵ پیرەمێرد چۆتە چاپخانەی شارەوانی‌و بارەگای ڕۆژنامەی «ژیان»[17] .

بەڕێز سەعید ناکام لەو بارەیەوە بۆی نووسیوم دەڵێ :

«مینۆرسکی لە دەوروبەری ساڵی 1930 نا بەڵکو لە ساڵی 1934دا بۆ بەشداری لە جەژنی هەزارە ـ نەك نۆسەد ساڵە ـ ی فیردەوسی لە ئێراندا هاتە سلێمانی‌و سەری لە چاپخانەی «ژیان» داو داوای لەپیرەمێرد کرد نموونەی شیعری چەند شاعیرێکی کوردی نوێی بۆ کۆبکاتەوە ، شیعری گۆران‌و بێکەس‌و میرزا مارف‌و بێخودی دایەو پارچە شیعرێکی منیش کە لە «ژیان»دا بلاوکرابۆوەو یەك دێڕیم بیر ماوە دەڵێ :

**لەپاش هەزار ساڵ فیردەوسی ی توسی**
**دەزانن کێ‌یەو جەژنی بۆ دەگرن**

لەبیرمە کە ناردیان وێنەگرێك هات لەبەر هەیوانی بەلەدیە کۆنەکە بەرامبەر قەیسەری نەقیب وێنەیەکی سێ قۆڵی ی پیرەمێردو مینۆرسکی‌و من بە جلی کاری پیت چنی‌یەوە گیراو مینۆرسکی لەگەڵ خۆی بردی»[18] .

دیارە قسەکەی ناکام ڕاستەو بۆچوونەکەی من هەمووی تەواو نی‌یە . بەلام من بەو «وا دیارە»یەی خستومەتە سەرەتای باسەکەوە دوودڵی ی خۆمم نیشان داوە ، چونکە تاوەکو ئیستە ساڵی لەدایك بوونی فیردەوسی /بەتەواوەتی/ ساغ نەبۆتەوە ، هەن ئەو ساڵە بە 934ی عیسایی‌و هەشن بە 941ی دادەنێن . تا ئیستە کۆچی دواییشی بەتەواوەتی نەزانراوە ، شارەزایان زۆر جار دەڵێن فیردەوسی دەوروبەری ساڵی 1020 وەفاتی کردووە . جا لەبەر ئەوەی ئەوانەی لەو بارەوە دیدەنیم لەگەڵ کردن هاتنەکەی مینۆرسکی‌یان خستە دەوروبەری ساڵی 1930وە منیش بە مەزەندە پێم وابوو دەبێ سمینارەکەی تاران بەبۆنەی 900 ساڵەی کۆچی دوایی فیردەوسی‌یەوە بووبێت . دوای نامەکەی ناکام زیاتر کەوتمە سۆراخی ئەو باسەو دەرکەوت ساڵی 1934 بە بۆنەی یادی هەزار ساڵەی لەدایك بوونی فیردەوسی‌یەوە لە ئێران‌و لە تاجیکستانی شورەوی ئاهەنگی تایبەتی‌یان ساز کردووە . کەوابێ مینۆرسکی ساڵی 1934 هاتۆتە سلێمانی .

شایانی باسە سەلامی شاعیریش لەدیوانەکەیدا باسی ئەو سەردانەی مینۆرسکی ی کردووە . لە پەراوێزی تەرجیع بەندی «بۆ کۆمەڵەی ئەقوام»ە کەیدا نووسیویەتی دەڵێ :

«هەروەها میستەر مینۆرسکی ی ڕۆژهەلاتی‌یەوانی بەناوبانگی ئینگلیزی ساڵی 1934 کە بۆ یادی هەزار ساڵەی

فیردەوسی هاتبو بچێ بۆ ئێران و هاتە سلێمانی ، وێنەیەکی ئەم هەلبەستەی لەگەل وێنەی شاعیردا وەرگرت و لەگەل خۆی بردی ...»[19] .

مامۆستا سەعید ناکام دەربارەی ڕۆژنامەی «زبان»یش بۆی نووسیوم دەلێ :

«ڕۆژنامەی (زبان) بایەخێکی لە شیاوی خۆی زیاتری ـ ڕاوەتێ ، هەر لەبەر ئەوەی خۆتان واتەنی «بە ڕۆژنامەیەکی مێژوویی ناوی دەرکردووە» . مەجید یاقوبی لە ڕقی پیرەمێرد و «ژین» ەکەی بیری لە «زبان» کردەوەو هێنایە کایەوە ، لە کاتێکدا پیرەمێرد کۆنە مەکینەیەکی چاپی لە قەلەندەرخانەدا دامەزراندبو ، «ژیان»ی کردبوو بە «ژین» . بیرم نەماوە ئەو «زبان»ە چەند ژیاو چیی تێدا دەنووسرا ، بەلام گومانم لەوەدا نی یە کە «باری قورسی ڕۆژنامەنووسی ی کوردی و دلسۆزی ی ڕووناکبیرانی سلێمانی ئەو ناوەیان داسەپاند» ، یا «زبان لەناو ڕووناکبیراندا بە ڕۆژنامەیەکی مێژوویی ناوی دەرکرد» ، ڕستەیەکن بۆ ئەو ڕۆژنامەیە زۆری زیادەو تەرخان کردنی دوو لاپەڕەو نیو لەو کتێبە بەنرخەتان بۆی ، بۆ ئێوە دەبێتە دەستبلاوی کە دۆستانتان حەزناکەن لە نووسراوە زانستی و بایبدارەکانتانا بەرچاو بکەون» .

لەم باسەیاندا ناتوانم ببمە هاوبیری ناکام ، هیچ نەبێ چونکە بێگومانم لەوەی ڕۆژنامە نووسی ی کوردی بەشێکی بایەخداری مێژووی نوێ و هاوچەرخی گەلەکەمانەو هەر لەبەر ئەوەش گشت لاپەڕەکانی پێویستیان بە لێکدانەوەی زۆرو ڕوونکردنەوەی هەمەجۆرە . من دەلێم خۆزگە گەلێک زانیاری ی ترم دەربارەی «زبان» دەستکەوتایە تاوەکو ئەوانیشم تۆمار بکردایە . دووپاتیشی دەکەمەوە کە « باری قورسی ڕۆژنامەنووسی ی کوردی و دلسۆزی ی ڕووناکبیرانی سلێمانی » ی وەک صالح قەفتان ناوی « زبان » یان داسەپاند . دەستەیەک ڕووناکبیری دلسۆز دەیانویست هەرچۆنێک بێت ڕۆژنامەیەکی کوردی دەرچێ و توانای ئەوەیشیان نەبووە یەکێک بنێرنە بەغدا زەنکۆغرافێکی نوێیان بۆ دابڕێژێ ، بۆیەکا هێناویانە دوو خالی سەر پیتی (ژ) و خالێکی ژێر پیتی (ی) ی «ژیان» ەکەی پیرەمێردیان شکاندووەو ناوی «زبان» یان لێ داتاشیوەو بەو جۆرە ڕۆژنامەیەکی کوردی ی نوێیان خستۆتە بەردەمی خوێندەواران . بڕوا ناکەم لەهیچ قوژبنێکی جیهاندا نموونەیەکی تری وا بەرچاو بکەوێ . هەلبەت ئەونمونە دەگمەنە بەلگەی بێ پێچ و پەنای باری قورسی ڕۆژنامەنووسی ی کوردی و دلسۆزی ی ڕووناکبیرانی کوردە کە ناکام بۆ خۆی زۆری لە تالی و شیرینی هەردووکیان چێشتووە !

**5 – خەلاتێکی تری «مێژوو»**

وا دیارە ئەو وتارەی دەربارەی خەلاتی «مێژوو» لە ژمارە چواردەی « کاروان » دا بلاوم کردۆتەوە هەستی ناسکی لاوی خوێنگەرمی کۆیە کاک دلێر عوسمان عەونی حەبیبی جولاندووەو ئەویش بڕیاری داوە دیاری یەک پێشکەشی «مێژوو» بکات کە ، وەک خۆی دەلێ ، «تاوەکو ئێستە کەس نەیدیوە» . خاوەنی «مێژوو» بەپەرۆشەوە چاوەڕوانی ئەو دیاری یەی کاکە دلێرەکە ، دلنیای دەکەم ، شوێنی شیاوی خۆی دەگرێ .

هەر لەو وتارەشدا کە لە «کاروان» دا بلاوم کردبۆوە باسی ئیجازەکەی شێخی سەراجەددین بۆ حاجی ڕەسولی نەقشبەندی و «لەهستان» ەکەی خوالێخۆشبوو مەحمود جەودەتم کردبوو ، بەلام بەهۆی هەلەیەکی پچوکەوە دەقی

(پولونیا)

(پولەندا) ویا لهستانە

لە یادی سەرکوزەشتی میلەتیکا شین لە زەفەر
چاکترە . چونکە کارەساتیکی رابوردو فرمانیکی
آیندەمان ئەخاتە سەرشان وفەرمانمان پی ئەکا
کە بەگەلە تی کوشین رەنان

مەحمود جەودەت

سلیمانی : حوزەیران : ١٩٣٦

نرخی ١٠٠ فلس

بغداد لە چاپخانەی معارف چاپکراوە
سالی ١٩٤٠

وێنەی ئیجازەکەو بەرگی کتێبەکەی مەحمود جەودەت فریا نەکەوتن لەتەك وتارەکە خۆیدا بلاوبکرێنەوە ، وا لەگەڵ ئەم وتارەدا کە تەواوکەری ئەویانە هەردووکیان بلاودەکەینەوە ، هیوادارین جێگەی خۆیان بگرن .

پەراوێزەکان :

(1) مەبەست ئەو کتێبەمە کە ساڵی پار بە ناوی «مێژوو . کورتە باسێکی زانستی مێژووو کوردو مێژوو » وە لە 318 لاپەڕەدا بلاومکردەوە .

(2) بڕوانە : «کاروان» ژمارە 14 ، تەشرینی دووەمی 1983 ، ل 10 — 15 .

(3) بڕوانە : حیلمی عەلی شەریف ، هەڵسەنگاندنێکی «مێژوو» . نرخاندنی کتێبی «مێژوو» ی دوکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد ، ـ «هاوکاری» ، 19 ی کانوونی دووەمی 1984 ، ل 4 و 7 .

(4) بڕوانە : «مێژوو» ، ل 16 .

(5) بڕوانە : «خلاصة تاريخ الكرد وكردستان من اقدم العصور حتى الان» ، وضعه باللغة الكردية محمد امين زكي ونقله الى العربية وعلق عليه محمد علي عوني ، القاهرة ، 1939 ، ص 471 .

(6) (The Iraqi Directory . A General and Commercial Directory of Iraq ) ,Bagh-dad , 1936

(7) مەبەست ئەتاتورکە .

(8) مەبەست ئاگربەس (هدنە) ی مۆدرۆسە کە کۆتایی بەشەڕی نێو هاوپەیمانەکان‌و دەوڵەتی عوسمانی هێنا .

(9) (The Iraqi Directory ... 1936) , pp . 574 — 575

(10) «العراق في الوثائق البريطانية سنة 1936» ، إختيار وترجمة وتحرير نجدة فتحي صفوت ، بغداد ، 1983 ، ص 69 — 70 .

(11) بڕوانە : «مێژوو» ، ل 169 ، 275 .

(12) ناوی کتێبەکە بەم جۆرە چاپ کراوە : « غنچه ء بهارستان . جبی لیە دەرکوتنی‌و ژیانی‌و تواوی تمدنی کلانی کردان » . تـاليفى السيد حسين حزنى الحسني ، مطبعة العصر الجديد ، حلب ، سنة 1925 .

(13) کەمێك دەستکاریی شێوازی نووسینەکەی کراوە .

(14) « غونچەی بەهارستان » ، ل 4 .

(15) دەقی ناوی کتێبەکە بەکوردی بەم جۆرەیە : «کوردوستان ـ شوێنی گەڕانەوەی دە هەزار یۆنانی لە « 401 » ی پێش میلاددا . گەڕانەوەی دەهەزار یۆنانی لەبابلەوە بۆ ئاتینا‌و تێپەڕینیان بەناو کوردوستانا لە « 401 » ی پێش میلاد وەباسی ڕەوشت‌و عەنعەناتی قەومەکانی ئەو سەردەمە » ، حەسەن فەهمی جاف لەفارسییەوە بۆ کوردی وەری گێڕاوە ، بەغدا ، 1961 — 173 ل .

(16) بڕوانە : «مێژوو» ، ل 143 ' 273 — 274 ' 302 .

(17) بڕوانە : «مێژوو» ل 150 — 151 . پەراوێزی ژمارە 120 .

(18) نامەکە ڕۆژی 10 ی ئەیلولی 1983نووسراوە .

(19) بڕوانە : «دیوانی سەلام » ، بەغدا ، 1958 ل 1 .

مسعود محمد

# لە ئاوێنەی ئەم گوتارەدا تیشکی چەند چرایەك

لەگۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق «دەستەی کوردی» بەرگی دەهەم ، 1983 چەند بابەتێك هەن لە هەندێ جێگەیاندا تێبینی هەڵدەگرن .

لەپێشەوە گوتاری د . کامل بصیر لەژێر سەرەناوی (ڕەخنە سازێك و بیردۆزی هۆنراوە)دا هاتووە . ئەو ڕەخنەسازە چل ساڵێك لەمەوپێش لە (یادگاری لاوان)دا بێ ئەوەی خۆی بناسێنێ شتێکی بڵاو کردۆتەوە بە ناونیشانی (شاعیرەکانمان) هەرچەند دەقی گوتارەکەمان لانییە بەڵام چی لێی نەقل‌کراوە لەگۆڤاری کۆڕدا ڕێم دەدا بەسەر بابەتەکەدا بڕۆم . ئەگەر خوێنەریش وەکوو من نموونەی بیروڕای ڕەخنە سازەکە لەناو گۆڤارەکەدا بخوێنێتەوە ، ڕەنگە ئەویش وەکوو من باوەڕ بهێنێ کەڕەخنە سازەکە گەنجێکی دڵ گەرمی بەپەرۆش بووە بۆ سوودی کورد ، سەرکێڵی بەرقەننەیەکی لەسەقافەتی ئەدەبیی ئەورووپا خوێندووتەوە بایی ئەوەی بیکابە دوژمنی شیعری کوردیی ئەوساو لەمەوبەرتریش ، واتە هاتووە لە تاکە کولانەی شیعرەوە بەراوردی شاعیری کوردی لەگەڵ هی ئەورووپادا کردووەو بڕیاری بێ بایەخیی و بێ نرخیی شیعری شاعیری کوردی داوە ، ئەوەندەش شلك بووە نەیتوانیوە سەرنجی ورد لەواتاو ڕاگەیاندنەکانی شیعری کوردی بگرێت و بە ڕوونی تێیان بگات ، بەپەلەش شیعری صەدەی نۆزدەم و بیستەمی ویکڕا پێکاوون بێ ئەوەی هەست بەخۆی بکا .

هەر لەبیرمە ، لە سییەکاندا ، ڕۆشنبیری ئەوسای کورد وای دەزانی بەبڵاو بوونەوەی خوێندن و نووسین تەنگ و چەڵەمەی ژیانی کوردەواری دەڕەوێتەوەو میللەت ئاسوودە دەبێ .. دواتریش وای دەزانی دەم دان لەبیری سەر بەچینایەتی دەرگەی کامەرانی بەڕووی میللەتدا دەکاتەوە . بە دڵی ئەوگەنجانەدا نەدەهات ، بۆ ماوەی چل ساڵ و پەنجا ساڵی دیکەش کورد لە شوێنی خۆیدا پێ‌کوتە دەکات . کەڕاپەڕینی 948 (وثبە) بەرپا بوو وازانـدرا کلیل خرایە قفڵی خەزینەی قاڕوونەوە .

ئەو ڕەخنەسازە ، کە بە خاترانە پێی دەڵێین ڕەخنەساز دەنا گەنجێکی عاتیفی درشت‌بینی سافیلکەی سەرابی بەپەرۆش ودلسۆزە ، چاوی خۆی بڕیە شیعری کوردیی و بەراوردی کرد لەگەڵ شیعری شێللی و نازانم کێ و بڕیاری خۆی دەرچواند بەهیچ و پووچیی شیعری کوردی . ئەگەر نەختێك ڕەگی سەقافەتەکەی بەناخی واقیعدا چووبایە ، چاوێکی دەگێڕا بەو دەوروبەرەی شیعری کوردو شیعری ئەورووپای لێ هەڵقوڵیوە ، ئنجا لیستەی دەگرتەوە بۆ ژمارەی فابریقەکانی هەڵەبجەو بەرمەنگهام .. درێژایی ڕێگە ئاسنەکانی کوردستان و ئینگلتەرەی بەیەکدی دەگرتن .. سەر ژماری کتێبخانەو چاپخانەکانی ڕانیەو ئۆکسفۆردی دەکرد .. بیری لە ئۆتێلەکانی لەندەن و دهۆك دەکردەوە .. زانکۆو کۆلیجەکانی بەیەکدی دەگرتن .. پاپۆڕو تەیارەکای کوردو ئینگلیزی دەنرخاندن .. بانکەکانی لەهەردوو وڵاتدا دەژماردن .. بنگەی پیشەسازیی و لەش سازیی و زەویی ساز‌ی‌ و هونەر سازیی و .. سازی ... (لانکە شایەر)و (بیتوێن شایەری) هەڵدەکێشان و ئنجا کە بۆی ڕوون بووە لەهەموو سازوبازو نازێکدا کورد هاوشانی ئینگلیزە دوو پەنجەی شادەی هەردوو دەستەکانی لەبیبیلەی چاوی گۆران و نالی و حاجی قادر دەچەقاندو کوێرایی‌ی دادەهێنان ، ئێمەش چەپلە ڕێزانمان بۆدەگێڕاو ئافەرینمان لێ دەکێشا .. مەلاحەسەن چەند حەقی بوو گوتی :

«ئەی میللەتی بێ چارە عەجەب جاهیل و خامی»

بێ گومان کاکی ڕەخنە ساز ئەگەر باری مادی کوردو ئینگلیزی بەیەکدی گرتبایەو هەر لەسەر سافیلکەیی خۆی ڕۆیشتبایە بێ ئەوەی بچێتەوە بۆ ئەو هۆیە مادییە مێژوویی‌یە کۆمەڵایەتییە ناوچەیی‌یەی کوردی لە ئینگلیزو لە ئەورووپا

دابڕی ، دەهات بڕیاری وێران کردنی شار و دەشتی کوردستانی دەدا چونکە نە تەیارەخانەیان هەبوو نەهۆڵی دانس و نەلۆقنتەی شیك و نە سینەمای دڵگیرو نەشوێنی مەلە لێ کردنی هاوینەو نە هونەرو نەچاپەمەنی و نەهیچ ... دەهۆڵ و زورنا حەیای کوردی دەبرد لەتەك تیپی سیمفۆنی .

هەتا ئێرە لە ڕاستە حیسابی سرینەوەی شیعری کوردی ڕواڵەتێکی سەرکێڵ و بێسەقافەتی وکەم ئینسافی ئەم ڕەخنە سازە دلسۆزەمان باس کردووە . کە بێین بەوردی و قووڵی لە هەڵوەستی بکۆڵینەوە حیسابەکەی گەلێك بەرەژێرتر دەڕوا :

شیعری کوردی و ڕۆشنبیریە هۆشەکیەکەی کوردی گەلێك بەرەژوورتر بووە لە باری مادی کورد . ئەگەر چاوەنۆڕ باینایە تا شیعری کوردی وەکوو بەیت و بالۆرە لە بەرەوپێش چوونی باری مادی و ڕامیاری و کۆمەلایەتی و سنعەتی ی کورد هەڵقولابایە دەبوو شاعیر لەکورد پەیدا نەبێ بەرانبەر شاعیری وڵاتی پێشکەوتوو ڕابگیرێ . ئەم دیاردەیەی بەرەژوورتر بوونی لایەنی ئەدەبی و (هۆشەکی ـ عقل) کورد لەلایەنە ما دییەکەی کورد مەتەڵێك نییە بەکەس هەڵ نەیێ : کورد کەناتوانێ لەبەر هەزارو یەك فابریقەی تەییارەو ڕادیۆو دووربینی هەبێ دەتوانێ نووسراوی لەندەن و پارس و قاهیرە بخوێنێتەوە ، لەکۆنیشەوە توانیوەتی لەدێیە وێرانەکانی کوردستاندا فەلسەفەی ئەفلاتوون و مەنتیقی ئەرەستۆو فەلەکیاتی بەتلەمیۆس بەدەرز بڵێتەوە .. بارتەقای مەلای ئەستەنبوول و مامۆستای لاهۆر لەسەر پرسیارەکانی زانستە ئیسلامیەکان بدوێت و بنووسێت . خوێندنەوەی شیعری متنبی و حافظو جلال الدین ڕوومی وەك دروست کردنی کارگەی ئۆتۆمۆبیل نییە پەکی لەسەر فابریقەو پسپۆڕو هەندەسەی میکانیکی و ئەودەردو بەلایانە کەوتبێ . کەبێین مەلاو شاعیری کورد بەمەلاو شاعیری تورك بگرین دەبینین ئەوان لەیەکتر نزیکتر بوون تا خەڕەکی شەقڵاوە وتەرسانەی ئوسکودار ... ئیبنو ئادەم لەمەلای ئەزهەر دانەماوە بەلام ڕوست و (ئولزە ـ کەخۆی بە دەستی خۆی ناوەکەی نووسیوە) چوار هەزار ساڵ لەقاهیرە دوواکەوتوو بوون .. ئنجا کەیەکێك لەسەری زمانەوە دەڵێ شاعیریکورد چاولێکەری شاعیری بێگانەی کردووە دەبێ شەرم لە خۆی بکاتەوە چونکە لەو سەرشکێن کردنی شاعیری کورددا بەلای کەمەوە دووجاران بە

کارکارەی هەڵەدا چووە : جارێکیان لەوەدا کە سەرمەشقی شاعیری کورد متنبی و سەعدی بێ چاکترە نەك گووفەکی قڕناقەوو مەلاریای شارەزوور ، هەروەك لەزانستدا فەلەکیاتی یۆنان ڕابەری بێ نەك دێوی پشت چیای قاف و عەزیای واقلواق . جاری دووەمیان لەوەدا کەبەبیری کوێرەوە بووی دا نایەت بۆچی تەشی ڕێسی کورد پێی ناکرێ چاو لێکەری لەکارگەی (فەتاح پاشا) بکات وەك کە زیوەر بەسەر ڕێی نظامی دا ڕۆییشت ، خۆ ئەگەر تەشی ڕێس ئەو چاولێکەریەی کردبایە کەس عەیبی لێ نەدەگرت ، ئافەرینیشی لێ دەکرا ؟ هەڵبەت دەزانم ئەم چاولێکەرییە نەك بەخەڕەك ڕێس ناکرێ ، بەڵکوو لە بەرەو دوای صەدەی بیستەمدا بە پارەدارە کانیشمان ناکرێ لە هەڵەبجە کارگەی قوماش دابنێن .. قسەکە بۆ ڕوون کردنەوەی دابڕانی ئەوجۆرە بیرکردنەوەی ڕەخنەسازو ئەمسالی ئەوە لە هەڵکەوتی زەق و زۆپ ..

چی گوتم بۆیە بوو لەصفرەوە بەرەو موناقەشە بڕۆم ، دەنا شاعیری کورد ئەو بێ بایەخەو لاسایی کەرەوەیە نییە بۆی بهارێمەوە وەیا عەیبدار بووبێ .. فەرموو شێخ ڕەزا بگرە بەهەر شاعیرێکی ڕۆژهەلاتی ئیسلام بێ و پێم بڵێ لە کامیان دادەمێنێ ؟

بائەم قسە گشتی و هەمەکیانەم لێرەبن و سەرێك لەئارداوێژی ڕەخنەسازەکە خوار بکەینەوەو بزانین چ ڕێ نموونیە کمان دەکا بۆ ناسینەوەی شیعری ساخ لەهی چرووك . دەڵێ : [بەو شێوەیەی لەگۆڤارەکەدا هاتووە قسەکانم ڕاگوێست] .

«شعر : تەرجمانی دڵە ، چی بەدڵابێ ، ئێش و ئازار ، دەردو خەفەت ... شین و شادی ... خۆش ویستن و قین ... خراپی و چاکیمان بەواتەی ڕێك و پیك بەشێوەیەکی دڵگیرا بۆ دەردەخات کە هەموو کەسی لە دەمی خوێندنەوەیدا شێوەیەکی دڵی خۆی تیا ئەبینی» [لاپەڕە 13ی گۆڤار ـ شوێنی خاڵەکان بەمەبەستی کورت کردنەوە هەڵبوێرران] .

بەم پێودانە کام شاعیری کورد لەشاعیرایەتی دەشۆرێ ؟ ئەمە کوردی و سالم و نالی وحەریق وحاجی ، گوێیان لێ بگرە ! چییان گوتووە لەوە بەولاوە کە بەبیریاندا هاتووە ؟ هیچ کامێکیان بەپارە شیعریان نەگوتووەتەرجەمەی شیعری غەیریشیان نەکردووە . تۆبڵێی شتێکیان گوتبێ غەیری (ئێش و

ئازار .. دەردو خەفەت .. شینو شادی .. خۆش ویستنو ڕق لێبوونەوە ؟ هێندە هەیە دەشێ ئەوان دەردو خەفەتیان ئەوە نەبووبێ کە ڕەخنەسازەکە بە هەندی هەڵگرتبێ ، وەیا ئایینێکیان خۆش ویستبێ کە مولحیدێکی سەردەم قینی لێیەتی . لەلایەن (چاکیو خراپی) یەوە ، عەیارەی خەڵق لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێكو لەڕۆژگارێکەوە بۆڕۆژگارێك دەگۆڕێ ، بگرە ئیستاکە لەتاقمێکەوە بۆ تاقمێك نرخی چاكو خراپ جودایە : ئەو خەلقانەی لەسەرتانسەری دنیای خۆماندا یەخەگیری یەکدی بوون لەبەر جوداوازیی کێشانەی (چاكو خراپ) وەها دلێرانە دەست لە جەرگی یەکدی گیردەکەن شاعیرو نووسەرو هونەر کارو بیریار هەر هێندەی لێ داوا دەکرێ لەگەڵ خۆیدا ڕاست گۆبێ ، دووڕوو نەبێ ، فێڵ نەکا ، بەکردەوە دروشمەکانی خۆی بەتاڵ نەکاتەوە . کابرای نەخوێندوو گوتی (خاس بکە خراو مەکە) ڕەخنە سازەکەش هەر وەها دەڵێ بەلام پێمان ناڵێن چاکە چییەو خراپە چییە ، خۆئەگەر ناویشی لێبنێن کەسی ئەوتۆ گوێیان ناداتێ چونکە هەر کۆمەڵەو تاقمەو بەرژەوەندەو ئایدیۆلۆجیایە عەیارەی تایبەتی خۆی هەیە لەو بازارەدا .

هەر لەهەمان لاپەڕەدا دوازدە دێڕی دیکە لەو جۆرە قسانە دەنووسێ وەکوو (شعر چرایەکە تاریکی .. ڕۆشن ئەکاتەوە ـ شعر جوانی هەموو شتێکمان بودەر ئەخات ـ شعر لەئاوازی دڵگیری بلبل .. لە .. لە .. لە .. دەنگی موزیقە مەعنایەکمان بۆ دەردە چوێنێ ـ شعر ژیانە ...) . ئەم قسە لووسو لێکانە سەرەڕای ئەوەی چی لێ خەرج ناکرێ ، بەسەر هیچ بنگەیەکەوە ناوەستنو خۆیان بەهیچ لایەکدا ساغ ناکەنەوە . هەزارساڵیش پترە ئەو جۆرە قسانە دەگوترێن بەلام لەوماوەیەدا بەخەیاڵی کەسدا نەهات قسەی ئەوتۆیی بۆ پووچاندنەوەی ئەبوو نەواسو موتەنەببیو ئەنوەریو ابن الفارض بێ هەتا ڕەخنە سازەکەی خۆمان هاتو بەخێری خۆی چاوی کردینەوە ..

لەکۆتایی لاپەڕە (14)و بەشی زۆری لاپەڕە (15) بیروڕاو وەصفی (شێللی) دەنووسێتەوە لەبارەی شیعرەوە ، ئەوانیش گوتەی بێسنوورو بێ (هویە)ن هەرگیز دەست نادەن ببنە پێناسەی شعرو عەیارەی ڕەخنە سازی ، وەکوو کەدەڵێ (شیعر وێنەیەکی ژیانە لەڕاستی ئەزەلییەوە وەرگیراوە ـ لەشەوانی لێك بڕاندا فوو لە کوورەی دڵ ئەکا ـ تەرجەمەی نیگای ئاسکێکی سڵ ئەکا ـ بەخوێنی دڵو فرمێسکی چاو ئەنووسرێ ...) . وەك دیارە ڕەخنە سازەکەش وەکوو شێللی یەك ئایدیالیستی مۆدێلی چەند صەدەیەك لەمەوبەرە ، ناشزانم لەفەلسەفەوە بۆ ئایدیالیزم چووە یاخود لە جوینەوەی قسەکانی شێللی بەئایدیالیست دەشوبهێ ..

دواتر لە کۆتایی لاپەڕە (27)و بەشی زۆری لاپەڕە (28) قسەی دیکەی ڕەخنە سازەکە تۆمار کراونەتەوە ، سەرەتایان ئەمەیە :

«لەپاش ئەمەی کەزانیتان شعر چیە ڕەنگە هەمووتان بقیژێنن بە سەرما بڵێن : کەوا بوو وەکو تۆ ئەلیت کورد شعری نیە ؟» . پاش چەند دێڕێك دەڵێ : «خۆتان شعری کوردی بخوێننەوەو ئەگەر لە : (وتنێکی وزنداری قافیەدار) زیاتر تان دی ؛ بڵێن هەیەتی ، ...» . دواتر دەڵێ «کەوتم شعرمان نیە یعنی شاعرمان نیە : محوی ، سالم ، کوردی ، نالی ، ناری ، زیوەر ، حمدی ، مختار کێن ؟» . ڕەخنە ساز بەڵێن دەدا لەگوتارێکی دیکەیدا یەکە یەکە باسبان بکاتو هەڵیان سەنگێنێت ، بەلام نەیکرد .

لەلاپەرە (30)دا دوای سەرشکێن کردنو بەهیچ دەرچواندنی شیعرو شاعیری کورد [لەدەمی دەرنەچووە هیچ شاعیرێکی کورد لەو حیسابە دەربهاوێ] ئەمانە دەڵێ :

«تووخوا پێم بڵێ کێ هەیە ؟ لەنیوەی شەوێکی کوردستاندا ، لەزەردە پەڕێکدا ، لە بەرە بەیانێکدا ، لە ڕۆژئاوایەکیدا ، سەیری کیو کەژ بکا ، لە هاوینیکا سەیری گولشەن لە بروانیتە تارای سەوزو سووری دەرو دەشت ، لەپایزیکدا گوی لە ورشەی ڕەشەباو خرڕەی گەلاڕیزان ، لەزستانێکدا .... چاوی پێ بکەوێ شاعریش نەبێ نابێ بەشاعر ؟ وەرە شعرێکی دلداری شاعرەکانمان بخوێنەرەوە کە ئەمە بەشی هەرە زۆری فەرمانی شعریانە ... هتد»

کاکی ڕەخنەساز ئەگەر ماویت لە خۆت ، دەنا لە تارماییت دەپرسم : کام شاعیری کورد هەیە ئەوەی تۆ دەیڵێیت بە شیعر نەیدابێتەوە ؟ تۆ خۆت نەناس دەکەیت یان بەهاریەکەی حاجی قادرو پارچە هەڵبەستەکانی نالی سەر بەبەهارو شارەزوور وقەرەداغت نەبیستووە ؟ چۆن پیرە مێردت لەبیر چوو ؟ بەخۆیو چەند پارچە شیعری سەر بەکوردستان کەئاگر لەدڵی

هەستیار بەردەدەن ؟ دەسکێ لەگوڵەکەی باغچەکەی سەرا هۆنراوەی سەرەتای سییەکانە ، لەگوێچکەت نەی زریکاند ؟ بێنی بە لووتتدا نەچوو ؟

ئەی رەخنەساز ! ئەی خوێنەر : گوێت لەم حیکایەتە بێ :

ساڵی 1957 بەدوا لێشاوکەکەی سلێمانیدا تیپی مەولەوی سەری لە کۆیە دا . یەکەم شەوی ئاهەنگ مامۆستا صالح دیلان لەنۆرەی خۆیدا پارچە هەڵبەستێکی پیرە مێردی بەئاواز خوێندەوە خەڵقەکەی پێ سەرشێت بوو ... سبەینێ معاونی شرطەی کۆیێ تکای لێ کردم کە لە شەوی دووەمدا کاک صالح هەڵبەستێکی دیکە بخوێنێتەوە ... ئنجا ئەی خوێنەر کە میللەتێك تا ئەم رادەیە بە ئاگری شاعیرەکەی هەڵچێ چ پێویست دەمێنێ بە هانا بردنە بەر عەیارەی فەننی بۆ ئیسپات کردنی پێوەندیی شاعیر بەمیللەت و خاکیەوە ؟ بۆ پڕوپووچ نەبوونی شیعرەکەی ؟ شێللی کاری وەهای لە ئینگلیز کردووە ؟ لەوەتەی بەر لە 150 ساڵێك شیعری عەرووزی لە کوردستانی عیراق و ئێران پەیدا بووە مەجلیسی شادی و رابواردنی شەوانەو بەزمو ئاهەنگی کوردەواری ئەو مەڵبەندانەی بە لەهجەی باشووری دەئاخێون ، بە شیعری شاعیرەکانمان گەرم بۆتەوە ، وێرای بەیت و بەستەو لاوك و حەیران .. تا ئەو ساڵانەش لەکۆیێ ، کاتێك بووك دەگەییشتە بەر دەرگەی ماڵی زاوا ، تاقمێك گەنجی دەنگ خۆش لەسەر قەمتەرەی دەرگا غەزەلی (ساقی لەپەردە دەر هات)ی سالمیان بەئاهەنگ دەخوێندو تێکەڵ بە هەلهەلەو قاژو قووژو تێك هاویشتنی قەوغاو رمبەی پێی شایی کەران و فیقەی زورناو تەپەی دەهۆڵ دەبوو کەسیش لەو حەشرو حەلایە هەستی بە کەلێنی (شێللی و بایرۆن) نەدەکرد . شیعری عەرووزی کوردی تائیستاش لەبەر چەژی کوردەواری ئاشناترە لە شیعری رەهای نوێ بابەت بەخۆی و بەتەکانە بەرەوپێش چووەکانی رووەو سەقافەتی ئەورووپایەوە : بە قەدەر نزیك بوونەوەی شیعرمان لەفۆرم و شێوازی ئەورووپا دەبێتە بابەتی دەستەی خوێندەوارە هێزاکان و لەجەماوەری ناو کووچەو بازاڕو دەرو دەشت دەتارێ .. رەخنە سازەکەمان لە سەرەتای لاپەڕە (31)دا دەڵێ : «شعرێکی دلداری شاعرەکانمان بخوێنەرەوە .. ئەگەر شێوەی ژنێکت هاتە یادەوە پێم بڵێ چە ژنێکە ، چینی ؟ هندی ؟ ... هەرچی ببێ ژنێکی کورد نییە ، بەڵێ ئاهەقیان نییە ژنی کوردیان نەدیوە ، نەیان دیوە (بەهی) مەر بدۆشێ ، (شیرین) مەشکە بژەنێ (گوڵناز) بەشەدەی لاریەوە گۆزە لەسەر شانی لەکانی بێتەوە ...» . لەئاست (مەڕ بدوشێ)دا ، زۆر بەسەیری ، راستییەکی بێ گومان هەیە لە شیعری تەمەنی 20 — 22 ساڵەی باپیرم باسی کچێك دەکات مەڕی دۆشیوە ، دواتریش شەیدای بووە :

کەبێری هاتە ناو مێگەل سەراپا قرمزی پۆشی
مەلا ئیدراکی چوو شێخیش تەریق زاهید نەما هۆشی

ئەگەر ناوی تەشی ڕێسی هێنابایە دەمگوت (شیرن تەشێ دەڕێسێ) یەکەی وەفایی بخوێنەوە . نالی نەك هەر وەصفی ئافرەت ، بەڵکوو ئافرەتێکی خێل دەکاو خێلیەکەی بۆ بە ئاراییشت دادەنێ :

پێم دەڵێن مەحبووبە خێل و قیچە مەیلی شەڕ دەکا
خێل و قیچە یا تەرازووی نازی نەختێ سەر دەکا

حاجی قادر لە (شەمسییەیی شاهەنشەهی ئەرز)دا کە وەصفی گوڵ دەکا ، دیمەنی کچێکی نازداری لاجان نەخشەکێش دەکا .. شیعرەکانی گۆران ، بەشێکیان وەکوو کامیرا وێنەی چەشمەندازی گرتووە ، لەناویدا ئافرەت : وەصفی شانۆو ژنە دانسەرەکەو تیپی مۆسیقاکەی هەر بەو کراوە . باوەڕ دەکەم لەقەصیدە مەشوورەکەی (ابن الرومی) تێپەڕاندووە کە وەصفی جاریەیەکی گۆرانی بێژی تێدا دەکات . مصباح الدیوان لە قەصیدەی شەوە مەشوورەکەیدا ، هەر چەند دەشڵێ کاری خەیاڵە ، پەیکەری ئافرەتی داتاشیوە : بەئیزنی خوێنەر ئەم پارچەیەی لێ دەنووسم :

وەك تازە هەڵووژێکی لەناو دوو لقەدابێ
وا رێك گوشرابێ کە لە دوولاوە قوپابێ
هەندێکی قوپابێت و ئەوی دی قڵەشابێ
قڵشانی نەوابێ کە بەچاو فەرقی کرابێ
هەر وەك کە لەسێوێکی درابێ لەبی نەشتەر

دەك بۆ سیحرو ئەفسوونت کەڵە شاعیر !! تۆخوا کەلەو قەصیدەیەدا لەوەصفی بەیەکدی گشتنی لەگەڵ یارەکەی و

ئەندازەی پێوە گەشانەوەی ، دەخوێنێتەوە :

دەبزانە چ شیرینە کە روح بێتەوە بەر بەر !!

هەست ناکەیت فەرەحنایی یەك دەتگرێتەوە ؟ مصباح الدیوان لەو شیعرەدا چی نەهێشتۆتەوە لە لەزەتی چەژی ئافرەت نەیگوتبێ ، پێشتریش نالی لە وەصفی مەستوورە وێنەکێشی ی‌و پەیکەر تراشی ی ئافرەتی کردبووو سەرمەشقی دادا بوو بۆ مصباح الدیوان . ئەم دوو وەصفە بگرن بە قصیدە مەشوورەکەی (نابغة الذبیانی)کە پێی دەگوترێ (المتجردة)و بزانن ئەمانە لەکوێ‌و ئەولەکوێ . بەهەمە حاڵ هەست کردن بە تامی مێیینە ئیمتیازێك نییە بەر ئەوروپا کەوتبێ ، کوردیش تێیدا خاوەن پشکە . لەگەڵ ئەمەشدا نابێ لەبیر بکەین کە هەر واقیعە داخوازی‌و بڕیاری خۆی هەیە لە باسی هەستداری وەك وەصفی لەشی ئافرەت ، خۆ ئەگەر بسەلمێنین شاعیری کورد ئافرەتی نەدیتووەتا بتوانێ وەصفی بکات عوزری خۆی لەگەڵ خۆیدا دەبێت‌و بۆشی دەمێنێتەوە لە جیاتی ئەوەی قەرزدار بێ .. هیچ کەسێك لەهیچ مەیدانێکدا بەولای توانایەوەی لێ داوا ناکرێ .

ڕەخنەسازەکەمان لەلاپەڕە (6) وشەیەکی لەدەم دەرهات بۆ عەیبدار کردنی شاعیری کورد کەگوتی : «شاعرەکانمان هەتا ئیستا بروا ناکەم لەواتەی سیاسی وستایش زیاتریان بیستبێ ..» . مەبەستم لەو وشەیە (واتەی سیاسی)یە کە دیارە بەلای ڕەخنە سازەکەوە نرخێکی ئەوتۆی نییە . هەرچەند ئاشکرایە لە بابەتی ناو دیوانەکان کە سیاسەت‌و ستایش ناوەڕۆکی شیعری کوردی بەر لە 1930 پڕ ناکەنەوە ، هەر خۆیشی دواتر گوتی دڵداری بەشی هەرەزۆری شیعری شاعیرەکانی کورد دەگرێتەوە ، بەلام لێرەدا مەبەستم نییە ئەو هەڵەیەی ڕاست بکەمەوە بەڵکوو دەمەوێ بڵێم ڕەخنە سازەکە لەو بێبایەخ کردنی بیستنی شتی (سیاسی) ئەوەندە لەواقیعی کوردو میللەتی وەك ئەویش پشت ڕێ بووە کە ئیتر هەرچی شیللی‌و بایرۆن‌و ڤیکتۆر هیگۆی دنیا هەیە بخرێنە دەستە تەرازوویەوە ناتوانن قورسی بکەن : لە سالانی 930 ، کە تازە بەتازە کارەساتی شەشی ئەیلوول ڕووی دابوو ، پێش ئەویش‌و دوای ئەویش شۆرشەکانی شێخ مەحموود تەقی‌بوونەوە ، ئەگەر شاعیری کوردو شیعری کوردی گوێ‌گرو گوێ‌بیستی بابەتی سیاسی نەبووبن‌و شیعریان بەرەو سیاسەت‌و بیری قەومایەتی نەچووبێ چ حورمەتێکیان پیوە دەمێنێ ، میللەتیش هێندە نەزۆك بێ نەتوانێ بەزمانی شاعیرەکانیەوە دەم لەئیش‌و ئازاری باری سیاسی خۆیەوە بدا هەقی ئەوەی نابێ ڕەخنەسازەکە پەروشێ لایەنی بێکەلکی ی شیعری بۆ بخوا چونکە میللەت بەو نەزۆکییەی لەمافە بنەڕەتیەکەی ژیانو بەخۆنازینی ترازاوە .. ئیمە کە نووسینەکانی ڕۆژنامەی دەوری شێخ مەحموود لە سەرەتاکانی بیستەکان دەخوێنینەوە و سروودەکانی ئەو سەردەمانە بەبیر خۆماندا دەهێنینەوەو کوردستان‌و چارەنووسی کوردەوارییان تێدا دەبینین ، دەزانین خەڵقی ئەو دەمە بەنووسەرو شاعیرو جەماهیرەوە پتر ڕۆڵەی سەردەمی خۆیان بوون لەو ڕەخنەسازەی کە 10 — 12 سال بەدوا تەجرەبەی ئەواندا تەزووی (ئەی وەتەن مەفتوونی تۆم)ی پێدا نایەت . سەیریش لەوەدا نییە چونکە بە نموونەکانی نووسینی‌دا دیارە گەنجێکی ڕۆمانتیکی خەیالاوی دوور لە واقیعی کوردە .. تەنانەت کە دێت وتەرجیحی بەستەبێژو بەیت هۆن دەدا بەسەر شاعیری عەرووزی کورددا هەڵەیەك دەکا زۆر ئاوخواز بێ : من لەنووسینی دیکەمدا گوتوومە ئەوانەی عەیب لەشاعیرەکانی صەدەی بیستەم دەگرن‌و بەرهەمەکانیان بێکەلك دەکەن سەرەوبن لەدنیا ڕادەمێنن چونکە گوناهی ئەو شاعیرانە بریتی بوو لەوەی کە فێری سەقافەتی سەردەمی خۆیان بوون‌و لە نەخوێندەواری ڕزگار بوون‌و گەیشتنە پایەی مەلایەتی‌و شاعیری‌و میرزایی ئنجا کەوتنە بەر تیرو شیری توانجی خوێندەواری شلکی ئەم سەردەمە وەك مێرووی باڵی لێبرسکێ بەر غەزەبی خوا دەکەوێ ، ئەمما ئەگەر بەنەخوێندەواری مابانایەوە بەر ئەو ڕەحمەتە گشتییە دەکەوتن کە بۆ گیانی مردووان بەڕێ دەکرێ .. ئەوساش ڕووپەڕەی مێژووی ئەدەبمان سپی‌و خاوێن‌و لووس ، وەکوو دەشتی کاکی بەکاکی ، دەمایەوە هەر پێی دەویست شاسواری وەکوو ئەم ڕەخنەسازە قەڵەمی سەقافەتی نوێی لەسەر بگێڕێ ..

ماوەتەوە لە مەیدانی ڕەخنەسازی‌دا شتێك بڵێم جارێ نەگوتراوە :

ڕەخنەی ئەدەبی ئەگەر لایەنی هونەری‌ی بابەتی ڕەخنە لێگیراو نەگرێتەوە لەمەفهوومی (ڕەخنەی ئەدەبی) دەشۆرێ‌و دەبێتە وەعزو ئامۆژگاری‌و بەلای ئەخلاقدا دەچێتەوە . من کە

گوتم : هۆکابرای بەقاڵ سێوەکانت مەدە بەرسەرماو سوڵ دەنا ڤیتامینیان دەمرێ [ئەگەر راست بێ دەمرێ] نەبوومە (رەخنەگری هونەری) بەڵکوو بوومە دکتۆر . بەلام کە هاتم عەیبم لە ریزکردن و تەرتیب دان و جۆری دیار خستنی میوەکانی گرت بەرەو لایەنی (جمالی و هونەری) دەبمەوە . ئەدەب ، هونەر ، یاری ، تەمسیل [ئەویش هونەرە] ، دامەو شەترنج ، باغەوانی ، نەخش و نیگار ... و چەندەها لایەنی دیکەی ژیانی کۆمەلایەتی و باری گوزەران هەن دەچنە ژێر سەرە ناوی (مەهارەت) لە پاشدان تایبەتیەکانیان لێکیان جودا دەکەنەوە : حیکایەت بێژی هێژا هونەرکارو ماهیرە بەلام جودایە لەگۆرانی بێژ ، هەروەهاش هەموو مەهارەتێکی دیکە . ئنجا ئەگەر رەخنەگر فەرامۆشی کرد کە لە شیعرو هونەردا لایەنی مەهارەت هەیەو خۆی بە لایەنی فەلسەفەی بابەتەکەوە خەریك کرد هەقیەتی لەسەر کەوڵی شێخایەتی دانیشێ . بە نموونە ، (بردێە)ی بوصیری بەدارشتنە رەنگینەکەی هونەرو مەهلوتە ، بەناوەرۆکەکەی سۆفیەتییە : ئنجا ئەگەر لەروخسارو لە ناوەروکیمان کۆڵیەوە یان بەتەنها لەروخساریمان کۆڵیەوە دەبینە رەخنەگری ئەدەبی ، بەمەرجێك قسەکانمان نرخی ئەو وەصفەی پێوەبێ چونکە هەموو عەیب گرتن وەیا نرخاندنێك ناچێتە پلەی رەخنەی ئەدەبییەوە . ئەمما ئەگەر بەناوەرۆکیەوە خەریك بووین و شێوازمان بەلاوە نا ئەوسا رەنگە (اصولی ، نحوی ، کلامی ...)بین . ئەو ئایەتانەی سوورەتی (الشعراء) کەباسی شاعیران دەکەن تەنها بەلای ئاکاردا چوون و خۆیان لەهونەری شیعر نەگەیاندووە ، باسی شێواز ناکەن ، مۆسیقای ناوەکی هەڵناسەنگێنن ، رەخنە لە دارشتن ناگرن .. بەڵکوو لە کولانەی خواناسین و روانگەی بەهەشت و جەهەننەم (اعملوا الصالحات)ەوە شاعیران سەرشکێن دەکەن . ئەگەر لەجیاتی (ویقولون مالا یفعلون) بیانفەرموویایە واتا بەقوربانی ئارایشت دەکەن وەیا لەپێناوی کێش و سەروادا کەسرە دەکەن بەیێ وەیا لەتەشبیهی حوشتر بە حوشترمرغ ناشارەزان ... دەشیا خەیاڵ لەرەخنەی ئەدەبی بکەینەوە . ئەو ئایەتانە هەر دەچنەوە ریزی (ویمنعون الماعون ـ ویل للمطففین)با ناوی شاعیریشان هێنابێ . بێینەوە سەر حیسابی کابرای رەخنەساز ، راستە خەریکی رەخنەیە بەلام قسەکانی بەهیچەوە بەند نابن .. شتێك نالێ پێرەوی لێ بکرێ . باشترینی گوتەکانی بەر لە هەزار سال گوتراون ، تەنانەت ئاگای لەخۆی دەبرێ رەخنە لە کێ دەگرێ : لە لاپەرە 33دا دەڵێ : «... بەلام ئەمانەی ئێمە [شاعیرانی ئێمە] ئاوێکی لێڵن ... لە عەصری (20) هەمی شارستانیەتی‌دا لاسایی شاعیرانی حەوت و هەشت عصر لەمەوبەر دەکەنەوە ...» . ئەمە دەڵێت کەچی گاڵتە بەشیعری سالم و نالی دەکات کەهی صەدەیەك لەپێشترن و داهێنەری شیعری عەرووزین لەهەموو کوردستانی لەهجەی جنووبی .

راستییەکەی رەخنەی وەك ئەوانەی رەخنەسازەکە دەیانگرێ ، نرخ بەوەدا پەیدا دەکەن کە دواتر لەسەریان دەنووسرێ : کابرایەك کەدەستی دایە شمشێرو چووە راوی پڵنگ و کە گوێی لەدەنگی پڵنگیش بوو هەلات هی ئەوە نییە بە نووسین خەریکی بیت چونکە راوکەر نییەو رێویشی نەگرتووە . تەنها لەوەدا هەقە باسی بکرێ کەبگوترێ پڵنگ ئەو دەعبایە خوێرووە نییە تۆ بچیتە راوی . د.کامل خۆی ماندوو کردووە بە بەراورد کردن و بەبەلگە هەندێ لە رەخنەکانی بەرپەرچ بداتەوە ، وامنیش بەدوا ئەودا خۆم ماندووکرد ، تەنانەت لە لاپەرە 31دا دوو بەیتی سالەکانی 1920 لەشیعری (أحمد مختار جاف) دەهێنێتەوە بەنموونە بۆ هەبوونی شیعری کوردی کەلای دابێ لە بابەتی دلداری‌ی لاسایی‌کەرەوە :

«شاعیرانی کورد بەسە بەس باسی زوڵف و چاو بکەن»

بەلام سەرەرای ئەوە کەرەخنەسازەکە خۆی لەلاپەرەی پێشووتردا گوتی (لەگەل ئەسیری نیم لەوەدا کە دەڵێ «ترکی اشعاری عشق بازی کە گەر زەوقت هەیە») پێشتریش لەزیمندا عەیبی لەفکری سیاسی شاعیرەکان گرتبوو ، ئێمە ئەگەر بەدوا شیعری ئەوتۆیی‌دا بگەرێین حاجی قادر هەیە بەر لە احمد مختار بە 30 سال وەیا زیاتر گوتبووی :

حەیفە بۆ پیاوی صاحیبی تەمیز
هێندە باسی مەکانی پیسی و میز

سالانی بیستیش هەنگامەی شیعری پرخرۆشی گیانی کوردایەتی بوون . پیرە مێرد گوتبووی :

کچانمان لەژێر بەیداغی رەشدا
چاو هەڵئەهێنن بەخوێنی گەشدا

کـورانـمـان هـەمـوو بـەوردو درشـت
لەرێـی ئـازادی خـۆ نـەدەن بـەکـوشـت
ئـازادی نـابـێ سـەربـەسـتـی نـابـێ
ئـازادی دەبـێ هـەر خـوێـن بـەهـابـێ

مەلا حەسەن بورکانی «ئەی کوردی ستەمدیدەی» تەقاندبۆوە . زیوەرو بێکەس ئاگرۆچکەکانیان خستبوە ناو هەلبەستەوە . لەکوێێ مەدرەسەی حاجی قادر لەلایەن باوکمەوە بە بیری نوێ ترەوە ژیابۆوە . لەو سالانەدا شیعری سەر بەکوردایەتی‌و ڕوو لەکۆمەلایەتی‌و دژی ئەفسانەو لایەنگیری زانست‌و حورمەت کار بۆ ئافرەت‌و ئەو تەرزە بابەتانە تەنگی بە شیعری دلداری هەلچنی بوو : حوکمداریەتی شێخ مەحمودو شۆرشی شێخ سەعیدی پیران‌و بزووتنەوەی سمکۆ ویژدانی شاعیرانی بەگیانێکی تێرو تەژی‌ی نوێ خوازی ڕووەو صەدەی بیستەم زاخاودابوو . هەر لەو سالانەدا دەست کرا بە لە چاپ دانی دیوانی شاعیرەکانی ئەوساو صەدەی پێشووتر . باری شیعری ئەودەمەی کورد گەلێك پێش پلەی گۆڕانی مادی کورد کەوتبۆوە کە لە ڕێکاری ئیفلاسدا بوو . ئەمانە هەموو بەلای ڕەخنەسازەکەوە بایی پوولێکن ، ڕەنگە بیریشی لێ نەکردبێتەوە چونکە بەکێشانەی شیعری شێلی شاعیرەکانمان هەلدەکێشێ . ئەو ئەگەر هیچی زانیبایە لە بریاری باری مادی‌و دەوروبەرو پلەی شارستانەتی دەبوو کرنوو ببا بۆ نالی کە 80 سالێك بەر لەگوتارەکەی ڕەخنەگرانەی گوتبووی :

«کەس بە ئەشعارم نەلێ خۆ کوردییە خۆ کردییە»

بەداخەوە هەمان خولەبیر کردن بۆ ماوەیەك لە پاش شەڕی دووەمدا سەری لە بەشێکی ئەدیبی کورد شێواند ، ئیستاش لەشیرازەی گەلێك گوتارو هۆنراوەی ئەم ڕۆژانەماندا هەست بە جۆرە لێلیەکی بینین دەکرێ ، بەلام بە تێکرایی سەقافەتمان ماوەی بەرچاوی بریوە : دەست‌و قەلەمی ڕەنگین‌و زمانی تەڕو پاراو ئابرووی کوردایەتی دەپارێزن‌و بۆی دەجەنگین‌و ئارادەیەکی دل خۆش بکا (هەست بەخۆکردن‌و ڕێگا دۆزینەوە) پێیانەوە دیارە .

لەگوتارەکەی (د. وریا عمر امین) یەك ڕوون کردنەوەو یەك تێ‌بینی بەپێویست دەزانم :

ڕوون کردنەوەکە ئەوەیە کەڕاناوی لکاو لەزاری کرمانجی خوارووداد لەڕووی هێزەوە دووبەشن : بەشی بەهێزیان ئەوەیە لە ڕابوردووی تێپەڕدا بەکار دێن وەك :

گوتم گوتمان
گوتت گوتتان
گوتی گوتیان

بەشی بێ‌هێزیان ئەوەیە کە لە ڕابوردووی تێنەپەڕدا دەردەکەوێ و بەدوا مضارعی تێپەڕو تێنەپەڕدا دێت :

نووستم نووستین
نووستیت نووستن ڕابوردووی تێنەپەڕ
نووست نووستن
دەنووم دەخۆم
دەنووین دەخۆین
دەنوویت دەخۆیت
دەنوون دەخۆن
دەنوێت دەخوات
دەنوون دەخۆن

وەك دیارە ڕاناوی کەسی یەکەمی تاك لە هەموو باراندا هەر (م)ە .

دەرنەکەوتنی ڕاناوی کەسی سێیەمی تاك لەڕابوردووی تێنەپەڕدا دواتر بەتێ‌بینی بۆی دەگەڕێمەوە .

بەهێزی‌و بێ‌هێزی ڕاناوەکان جگە لەوەی کە تێپەڕو تێنەپەڕ بوونی کارەکانیان لەڕابوردوودا هێمای بۆ دەکات دیاردەیەکی ڕێزمانیشی لێ دەکەوێتەوە ئەویش بریتییە لەوەی کاتێك کەڕاناوی لکاوو نەلکاوی بەهێزو بێ‌هێز لەڕابردووی تێپەڕدا وێکرا هاتن هەمیشە بێ هێزەکە دەبێتە بەرکار هەرچەند شوێنی کاراشی گرتبێتەوە . دەزانین بەپێی دەستووری گشتی لەڕێزماندا کارا (فاعل) بەدوا بەرکار (مفعول)دا دێت وەك گولم چنی .

تۆم دیت
ئێمە یان گرت

بەلام ڕاناوی بێ‌هێز لەهەموو باراندا دەبێتە بەرکار :

دیتمن من ئێوەم دیت
دیتنم من ئێوەم دیت
دیتیانیت تۆیان دیت

دیتیتیان    تۆیان‌دیت

لەهەردوو فۆرمدا راناوەکانی (ن ، یت) بەرکارە .

راناوی کەسی یەکەمی تاك چونکە هەر شێوەی (م)ی هەیە ، بەلای باوەڕمەوە ، پێویستە لەجێگەی کارادا بەکارا بروات :

دیتمت

دیتتم

دیارە لە ڕستەی یەکەمدا (م) بەرکارە . بەلام لەڕستەی دووەمدا گومان هەیە لەوەدا ئایا کام ڕاناو کارایەو کامیان بەرکارە :

هەرچەند هەق وایە بگوترێ (دیتمیت یان دیتیتم) بەلام کە گوترا (دیتتم) پێویستە ڕاناوی (ت) بەرکار بێ .

دەمەتەقە لەسەر (دیتمانیان ، دیتتانمان ، دیتیانمان ..) و لەسەر (دەتانبینین ، دەمانبینن ...) لێرەدا جێی نابێتەوە . تێبینیەکە ئەمەیە :

ڕاناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاك لە (مضارع)دا دەرناکەوێ . کۆتایی کاری کەسی سێیەمی تاك سێ جۆری هەیە :

دەکات

دەچێت

دەژیت

لێرەدا چاوپۆشی لەشێوەی (دەکا ، دەچێتن ..) دەکەین .

لەنووسینی دیکەمدا لەسەر ئەم باسەم نووسیوەو دوو بەلگەم بۆئیسپاتی ڕایەکەم دەربڕیوە :

بەلگەی یەکەم : ئەگەر ئەوکۆتایی‌یانە (ا ، ات ، اتن ـ ێ ، ێت ، ێتن ـ ی ، یت ، یتن) ڕاناوی لکاو بانایە دەبوو ئەوانیش وەکوو ڕاناوە لکاوەکانی دیکە لەڕستەدا ببنە بەرکار . ئێمە دەڵێین :

دیتمیت    تۆم دیت

دیتمن    ئێوە ، ئەوانم دیت

دیتیانین    ئەوان ئێمەیان دیت .. هتد

بەلام نەگوتراوەو ناگوترێ :

دیتمێت ، دیتمێتن ، دیتما ، دیتمات ..

بەکەس ناکرێ لەسنووری ڕێز گرتن لە ڕێزماندا بلێ ئەو کۆتایی‌یانە (ێت ، ێتن ، ا ، اتن ..) ڕاناون‌و ناشبنە بەرکار . تاکە بەهانەیەکی شکی ببەم بۆ ئەوەی بەڕاناو دابندرێن هەر ئەوەیە کە لە فارسیدا کۆتایی کاری کەسی سێیەمی تاك ، تێپەڕو تێ نەپەڕ ، لە مضارعدا کە (د ، اد)ە بەلای هەندێ لە زمانناسەکانیانەوە ڕاناون ، بەلام لەفارسیشدا کەس جەوابی نییە کەلێی بپرسێ بۆچی نابنە بەرکار ؟ خۆ ئەگەر دەرچوو لە فارسیدا دەبنەوە بەرکار دیارە هەقیانە بەڕاناویان دابنێن . من بەگومانەوە قسە دەکەم لەبەر ئەوەی بەڵەدی فارسی نیم بایی بڕیار دان لەباسی وەهادا . وەك بزانم ئەوەی لەفارسیدا دەبێتە بەرکار بۆکەسی سێیەمی تاك (ش)ە وەك (گفتمش ، می‌گویمش) .. لەپەهلەویش هەر ئەوە ڕاناو بووە . لەکوردیدا ئەم کۆتایی‌یانە زیادییەکی گەردانن وەك ناوناوە لێرەو لەوێ زیادەی وەها دێتە قسانەوە ، بە نموونە لەسلێمانی دەڵێن : بۆم بێنەرەوە [لە جیاتی بێنەوە] ، هاتمەوە وانێ [لە جیاتی هاتمەوە] . لەزۆر جێگەدا دەگوترێ ئێستەکێنێ لەجیاتی [ئێستا] ، ڕاوەستەکێ ، لەجیاتی [ڕاوەستە] . ناوچە هەیە دەڵێ : گرتبام هەیشە دەڵێ گرتبامایە ، بمگرتبایە ، بمگرتایە ، بمگرتبا .. ئەوەندە هەیە ئەو (ت) . و (تن)ە هەمەکیترە لەوان . هەرچی (ا ، ێ ، ی) جێی بایەخ نین بۆ لایەنی ڕاناو بوون چونکە ناشێ ڕاناوێك سێ جاران بگۆڕێ .

بەلگەی دووەم : وادەزانم ئەمەیان بەهێزتریشە .

بەپێی ڕاناو بوونی ئەو کۆتایی‌یانە دەبێ لە کاری (چووبێت ، چووبێتن)دا ئەم (ێت ، ێتن وەیات ، تن)ە ڕاناو بێ چونکە (دەبێت) هەر خوویەتی هاتۆتە دوایی (چوو)ەوە تەنها نیشانەی (دە)ی لێ قرتاوە . ئنجا ئەگەر ئەمە وەهابێ چ بلێین لەئاست (چووبێتین ، چووبێتیت ، چووبێتم) چونکە لەم ڕێژەیەدا دوو ڕاناو بەدوا یەکدیدا دێن هەردوویان کارا (فاعل)و یەکیان بۆ کەسی سێیەمی تاك ئەوی دیکەشیان بۆ کەسی یەکەم وەیا دووەم ؟ قسەی ئەوتۆیی هی کردن نییە .

(چووبێت) کاری تێ نەپەڕە . کە بلێین (کردبێتی) ئەوسا دوو ڕاناوی کەسی سێیەمی تاك بەدوا یەکدیدا دێن هەردووشیان کارا ، یەکیان بەهێزو ئەوی دیکەشیان بێ هێز !!

وادەزانم بەر لەوەی ئەم هەڵەیەش وەکوو وشەکانی (فرمان ، ڕاناو) چنگ لەهەناوی ڕێزمانی کوردی گیر بکات پێویستە لەسەر مامۆستا دڵسۆزەکانی زمانی کوردی نەفەسی

ببڕن . وشەی (فرمان) بەکار هێنانێکی بازاڕیی وشەی فەرمانە بەواتای (امر)ی عەرەبی . ئنجا نەخوێندوو گوتی (فرمانی خۆم بەجێ هێنا) مەبەستیشی (ئەو فەرمانەی بەسەر مەوەیە بەجێم هێنا) بە تاقمی خوێندەواریش گوتی دیارە (فرمان) بەواتای (عمل ، فعل) دێت‌و کردی بە (فرمان)ی ڕێزمانی لەجێگەی (فعل)ی عەرەبی ... هەرچی وشەی (ڕاناو)ە بە دژایەتی زمان‌و ڕێزمانی کوردی پێشگری (ڕا)ی لەفیعلەوە هێناوە بۆ سەر وشەی (ناو) کە لە بەرەی (ناو ـ noun)ە . ئەم ڕەفتارە وەك ئەوەیە بگوترێ (هەل مەترەق ـ وەر گۆزە ـ دابانجان) . ئەگەر بڵێین لە (ئەڕا) وە کورت کراوەتەوە دەبوو بگوترێ (ئەڕای ناو) وەك کە گوترا (بۆناو) .

واشدەزانم وشەی (کار) بۆ (فعل) لە هەموو زاراوەکانی دیکە باشترە هەرچەند ئەویش verb ناگرێتەوە بەلام چونکە لە هەموان پتر بەلای (تجرید)دا بۆتەوە پەسەندترە لە (کردن ، کردار) . وشەی (کارا) بۆ فاعل‌و (بەرکار) یش بۆ مفعول بە وشەی جوانن ، هەر لەو بوارەیشەوە وشەی (کارگێڕ) لە (بەڕێوەبەر ، سەرپەرشتی‌کەر خۆشترە . زێدە واتای تجرید لە وشەی کاردا بەوە ڕوون دەبێتەوە کە دەگوترێ (کاری تێ‌کرد) نەك کردار یان کردن .

لە ئاست لێکۆڵینەوەکانی لیژنەی زمانی کوردی تەنها دوو تێ‌بینی دەردەبڕم :

یەکیان ئەوەیە ، لەکوردی‌دا سێ ڕێژە پەیدا نییە بۆ زەمانی ڕانەبوردوو . لەزاری کوردی ناوەندی (خواروو ، باشوور) دا تەنها یەك ڕێژە هەیە ئەویش بو ئیستاو دواتر وەك (دەڕۆم ، دەخۆم ..) . لەزاری کرمانجی سەروودا دوو ڕێژە هەیە (دچم ، دێچم) . لیژنە زۆر بەڕووناکی بۆ سێ زاراوەی (حاضر ، مضارع ، مستقبل) نەچووە چونکە (مضارع) دەخلی بەسەر زەمانەوە نییە بەڵکوو بە واتای (مشابە ، مماثل)ە لەوڕووە کە (یضارع الاسم في قبول الحرکات) . لەڕووی زەمانەوە یا (حاضر) هەیە یا (مستقبل) ئەویش لەعەرەبی‌دا بە (سیفعل ، سوف یفعل) دەردەبڕدرێ‌و ڕێژەی تایبەتی بۆ دانەندراوە .

تێ بینیەکەی دووەم ئەوەیە کەگۆڕانی دەنگی (نـ) بە (م) لەو شوێنانەدا کە لیژنە نموونەی بۆ هێناونەتەوە ناچێتە ڕیزی ئەو گۆڕانەی کە باسەکە لێی دەدوێ : گۆڕانی دەنگی (ن)ی وەستاو بە دەنگی (م) لەبەرایی دەنگی (ب)دا بەفەرمانی دەنگسازی (فۆنەتیك) دەبێ‌و ناچارییە : ئەگەر هاتبایە جارێك گۆڕابایەو جارێکیشیان نەگۆڕابایە دەشیا نموونەی لێ بهێندرێ . لە وشەی (نهێنگیر)دا کە بەشێکی کوردەواری بەهەڵە دەیکاتە (نێمگیر) دەنگی (ن) بە (م) گۆڕاوە ، بەلام کەدەگوترێ (شەمبە ، بەرامبەر ، چەمبوڵە ، سەمبەر ، تەمبەل ...) لەجیاتی (شەنبە ، بەرانبەر ، چەنبوڵە ، سەنبەر ، تەنبەل ...) پێی ناگوترێ گۆڕان چونکە زوربەی وشەکان تائیستاش هەر بە (ن) دەنووسرێن ، ئەوەی لەنووسیندا دەیانکاتە (م) هەڵە دەکات . لە عەرەبی هەمان دەستوور هەیە بەلام لەنووسیندا هەڵە ناکرێ .. گۆڕانی (ن) لەو شوێنەدا ، لەزمانی کوردی ، وەك گۆڕانی دەنگی (ل ،ت)ە کە لامەکە بەوەستاوی دەکەوێتە بەرایی (ت)ە کەوە : شەپڵطە ، قەلتارە ، پالتۆ ، ئالتوون .. لە گوتندا دەبنە : شەپڵطە ، قەڵطارە ، پاڵطۆ ، ئاڵطوون .. دەنگی (ك ، گـ) یش لەبەرایی (ی) وەیا (وی) کلۆر دەکرێن : لە سلێمانی کە (د) بەدوای (ن)ی وەستاودا هات دەکرێتە (گـ) . ئەم تەرزە گۆڕانە جودایە لە گۆڕانی (کشپل ، قشپل ـ سەقەت ، سەکەت . کەوت ، کەفت ...) . بۆ دۆزینەوەی باری ڕاستی لەگۆڕانی دەنگەکانی وشەی کوردی پێویستە ئاوڕ لە کتێبەکانی زەردەشتی‌و نووسینەکانی پەهلەوی و سانسکریتی‌و ئەو جۆرە سەرچاوانە بدرێتەوە . بەنموونە (سوور ، سۆر)ی کوردی‌و (سرخ)ی فارسی لە ئاڤیستادا (سوخرە) بووە . وشەی (پەز)ی کوردی لە ئاڤیستادا (پەسوو ، پەشوو) بووە . بەلای منەوە وشەی (کەڵە) لە (کەڵەشێر ، کەڵە باب)دا هەمان (کەهرکە)ی ئاڤیستایە بەواتای (تەیر) بەو پێیە ڕەنگە (کەهرکە شێر ، کەهرکە باب) . بووبێ زۆر دەنگی (ر)ی ئاڤیستا دواتر گۆڕاو ە بە (ل) وەك دەشزانین دەنگی (ل) لەئاڤیستادا نایەتە بەرچاو .

لەلاپەڕە (83)ی (فرهنك ایران باستان) لەنووسینی پووردا‌ود هاتووە : وشەی taro — mati بەواتای (خیرە سری ، نا سازگاری) کەلە دوو وشە پێك هاتووە ، بە باوەڕی من کەرتی یەکەمیان (taro) هەر ئەو (ترۆ) یەیە کە ئێستا لەکوردی‌دا بەکار دێت . لێرەدا هەر ئەوەندە ماوەیە هەیە کەهێما بۆ ئەم لایەنە بکەم ، لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی سەرلەبەر جێگەو کات‌و باری لەبارتری دەوێ .

# گوتنا پێشیا د هوزانا نالبەندی دا

نزار محمد سعيد
دهوك

چاخێ مەرڤ هوزانێت نالبەندێ نەمر دهلشكێڤيت و مێزە دكەتێ ژێرا سەرەكانیێت پایەبەرزیو رەوشەنبیری‌یا وی خویا دبن . ئەم دكارین سەرەكانیێت سەرەكی هولێ بێخینە د چارچوڤەكێ دا

1 ـ بزاڤێن وی لدوی ڤەژەنو زەڤەرێن خو ، ژ بو ڤەخارنێ ژ زانیارییێن ئایینی .

2 ـ تێن شكاندنا وی ژ كانی‌یا هوزانێن شاعرێن كورد یێن كلاسیكی ، نەمازە جزیریێ مەزن ، هەر وەكی د شعرێن نالبەندی دا د دیار .

3 ـ سەربورێن كەسوكی ، ئەوێن گەنجینا مێشكو ئاشوپا وی دەولەمەندكرین . كە ئەنجام ژ گەریانێن وی ، ل ناڤ هوزێن كوردان ، ل دەڤەریو سەرەدانێن وی بو شارێ مویسلو سەر هاتیو دابو نەریتو سینجو رابونو روینشتنێن كوردانو ترانەو حەنەگزیو توری وان یێ مللی . بتایبەتی گوتنێن بابو باپیران د ئاشكراو بەربچاڤن .

4 ـ دیمەنێن كوردستانا رەنگین ئەڤین دل ڤەكەرو دل فرین . جیهانا ئاشوبا وی فرهە كر ، هندی چاڤ ڤەدبن ، چاڤێن وی ڤەكرن .. مشت كرن ... ئو دلێ وی حەلاند .

بێ فتییا نالبەندی هەر تشتێ دیتی ب جانیو كرێتی ، ب باشیو خرابی ، چاكی وقەنجی ونە چاكی . گش داینە بەر قەلەمكێ خوە ، وە بهزاران پەر رەشەڤەكرینە . هەمی دلێ خو گرتییەو گڤاشتی‌یە وان پەركان ژ مللەتێ كورد را ، وە ژ مروڤانەتێ را . مینا مێژو نڤیسان . هوزانڤانێ پێڤەهاتیو رەوانبێژ [ئەحمەدێ نالبەند] ، شعرێن خو ب گوتنێن مەزنا خەملاندینە . درو جەواهرێن بابو باپیران ، دناڤ یێن خوە دا هلدان . بشێوەكێ هونەریو ب شەهرەزایی ئێخستینە نێڤ ئاڤاهیێ هوزانا خوە . ب هوستای یەكا زیرەكانەو ب چەلەكی . ئو وسان وەرگرتینە ، كێشو سەروایێن شعرێ ، نەهێن تێك دان . دیسان ژ لایێ بەژنو رامانانڤە ، پتر تیرو ب هێز تر لێ هاتینە . نە مینا تیرا ل كەندالی ب كار ئانینە .

هەر وسان مەبەستێن ب وان گوتنا هەین د شعرێدا ، گش د جهێ خودا هاتینە . مەبەستا وی ژی ، مەبەستا سەرەكی یە یا گوتنان ، ئەوژی هەر وەكی [الكسندر كراب] بو دچیت (فێركرنو طابعێ سینجی یە ژ لایێ بابەتی ڤە ، وە كورتكرن ژ لایێ شێوەی ڤە) .

گوتنێن د شعرا [ئەحمەد]دا هاتین ، زوربەی وان ، هەكە نە بێژین هەمی ، تنێ د هوزانەكێ دا ددیارن . ئەوا سەیدایێ

دلوڤان [سعيد دێرەشی] ناڤێ وێ کریە [بيت النعمە] یا کو ژ [304] مالکا پێك هاتی . نهو ژی دێ ل ناڤ وەرزێ شعرا نالبەندی گەرێن . دا سەحکەینێ گۆتن‌و مەتەلوکێن وی بگەلوازێ بیتانوکێن هوزانا خوە ڤە کرین‌و شرین‌و ب ڕەوش ئێخستین .

**1 ئەی هەڤالین وە هەما پڕ هەنە کچ**
**ئێك هەوە بو مە نە کر سککە گڤاش**

**ئەز ب ئەزمانی برنج‌و گەنم**
**ل نك هەوە ئەز شیڤەکم نیسکم‌و ماش**

گۆتنا پێشیان یا لڤێری ئانی دبێژیت :
**[یان نانێ تە گەنم ، یان زارێ تە گەنم]**

**2 نالبەند دبێژیت :**

| | |
|---|---|
| **شولێ ئەڤرو بو سبەهـ** | **بێ عەقلیە تو پێلی** |
| **دا تە نە هێت ژ خو گونەهـ** | **وەکی ڤەمینی ژ عێلی** |

**گۆتنا لڤێرێ ب کار ئینای دبێژیت :**
[خوەرنا ئێشەڤ بهێلە سبەهی لێ شخولێ ئێشەڤ مە هێلە سبەهی]

**3 دیسان أحمد موخلص گۆتی‌یە :**

| | |
|---|---|
| **کوڕێ گوهـ نە دەت بابێ** | **هێژ بچوك بترسینە** |
| **ژێ نە کەن چو حیسابێ** | **چ مەنفیعەت تێ نینە** |
| **دائم لێ بکەن عیتابێ** | **شڤێ ژ تەڕی ب چەمینە** |

گۆتنا دیار د ڤان مالکان دا :
**[شڤك ب تەڕی د چەمیێت]**

**4 ل ئەردەکێ دی هوزانڤانێ پەیڤ شرین دبێژیت :**

| | |
|---|---|
| **ئەزمانێ ب خوڤە ریتی** | **وی ببرە بگویزانێ** |
| **کوڕێ ماستی نیڤشکە** | **بەلێ پاشی تەعلیمێ** |
| **شێر هەرێ تبعەت هشکە** | **وەلەو خوشکەت نەعیمێ** |
| **همبان دڕین هەر مشکە** | **بلا ب خوینیت حامیمێ** |

دسێ مالکا ژڤان دا گۆتن هاتینە د دیارن . گۆتن هولێ دبێژن [یێ هەی ب قوینێ ب خوڤە دریت ، ئو یێ هەی ب ئەزمانی دریتە ب خو ڤە] (کوڕێ ماستی نیڤشکە) هەر وسا کورد دبێژن :

[دەو برایێ ماستی یە] .
(همبان دڕین هەر مشکە) مەبەست ژی ئەڤ گۆتنەیە :
[بێت ژ مشکا دبن د همبان دڕن]

**5 دیسان موخلص گۆتی‌یە :**

| | |
|---|---|
| **مەزن وەکی ژخەبەر کەت** | **عامی دڤێت پی ل وی نەنن** |
| **شێرێ نەساخ بێ صحەت** | **رویڤی چاوا پێ بکەنن** |

گوتنێت مەزنا دڤان هەردوو مالکا ژی دا د دیارن :
مەزنا گۆتیە : [هەکە مەزن ب بیتە کەر ڤی‌یا بی‌یا لێ نەهژینی] د یا دووێ دا نێزیکی ڤێ گۆتنێ تێت :

[هەکە گورك پیر بو ، دبیتە بێ ترانکی سا]

**6 هەر وسان نالبەند د هەلبەستا خوەدا دبێژیت :**

| | |
|---|---|
| **تو رویڤیەکێ ملەتی** | **نە دە ب شێرێ بیانی** |
| **هەما تو بن ڕێ کەتی** | **دێ لتە خوت گوشتێ رانی** |
| **دەرمانی ڤی عیلەتی** | **لازم تو ب خو بزانی** |

لڤێرێ نالبەندی سوود ژڤێ گۆتنا پێشیا وەرگرتییە :
[مروڤێ بیانی هزار سالا بدێ گوشتێ رانی ، دویماهیێ دێ ل سەر کەی پەشێمانی]

7 ل ئەردەکێ دن دبێژیت :

کەسێ هەڤالێ قرێ     نکلێ وی هەر بگییە
ڤێت ژێ بکەن پێ برێ     ئەز چ بێژم قەومییە
بازارێ کەفت جرجرێ     عاقیبەت نەی صاڤیە

گۆتنا لڤێرێ سەرێ خو بلند دکەت :
[هەڤالێ قرێ یێ نکل ب گوییە]

8 ل جهەکی دی گوتییە :

معاملا ئەوەلی     خوشرە ژ شەرێ پاشی
دونیائێ پاڤێژە ژ دلی     دا وەرگری مەعاشی

گۆتنا مفا لڤێری ژی هاتیە وەرگرتن تێت :
[شەرێ ل شوڤێ نە قەرقەشا ل بێدەرێ]

9 ل درەك دی ژ هوزانا خو دبێژیت :

وەسا دمرنێ ب گەهن     وەکی کەرێ بەقالا
بوچی هوین ژێ بستەهن     یا ل دەرێ هەمی مالا
دیارە هوین ئەبلەهن     کی هەی ژ مرنێ ڤالا

گۆتنا مەزنا ل ڤر هولێ تێت :
[مرن کەرێ بەقالایە ، لبەر دەرێ هەمی مالایە]
ئەڤەبون چەند گۆتنەکێن مەزنا ، د هەلبەستا [بیت النعمە]دا . پەژن رامان ژێ د ئاشکرانە ژ لەوما مە ، باسێ ڤێ چەندێ نەکر هەر چەندە ژبل گۆتنان یا مشتە ژ ئاقلدارییو حیکەما .

ژیدەر :


1 ـ مشتاخا چیا : ملا محمود دیرشەوی : بغداد / 1980
2 ـ قەفتەك ژ هۆزانێت نالبەندی/ سعید دیرەشی
3 ـ کۆمەڵێ تێکستی فۆلکلۆری کوردی ـ کوردوییف ـ بغداد 1976


# سەلیقەی شیعری لە «چەپکێ گوڵ و خونچە»ی «عەلی عارف ئاغا»دا..

● محەمەد عەزیز مەلا ڕەحیم ●

ئەوەی ئەمەوێ لە ناوەرۆکی ئەم باسەدا دەری بخەم ، ئەوەیە کە تائێستا لە دوو توێی لێکۆڵینەوەیەکدا دەربارەی [عەلی عارف ئاغا]و دیوانە خنجیلانەکەی هیچ جۆرە بابەتێك نەخراوەتە ڕوو کە شایانی لەیاد نەکردنو فەرامۆش نەکردنی بووبێو نەخرێتە گۆشەی کەمتەرخەمیەوە .

بۆیە وەك خولیایەکی ئەدەبی کوردی هاتم چمکێ لە دامانی ئەم پێویستیەم خستە سەر شانی خۆم تا دڵو مێشکی ئەدەب دۆستان بێنمەوە سەر خوو جارێکیتر مژدەی ئەم هەنگاوەیان بە گوێدا بچرپێنم .. بەتایبەت ئەوانەی شیعری کوردییان مەبەستەو ئەیانەوێ گەشە بەناخی خۆیان بدەن بەمۆسیقاو کێشی ئاوازی شیعری کوردی .

ئەگەرچی [عەلی عارف ئاغا] لە کاروانی شیعری نوێی کوردیدا وەك شاعیرێ دەوری خۆی بینیوەو توانیویەتی هەنگاوێکیتر ڕەوڕەوەی شیعری کوردی بەرەو پێشتر بەرێ ، بەلام هەتا ئێستەش سیمای شیعرەکانی شوێن پەنجەی کلاسیکی پێوە دیارە بەتایبەت لە [کێشو سەروا] کە بەزۆری کێشەکان عەروزنو بەدەگمەن برگەیان پێوە دیارە واتا کێشی کوردی ڕەسەن . نوێ کردنەوەی شیعری کوردی لەوەدا بوو کە ئەو شاعیرانەی هەڵگری مەشخەڵی ئەم جۆرە ڕێبا . بوون

هاتن بەشێوەیەکی وردو هێمنانە شیعری کوردی‌یان لەکۆتی کێشی عەرەبی‌و سەروای دووبارەوە بوو رزگار کرد ، ئەمە جگە لەوەی کەتۆوی بیری نوێیان لەکێڵگەی شیعری نوێ‌ی کوردی‌دا چاند .

بەلام نابێت ئەوەش لەیاد بکەین کە سیمای شیعر بەهیچ چەشنێ لە نرخی ناوەرۆکی دەقە شیعر کەم ناکاتەوەو نابێت بە بەربەست لە رێ‌ی‌دا . ئەگەرچی سیماو ناوەرۆک جێگەیەکی دیاری کراوو ئاستێکی تایبەتیان هەیە لە هەڵبژاردنی شیعرو تاوو توێ کردنی بەتایبەت ئەگەر ووشە سازی تیا بکرێ‌و خاوەن بەرهەم بە ناوەرۆکێکی باش مەبەستێکی جوان دیاری بکات .

بێ‌گومان هیچ بەهەڵەدا ناڕۆم ئەگەر بڵێم سەرەتای دەست پێ‌کردنی شیعری [عەلی عارف ئاغا] پلەو ئاستێکی جیاوازی هەبێ بەبەراورد کردنیان لەگەڵ شیعرە نوێ‌کانی‌دا واتا ئەو شیعرانەی تەمەنی دانانیان نوێ‌یە .

کە ئەمەش لە ئەنجامی شارەزا بوونی شاعیرە لە تاقی‌کردنەوەکانی رۆژانەو خۆ نزیك خستنەوەی لەکیشە سەرەکی یەکانی ژیان . هونەرمەندانە لە شیعرەکانیا بەڵگەی راستی تەواوی ئەم قسانەی پێوە دیارە .

[چەپکێ گوڵو خونچە] خۆی لە خۆی‌دا چەپکێ تیشکی زانستیانەیە کە بە دیمەنێکی ئاشکرا گورزەیەك لەتیشکی خۆری راستی ئەدا بەدەستەوەو ماموستایانە بلیمەتی خۆی دەست نیشان ئەکا لەووتنەوەی وانەکانی ژیانا ، بۆ ئەوەی مرۆڤ بەشێوەیەکی رەوا دەستەو یەخەی کێشە نالەبارەکانی کۆمەڵ بێت .

ئەمەو چەندەها نموونەی تر کەتەواو دەرخەری لایەنە راستگۆیی‌یەکەی شاعیرن ، هۆشمەندانە توانیویانە لەئاسۆی ژیری‌یەوە رێچکە مرۆڤایەتیەکەی شاعیر دەست نیشان بکەن‌و وەك لاوچاکێ قوڵی ئازادی خواهانەی لێ‌هەڵاێ ، سرودی دەنگی نوێ بۆ پاشەرۆژێکی سازتر بەگوێ‌ی مرۆڤی کۆمەڵەکەیا بچرپێنێ :

**ئەوەی پێچو پەنای زۆرە شەقامی راستی لاچەوتە**
**ئەبێتە کۆسپی رێبواران کەوا بڕوا بە رێبازا**
**ئەوەی هەوڵێك نەدا ئەمرۆ سبەینێ برسیەو رووتە**
**سەری زۆر بەرزە تێکۆشەر ئەژی زۆر چاپوکو ئازا**

لەبابەتێکی تری غەزەلی‌دا ئەگەرچی وەك دڵداری‌ی لەزامە سەختو قوڵەکانی دەروونی خۆی ئەدوێ ، بەلام وەستایانە توانیویەتی سەربەستی دەربڕینی خۆی شان بەشانی لێکدانەوەو هەستو نەستی دەرببڕێ . کە ئەمەش دەنگدانەوەو رەنگدانەوەی ئەو کاتانەیە کە لەساماڵێکی فرمێسکاویەوە خۆشکەری بڵێسەی خەم‌و ژانەکانی بەدی ئەکات‌و ئەیەوێ وەك مرۆڤێکی کارامە بەگیانێکی پەروەردە کراوی شاعیرانەوە زەبری ناڵەی ناخی‌و خامۆشی دەوروو پشت تێکەڵ بە هەوێنی جۆشدان‌و بزوێنەری رەسەنی مرۆڤانە بکات ... هەربەم سەلیقەی زمان‌و پاراوی شیعری‌یەوە ئەوەندەی‌تر مەزنی دەدات بەخۆیی‌و وەك شاعیرێکی سەردەم نووکی قەڵەمی ئاراستەی دەردە زگمایەکانی کۆمەڵ ئەکاو پەل بۆ نۆبەرەیەکی تری کۆمەڵ ئەهاوێ :

**دەردو غەم زۆرە وەڵێ چارەو دەوا دەست ناکەوێ**
**هەورو تەم زۆرە کەپێ‌ی لاچێ هەوا دەست ناکەوێ**

هەر لەسەرەتای ئەم شیعرەدا وەك گەرێدەیەك شاعیر جیهانی رازو نیازی خۆی ئەپشکنێ بۆ چارەسەرکردنی یەکێ لەژانە خەستەکانی کۆمەڵەکەیی‌و ئەیەوێ پەنجەی ئاشکرا بوون رابکێشێ بۆ هەندێ لەئازارە نهێنی‌یەکانی جیهانی ئەمرۆ بەگشتی‌و کۆمەڵەکەی بەتایبەتی .. ئەگەرچی ئەم راپەڕینە شیعری‌یانە ، ئۆبالی گۆڕین‌و داهێنانێکی گەورەی وا بەئەستۆوەو ئەوەندەی تر ئاوو هەوا ساز دەکات بۆ بەرەو پێشەوە چوون‌و سەر دەرکردنی هەوێنی بزوتن‌و دانەکەوتن .. کەئەمەش سەرگەرمی‌و بێ سڵەمینەوەیە بۆ هەڵستی‌و دان بەخۆدا گرتن لەهێرشی نارەواو گوژمی ماڵ وێران کردن .

بەهاوارێکی پڕ لە سۆزو هۆشیارانەی جەوهەردارانەوە ئەیەوێ لایەنی پێشکەوتن خوازی‌و چێژ لەرێبازی راستەقینەی خۆی ئاشکرا بکات ، بۆیە بەگیانێکی سفت‌و سۆییەوە تەواو لەلایەن‌و بارە راستی‌یەکانی ژیان ئەڕوانێ‌و ئەیەوێ پەردەی روناکی ئاشکرا بوون لەرووی شەوە زەنگی بەرژەوەند پەرستانا هەڵماڵێ‌و بەرەنگی شێوازو دارشتنی نوێ خوازانە شیعرەکەی دابرێژێ :

**نالەبارو ناحەزان خۆیان ئەدەن بۆ شەڕ حەشار**
**داخە بۆ دڵیان هەڵیکی نارەوا دەست ناکەوێ**

بەم پێیە [عەلی عارف ئاغا] وەك شاعیرێكی داد پەروەرانەی ڕیالیزم ئەوەی دەیبینێ لە زوڵم و زۆری كۆمەلایەتی و كارەساتی نارەوای كۆمەڵەكەی لەئاكامی گرد بوونەوەو چوونە ناو گۆشەی جیاجیاكانی ژیان ، وەك ڕەخنە گرێ بەرگری لە لایەنە دروستەكانی میللەتەكەی ئەكات و ئەیەوێ كارێكی نرخاندنیش بۆ كەسە نادروستەكانی بسازێنێ . بۆیە وەك بلیمەتێكی كۆمەلایەتی پێش بینیو پێشنیاری خۆی ئاراستە ئەكات و ئەیەوێ هەموو كەسێ لەئاستی هاو نیشتمانیەكی پەسەندا ببینێ ..

جا ئەگەرچی ئەم پەیوەندی یە دەروونی یانە لەشێوازی شیعری كوردی دا زۆرن بەتایبەت [ڕیالیزم] ئەویش لەوەدا كە شاعیر ئەیەوێ وەك ڕۆشنبیرێكی پێشەوا هێلی سپی لەهێلی ڕەش جیا بكاتەوەو پاشەڕۆژی هەریەك لە بۆچوون و ئاراستەی ئەم هێلانە دەست نیشان بكات .. كەئەمیش زیاتر لەبارە دەروونی یەكەوە سەر هەڵئەداو دەبێتە پێشەنگ بۆ ئەوانەی هەلگری دروشمی ڕاستین :

**پیاوی خائن ، وولات فرۆش بۆ زێڕو زیو**
**لە تەویلەی پیسی مێژوو ئەتلێتەوە**
**ناویش مەگەر بۆ هەموو كەس باقی نابێ**
**بەدخوو ناكەس بازیندوش بن ئەتوێتەوە**

ئەم تێبینی و سەرنجە وردانە كەرەسەیەكی شیعریی بەپێزن وەك باس :

كەزمانێكی فۆتۆگرافی ڕاستن و لەكەلێنێكی ڕاستگۆیانەوە نەخشە دەكێشن بۆ قووڵ بوونەوەی هیواو شۆڕ بوونەوەی مرۆڤ بەناخی ژیانا .. وەك بابەتیش .. فەلسەفەیەكی ڕاستی ژیانەو لەبیرێكی ڕیالیستەوە هەنگاو دەنێ بەرەو دنیای پێشكەوتن و جیهانی پێشكەوتن خوازی .. كەئەمەش دیارە هونەرمەندانە لەئەنجامی تاقی كردنەوەو بەراورد كردنی فەلسەفیانەوە سەر هەڵدەدا لەدەروونی شاعیردا ئەویش بەچێژ وەرگرتن لەئازارو ئاسۆری چەوساوانەو بە پیرەوە چوونی شاعیر بەرەو ڕێبازی ڕیالیزم .

ئەمیش ئەوەندەی تر هەوێنی وێنە گرتنێكی زیندوو لەناخی شاعیردا دەگرێتەوەو بەدەربڕینێكی قووڵی دەروونی ئەوگرێ ئاڵۆزانە دەكاتەوە كەوەك باوو بوویەكی سەردەم و نەریتێكی كۆن هەندێ كەس لەژێر گەرد بینا ناز ناوی خۆی پێ دەبینێ .. كە خۆی لەڕاستیدا سیمایەكی ساكارو نیشانێكی سادەیە هیچ پێویست بەوە ناكات كە مرۆڤ زیرەكی و سوود بەخشی خۆی پێ نیشان بدات بەرامبەر بە كۆمەل .. ڕاستە كەباری ناكۆكی و جیا وازی چینایەتی جامی سەرڕێژ نابێ بەم جۆرە شێوازە بەلام ئەمیش سەرەتای خۆ ڕۆشنبیر كردنێكەو مژدەی داهاتوویەكی ڕووناكی تیا بەدی ئەكرێ :

**پێم ئەڵێن ئاغا ئەوەك فیزی درۆ پەیدا بكەم**
**بۆ بلندی ئاسمان هەر گەردن و سەر هەڵبڕم**
**پێم ئەڵێن بۆ پارە تۆ بەرگی كەرامەت پارەكە**
**بەرگی ئازادی مەحالە من لەبەرما دادڕم**
**پێم ئەڵێن بۆ ماڵی میر ئامادەبە بۆ نان وخوان**
**ئاوی ڕووی خۆم من بەپەنجەی پیسی زیللەت ناسڕم**

لەڕێگای بەكارهێنانی ناوەرۆكی نوێی شیعریی و دارشتنی ووشەی ناسكی شیعری یەوە ، ئەتوانین بڵێین [عەلی عارف ئاغا] شاعیرێكی پێگەیشتووی ئەم كۆمەڵەی ئێستامانەو توانیویەتی وەك پزیشكێكی دەروونی بخەملێ لەگەل ئازارو ژانی كۆمەڵدا ، هەروەها دەست نیشانی چارە سەركردنیشی دەكات .. ئەویش بە ئاوێتە كردنی گیانی خۆی وەك خاوەن هەستێ بە ئەندێشەو خواستی گەلەكەی بۆ مەبەستێكی پیرۆز كە بناغەی بەختیاری كۆمەڵەكەیەتی .

جا ئەگەر لێرەدا نەمتوانی بێ بە باسێكی پووخت لە شیعرەكانی تری بەشێوەیەكی گشتی بدوێم بەتایبەت شیعرە غەزەلەكانی .. ئەوە مەودای باسەكەم ئەو جۆرە شیكردنەوەیەی نەگرتە خۆی . بەتەمام لەدەرفەتێكی تری بواری لێكۆڵینەوەمدا بەباسێكی دوورو درێژ ئەم بۆشایی یە پڕ بكەمەوەو وەك دیاری یەكی ئەدەبی پێشكەش بە خوێنەرانی ئازیزی بكەم .

**تێبینی :**

- **[چەپكێ گوڵو خونچە] : ناوی دیوانەكەی (عەلی عارف ئاغا] یە نەك مەبەستم لە شیعرە بەناو بانگەكەی**
  **گوڵو خونچەی بەهارانیش لەتۆ نەشمیلەتر نابێ**
  **نەمامی عەرعەری كۆرپەش لەتۆ خنجیلەتر نابێ**
- **شایانی باسە كە [فەرەیدوون عەلی ئەمین] یش لە ژمارەیەكی گۆڤاری بەیاندا باسێكی لەسەر (علی عارف ئاغا) و شیعرەكانی بلاو كردوتەوە .**

# خالبەندی

## دگۆڤارا ڕۆژی کوردا 1913

حجی جعفر

دهوك

دوو مەبەست د بلاڤەکرنا ڤێ گۆتارێدا هەنە : یەك ، سەرەنج راکێشانا زمانەوانێن کورد بۆ ڤی بابەتی ، چونکی هەتا نهۆ ماڤێ ڤێ گۆڤارێ خاری‌یە ژ لایێ زمانەوانێن کوردڤە ، کەسێ خوە ماندی نەکریە ب رێنڤیسا وێڤە (وێنەی دەنگەکان ، نووسینی وشەکان ، خالبەندی) لێ هەکە جار جار ناڤێ وێ ژی هاتبیت ، بێ بها هاتیە !! مەبەستا دوویێ د بلاڤەکرنا ڤێ گۆتارێدا ئەوە خالبەندێن دڤێ گۆڤارێدا هاتین د چ گۆڤارێن کوردیدا نە هاتیە ، د گەل هەندێ کو یەکەمین گۆڤارا کوردی‌یە ل هەمی کوردستانێ ... لەوما من پێتڤی زانی خالبەندێن ڤێ گۆڤارا قەشەنگ [ڕۆژی‌کورد] ب خوێندەڤانێ کورد بدەم نیاسین ئۆ ئەز ل سەر وێ باوەرێمە کو هەتا نەڤرۆکە چ گۆڤارێن کوردی وەکو (ڕۆژی کورد) ب رێك و پێکی خالبەندی نەنڤیسیە ... خالبەندێن د ڤێ گۆڤارێدا هاتین ئەڤەنە :

1 ـ خال (.)
2 ـ دوو خال (:)
3 ـ بۆر (،)
4 ـ بۆر و خال (؛)
5 ـ نیشانەی پرس (؟)
6 ـ نیشانەی سەرسورمان (!)
7 ـ جووتە کەڤانێ بچیك « »
8 ـ جووتە کەڤانێ مەزن ( )
9 ـ هێل یا تەقەل ( ـ )
10 ـ چەند خالێك (.....)
11 ـ جووتە کەڤانێ [ ] العضادتان
12 ـ نیشانا پەراوێزا و (هامش) [ × ] ، [١]

«خالبەندی» واتا دانانا (علامات الترقیم) دانانا نیشانا تایبەتی‌یە وەکو خال (.) و کۆما (،) لەکاتی نووسیندا . ئەڤ خالبەندی‌یە بۆ مەبەستا هاریکاری و یارمەتی دانا خاندەڤانا بکاردێت ، هەروەسا بۆ مەبەستا دابەش کردنا تێکستا ژلایێ سینتاکس و مەعنێ ڤە بکاردێت ئەڤجا دابێیتە سەر وان خالبەندێن ژووری ێن کو د گۆڤارا ڕۆژی کوردا هاتین ئۆ یەك و یەك پێدا بچین :

1 ـ خال (.) :

لدیماهیا هەمی ڕستەکی‌دا دێت . هەروەسا راوەستانەکێ بۆ خوێندەڤانی دیار دکەت . ئەڤ نیشانە ب زانین ل جهێ خوە یێ تایبەتی د گۆڤارا ڕۆژی کوردا هاتی‌یە ؛ وەك : «ژ ١ ل41 ـ شویش کۆرێ شوانەکی‌یە . بخوە دە سالی‌یە ، زاروکە . بەلێ پر چاڤێ وی گری‌یە .» «ژ 1 ل 40 ـ عەردێ ئێمە پرە . خولێ ئێمە باشە ، ئاوی ئێمە هەیە .»

«ژ 1 ل 41 ـ شویش هەرۆ ئێواری دا سەر ری‌یێ باڤێ خوە دچە . هی‌وی‌یی وی دمینە .»

2 ـ دوو خال (:)

ئەڤ هەر دوو خالە نیشانا شروڤەکرنێ و لێک دانی یە . دیسان ئەڤ نیشانە ب زانین د گوڤارا ڕوژی کوردا هاتیە ، وەك :

«ژ 1 ل 42 ـ شویش :

هەری بافو ئەزم»

خوویایە کو نیشانا دوو خالا لهرە پاش ناڤێ شویش هاتیە .

«ژ 2 ل 77 ـ پاش بخوە بخوە هات . شبڤانرا گو :» لهرە پشتی پەیڤا گو هاتیە ب راست و دروستی . هەندە جاران لدیماهیا وشەیەکی یان باسەکی دێت کە پێتڤی لێکدانێ یە ، وەك :

«ژ 1 ل 40 ـ هون دخبتن : بزوبستان ئو بهادین .» .

3 ـ بور (،) :

ئەڤ کوما نیشانا راوەستانەك سڤکە گەلێك ب جوانی و ڕێك و پێکی جهێ خوە د ناف لاپەرێن گوڤارا ڕوژی کوردا گرتی یە ، وەك :

«شێخ دمە ، ملای دمە ، فەقی دمە ، میرێ دمە .» ژ 3 ل 117 .

لهرە بو مەبەستا جرداکرنا زنجیرەك پەیڤا کە دوو دوو پێکڤە هاتینە ، بکارهاتی یە . «شاعیرێن مەزن وەکە نالی ، حـریق ، کوردی ، ئەحمەدی خانی ، شێخ رەزا ، حاجي قادر» ژ 3 ل 113

لهرە بو مەبەستا جوداکرنا زنجیرەك ناڤا کە یەك بدیف یەکێ ڤە هاتی یە بکارهاتی یە .

«ئیرو ژ وی شەری ، ژ وی حالی ئەم پر خویان بوون» ژ 3 ل 112

لهرە بو پارستنا مەعنی رستێ لدیف گرێ هاتی یە (عقدە) (ئیرو ژویی شەری ،) .

جار جار لدیف گێرانەکا یەك سەر دێت ، وەك :

«.... من دێ وێ ژی ژ قەومێ خوەرە بێژم ، تو قەوم و میللەت لدنێ نینە بشوزو مەرتالی ـ خوە تنێ گەهایین مەقصەدا خوە» ژ 3 ل 112

4 ـ بور و خال (؛) :

هەندی بێژی ئەڤ نیشانە بکارهاتی یە !! . ئەڤ نیشانە بـو مەبەستا راوەستانەك سڤك لێ درێژتر ژ نیشانا (،) بکاردێت ، دیسان ب جوانی جهێ خوە د ناف لاپەرێن گوڤارا ڕوژی کوردا گرتی یە ، نموونە !

«گەلی برا ، بەری حەموو شتی ....» ژ 1 ل 42

«بافو ؛ ئەز گوری تو ....» ژ 1 ل 42

5 ـ نیشانا پرسێ (؟)

هەتا نهو ئەڤ نیشانە ب راستی گەلێك جـارا ل جهێ خوەدا ناهێتە دانان ، لێ د گوڤارا ڕوژی کوردا ل هەر جهەکی پێتڤی بوویە بکار هاتی یە ، نموونە :

«ئەم چی ژوان کار دیکن ؟» ژ 1 ل 40

«بافو تو ئیرو بوچی دیسان درەنگ مایی ؟» ژ 1 ل 42

6 ـ نیشانا سەرسوورمان (!) !

ئـەڤ نیشانـە لدیماهیـا رستەکێدا دێت کـر (تعجب) تێـدا هەبیت ، لێ دیسان دناف لاپەرێن گوڤارا ڕوژی کوردا ب راست و دروستی جهێ خوە گرتی یە ، وەك :

«گەلی برا ! گەلی هەڤالا ! ...» ژ 1 ل 41

7 ـ جووتە کەڤانێ بچیك « » :

ئـەڤ نیشانـە وان پـەیڤـێن جهێ سـەرەنـج راکێشـانێ بن (استغراب) د کەتە دناف خوەدا . هەر بڤێ مەبەستا ژووری گوڤارا ڕوژی کورد ئەڤ نیشانا ژووری بکار هینایە ، نموونە :

«ئەم کرمانج و فەللە پێشیا مە بهڤرا دچی دگەهی «آثوری یا» .» ژ 1 ل 42 .

«... لناف چیا گەریا شوپا پەزێ خوە دی کو «گورا» خواری یە» ژ 3 ل 119 .

دیسان ئەڤ نیشانە بو مەبـەستا پـارستنا گـوتنا کـەسەکێ بکاردێت بێ زێدە و کێم هەر بو ڤێ مەبەستێ دگـوڤار ڕوژی کوردا هاتیە ، وەك :

رونشت : «میرو پەزێ خوە دیسپریم تە ئو را دێبکەڤم» ژ 3 ل 119 :

گو «من چولی کەری بی خوە سپارت عەدالەتا تە ئەز راکەتم» ژ 3 ل 119 .

8 ـ جووتە کەڤانێ مەزن ( ) !

بو ڤان مەبەستێن خارێ ئەڤ نیشانە د گوڤـارا ڕوژی کوردا هاتیە :

أ ـ پەیڤەکێ د کـەتە دنـاف خوەدا کـو واتایـەکا تـایبەتی هەبیت ، نموونە :

(روژناوە) یا وە بصورەتا (صلاح الدین) ایوبی خەملیە . ژ 2 ل 80

ب ـ رستەکێ د ئێچنیتە دناف خرەدا کە واتەیـەکا تـایبەتی هەبیت ، نموونە :

(ئەم یێك وان قەنج ناس ناکن) ژ 2 ل 81

ج ـ دیسان بو پەیڤەکا بیانی یان ، رستەکا بیانی بکاردێت ،

نموّنه :
(طلب العلم فريضة على كل مسلم و مسلمة)
«شركت ئه‌نواعى هه‌يه مثلاً «فولكتيف) كه - عينا وه‌ك شركه‌تى مفاوضة وايه» ژ 1 ل 37
د - ديسان بوّ نه‌مرا «رقم» بكار هاتى‌يه ، وه‌ك :
«... اسلامى قورتار مشدر (571) ،» ژ 1 ل 70
«... صوكراكىّ (573) حياتى» ژ 1 ل 70 (به‌شى توركى)
9 - هێل يا ته‌قه‌ل ( - ) :
ئه‌ڤ نيشانه بوّ مه‌به‌ستا جوداكرنا دوو كه‌سێن گفتوّگو كه‌ر د گوّڤارا رِوّژى كوردا نه‌هاتيه وه دياره ئه‌وان نـزانى‌يه بـوّ ڤىّ مه‌به‌ستىّ بكاربهينن له‌و هه‌ر ناڤىّ كه‌سان دووباره هاتيه كرن:
وه‌ك :
شويش :
باو :
شويش :
باو :
وه‌لىّ ده‌مىّ جهىّ برگىّ نه‌بيت ئه‌ڤ ( - ) ته‌قه‌له بكارهـاتيه ، نموّنه :
(عالمێن قه‌در مه‌زن وه‌كه شێخ الاسلام أبو السعود» ژ 3 ل 113 .
هه‌روه‌سا بڤى ره‌نگى ژى هاتيه :
«ده‌م كالىّ مه چاغا مه - ده‌مه‌تى» ژ 1 ل 42 .
10 - چه‌ند خالێك (....) :
ئـه‌ڤ نيشانـه بوّ مـه‌به‌ستـا ڤـره‌دا نـا ووشـه‌يـه‌كىّ يـان ، گرىّ‌يه‌كىّ ، رِسته‌كىّ بكارديّت ، بوّ مه‌بـه‌ستا كـورت كرن و دياركرنا ئاخفتنا پێتڤى بتنىّ .
مشه ئه‌ڤ چه‌ند خاله بڤىّ مه‌به‌ستا ژوورى د گوّڤارا (رِوّژى كوردا) دا بكار هاتيه ، نموّنه :
«هه‌سپ و ده‌وارىّ وان ل ويّده‌رىّ گريدايى . بون ...» خلاصه زه‌حف حفارت كربـوون ... قاضىيـه سلطان ، قاضىّ فـاضل ده‌ركـه‌ت منبرىّ خـطبه كـر ... لىّ پر دل شكـه‌ستى مـه‌لول دبێژى ...» ژ 3 ل 113 .
«ئه‌ز بال كىّ بمينم . گرى ...» ژ 1 ل 42
«ئاڤا چاڤىّ وى ژى ڤالا بوو ...» ژ 1 ل 42
11 - جووته كه‌ڤانىّ (العضادتان) [ ] :
د ناڤ لاپه‌رێن (رِوّژى كوردا) دا ئه‌ڤ نيشانه بوّ ڤان مه‌به‌ستێن ژيرى بكار هاتيه :
أ - ناڤه‌كىّ بيانى يان رِسته‌ك بيانى د ئێخيته دناڤ خوه‌دا ، نموّنه :
[وعلم آدم الاسماء ... الخ آيت] ژ 3 ل 112
ب - بوّ مه‌به‌ستا دوو باره‌كرنا ناڤه‌كى بكاربيّت ، نموّنه :
«نهو بڤى جريده‌يى [رِوّژكرد] اكتفا كرنه» ژ 2 ل 76
«ملايىّ جزيرى [شێخ ئه‌حمه‌د] ملايى گوران» ژ 3 ل 113
«برايى منىّ غيره‌ت پـر عيزه‌ت [مـودانى] ل رِوّژا كورد مهـا بورى ...» ژ 3 ل 115
ح - بوّ مه‌به‌ستا ناڤه‌ك گرنگ بێخيته دناڤ خوه‌دا بكارهاتيه ، نموّنه :
«ئه‌ڤه لهيّره خورتێن كرمانجا خوه دان هه‌ڤ و جمعيته‌ك كوردا چێكرن ، ناڤىّ جمعيه‌تى [هى‌وى] دانينه ،»
ژ 2 ل 76
12 - نيشانا هامش و په‌راويّزا [ × ] :
ئه‌ڤ نيشانه كه‌لێك جاران دووباره بوّيه بوّ مه‌به‌ستا روون كردنا په‌يڤه‌كىّ يان ، رِسته‌يه‌كىّ ، نموّنه :
«به‌رىّ مه‌زن بو [ × ] هه‌موو حكومتاوى ...» ژ 1 ل 42
«گه‌ر دىّ هه‌بويا مه ژى خودانه‌ك [ × ]» ئه‌ڤ نيشانه ژى [1] هاتيه هه‌ر بوّ مه‌به‌ستا ژوورى . ژ 2 ل 95 .
نهوّ بوّ خوێنده‌ڤانان خويا بوو كو گوّڤارا رِوّژى كـورد چه‌نـد ده‌وله‌مه‌نده ژ ڤى بابه‌تى ڤـه ، لىّ هه‌كـه خوێنـده‌ڤانىّ هێـژا گه‌ريانه‌كىّ د ناڤ لاپه‌رێن ڤىّ گوڤارىّ‌دا بكه‌ت دىّ بوّ پتر و رونتر لىّ ى هێت .
ئه‌ڤ بابه‌تىّ ژوورى ...

## ژيّده‌ر و په‌راويّز

1 - رِوّژى كورد ، 1913ز ، بلاوكردنه‌وه و پێشه‌كى و له سه‌ر نووسين جه‌مال خه‌زنه‌دار ، به‌غدا ، 1981 .
2 - گوّڤارى كوّرى زانيارى عيراق «ده‌سته‌ى كـورد» به‌رگى ده‌هه‌م 1983

3 - ژ : بوّ ژماره بكارهاتيه
4 - ل : بوّ لاپه‌ره بكارهاتيه

# فۆنۆلۆجی

د. وریا عمر امین
سەرۆکی بەشی کوردی
زانستگای بەغدا

فۆنەتیك ئەو لقەی زانستی زمانە کە لە دەنگەکانی زمان ئەکۆڵێتەوە .

دەنگەکانی زمان ئەشێ لە سێ رووەوە سەیریان بکرێو لێیان بکۆڵرێتەوە :

1 ـ لەرووی درووست کردنەوە .. ئەمە میکانیزیمیەتی ئەندامانی ئاخاوتن ئەگرێتەوە .

2 ـ لە رووی گواستنەوەی دەنگەکان لە هەوادا بە هۆی ئەو شەپۆلانەی بە رەوتی بای لە سی‌یەکانەوە هاتوو و جوولانەوەی بەشەکانی زار دروست ئەکرێن .

3 ـ لە رووی وەرگرتنی ئەم دەنگانەوە بە گوێو شی کردنەوەیان لەمێشکا . ئەمەیان میکانیزیمیەتو فسیۆلۆجی‌یەتی گوێو مێشك ئەگرێتەوە .

بەم جۆرە فۆنەتیك بوتە سێ لقی سەربەخۆ . هەر یەکە پەیرەو و ئامانجی‌ی تایبەتی‌ی خۆی هەیە .

لە بەر هەندێ هۆ کە پەیوەندی‌ی بە سروشتو ئامانجی زانستی زمانەوە هەیە ، بەشێوەیەکی گشتی بایەخ زیاتر بە لقی یەکەم دراوە . دوو لقەکەی تر تازە داهاتوون و پەیوەندی‌یان زۆرتر بە مەیدانەکانی تری زانستەوەی وەك فیزیاو کومپیووتەر .. هتد هەیە .

ئەم ووتارە هەوڵدانێکە بۆ پێناسینی فۆنەتیك و دەرخستنی پەیوەندی نێوان فۆنەتیك و فۆنۆلوجی .

فۆنەتیك لە کەرەسە (مادی)یە هەرە خاوەکانی زمان ئەکۆڵێتەوە کە ئەو تاکە دەنگانەن بە هۆی ئەندامانی ئاخاوتنەوە دروست ئەکرێن لە ئەنجامی کۆمەڵە جوولانەوەیێك لە پەردەی ناوپنچکەوە دەست پێ ئەکاو سی‌یەکان و بۆری هەناسەو قورگ و بەشەکانی زارو لووت هەموو تیایا بەشداری ئەکەن .

تایبەتی‌یەتی هەر دەنگێك و هەڵوێستی ئەندامانی ئاخاوتن لەکاتی دروست کردنی‌یا دەست نیشان ئەکات .

فۆنەتیك روونی ئەکاتەوە ـ بۆ نموونە ـ دەنگی (ب) و (ك) ... هتد چۆن دروست ئەکرێن و چین ئەو رووداوانەی ئەندامانی ئاخاوتن کە وا ئەکەن ئەم دەنگانە دروست بکرێن . چی‌یە (ب) لە (پ) جیا ئەکاتەوە ؟ .. هتد

فۆنەتیك تەنیا لەو دەنگانە ناکۆڵێتەوە کە لە نووسینا بە تیپ دەنەبرێن . بەڵکوو لەو کەرەسە زمانی‌یانەش ئەکۆڵێتەوە کە زۆر گرنگن لەزمانا بەڵام لەنووسینا هیچ نیشانەیەکیان بۆ دانەنراوە وەك هێز stress ، ئاواز Intonation تۆن Tone و Pitch ... هتد .. سروشت و چۆنیەتی دروست کردنی ئەم کەرەسانە دەست‌نیشان ئەکات .

فۆنەتیك لەمانە هەموو ئەکۆڵێتەوە بێ ئەوەی بایەخ بەوە بدا ئەم دەنگانە سەر بە چ زمانێکن . واتا ـ فۆنەتیك شتێکی گشتی‌یە .

ئەو یاسایانەی فۆنیمەکانی زمان دەست نیشان ئەکەن و لەناو قاڵبی برگەی فۆنەتیکی لێکیان ئەدەن بۆ پێك هێنانی برگەی فۆنۆلۆجی و هۆی پەیا بوون یا توانەوەی هەندێ دەنگ لە هەندێ حاڵەتا پێشان ئەدا ، ئەمانە هەموو بەیاسا فۆنۆلۆجی‌یەکان ناو ئەبرێن .

هەر زمانەی کۆمەڵە یاسایەکی فۆنۆلۆجی‌ی تایبەتی بەخۆی‌یەوە هەیە .

1 ـ فۆنیمەکانی دەست نیشان ئەکات

2 ـ لەناو قاڵبی برگەی فۆنەتیکیدا ئەم فونیمانە لەیەك ئەدا بۆ پێك هێنانی برگەی فۆنۆلوجی .

3 ـ لەئەنجامی لەیەکدانی ئەم فۆنیمانە لە هەندێ حاڵەتا ـ هەندێ دەنگ پەیا ئەبێ یا ئەتوێتەوە .

واتا فۆنۆلۆجی شتێکی تایبەتی‌یە .

بـۆ روون کردنـەوەی جیاوازی‌ی نێـوان فـۆنـەتیـك‌و فۆنۆلۆجی . ئەم بەراووردی‌یە ئەخەینە روو .

زمانی کوردی‌و عەرەبی[1] لەم شەش دەنگانەدا هاوبەشن [ر - ڕ - س - ص - ل - ڵ] وەك لەم نموونانەدا دەرئەکەوێ :

| کوردی | دەنگ | عەرەبی |
|---|---|---|
| پەری | ر | برد |
| ڕەنگ | ڕ | حر |
| سەوز | س | سماء |
| صەگ | ص | صباح |
| لانك | ل | ليل |
| گوڵ | ڵ | نضاڵ |

ئەوەی سەرنج رائەکێشێ ئەوەیە لەسیستەمی نووسینی زمـانی کوردی‌یـا (ر) و (ڕ) جیا کـراونەتـەوە کـەچی لە هی عەرەبی‌یا جیا نەکراونەتەوەو بۆ هەردووك یەك نیشانە تەرخان کراوە .

هۆی جیا کردنەوەیان لە زمانی کوردی‌یا ئەوەیە ئەم دوو دەنگە لەم زمانەدا دوو شتی جیان و دوو نرخی جیاوازیان هەیە چونکە ئەتوانن لە هەمان بیئەدا دەرکەون‌و کار لە مانا بکەن . وەك لەم نموونانەدا دەرئەکەوێ

| | |
|---|---|
| برین | بڕین |
| کەر | کەڕ |
| وەرین | وەڕین |
| پەری | پەڕی .. هتد |

واتا پەیوەندی‌ی نێوان (ر) و (ڕ) وەك پەیوەندی‌ی نێوان (س) و (ف) وایە :

| | | |
|---|---|---|
| کە | س | کەس |
| | ر | کەر |

| | | |
|---|---|---|
| کە | ف | کەف |
| | ڕ | کەڕ |

لە نووسینی عەرەبی‌یا بۆ ئەم دوو دەنگە جیاوازە (ر - ڕ) یەك نیشانە تەرخـان کراوە . چـونکە بـە دووان یەك نـرخی تیاپێشان ئەدەن . هیچ ووشەیێ لەم زمانەدا نادۆزرێتەوە ئەم دوو دەنگەی تیا ئاڵ‌و گۆڕ بکرێ مانا بگۆڕێ . ئەو جیاوازی‌یەی لەنێوانیایا هەیە ئەنجامی کار تێ‌کردنی ئەو بیئە جیاوازانەیە کە تیایا دەرئەکەون . بەم جۆرە (ر) و (ڕ) لەزمانی عەرەبی‌یا دوو شێوەی جیای هەمان فۆنیمن‌و لەزمانی کوردی‌یا دوو فۆنیمی سەر بەخۆن .

| فۆنیم | کوردی | دەنگ | عەرەبی | فۆنیم |
|---|---|---|---|---|
| /ر/ | پەری | [ر] | برد | /ر/ |
| /ڕ/ | پەڕی | [ڕ] | حر | |

// نیشانەیە بۆ فۆنیم

[] نیشانەیە بۆ دەنگ

بە پێچەوانەوە .. دەنگی (س) و (ص) لە زمانی کوردی‌یا دوو شێوەی جیاوازی هەمان فۆنیمن . جیاوازی‌ی نێـوانیان ئەنجامی ئەو بیئە جیاوازانەیە کە تیایا دەرئەکەون . چـونکە هیچ ووشەیێك لە زمانی کوردی‌یا نـادۆزرێتەوە بـەئاڵ‌و گـۆڕ کردنی ئەم دوو دەنگەی تیا کار لەمانا بکات . کەچی لەزمانی عەرەبی‌یا ئەتوانن لەهـەمان بیئـەدا دەرکەون‌و کـار لەمانـا بکەن . وەك لەم نموونانەدا دەرئەکەوێ .

| | |
|---|---|
| سلب | صلب |
| عسير | عصير |
| سار | صار |
| مس | مص |
| سهر | صهر ... هتد |

بەم جۆرە ئەم دوو دەنگە لەزمانی عەرەبی‌یا دوو فۆنیم‌و لە زمانی کوردی‌یا یەك فۆنیم پێك ئەهێنین .

| فۆنیم | کوردی | دەنگ | عەرەبی | فۆنیم |
|---|---|---|---|---|
| /س/ | سەوز | [س] | سار | /س/ |
| | صەگ | [ص] | صار | /ص/ |

بە هەمان پەیرەو (ل) و (ڵ) لە زمانی عەرەبی‌یا دوو شێوەی جیای هەمان فۆنیمن‌و لە زمانی کوردی‌یا دوو فۆنیمن ، چونکە ئەتوانن لە هەمان بیئەدا دەرکەون‌و کار لەمانا بکەن .

چل — چڵ
گەل — گەڵ
پەلە — پەڵە
گول — گوڵ .... هتد

| فۆنیم | کوردی | دەنگ | عەرەبی | فۆنیم |
|---|---|---|---|---|
| /ل/ | چل | [ل] | امل | /ل/ |
| /ڵ/ | چڵ | [ڵ] | ظلم | |

بە بەراوورد کردنی زمانی کوردی‌و عەرەبی لەم شەش دەنگانەدا لە لێڤڵی فۆنەتیکی‌و فۆنۆلۆجی ئەم ئەنجامانەمان دەس ئەکەوێ .

| فۆنۆلۆجی فۆنیم | کوردی | فۆنەتیك دەنگ | عەرەبی | فۆنۆلۆجی فۆنیم |
|---|---|---|---|---|
| /ر/ | پەری | [ر] | برد | ر |
| /ڕ/ | پەڕی | [ڕ] | حر | س |
| /س/ | سەوز | [س] | سار | ص |
| /ل/ | صەگ | [ص] | صار | |
| /ڵ/ | چل | [ل] | امل | |
| — | چڵ | [ڵ] | ظلم | /ل/ |
| 5 | | 6 | | 4 |

واتا ئەم شەش دەنگە هاوبەشە .. لە لێڤڵی فۆنەتیکیدا (پێنج) فۆنیم لەزمانی کوردی‌یاو (چوار فۆنیم لەزمانی عەرەبی‌یا پێك ئەهێنن لە لێڤڵی فۆنۆلۆجیدا .

لەژێر تیشکی ئەوەی باسکرا .. پێناسینی فۆنیم‌و پەیوەندی‌ی بە دەنگ‌و تیپەوە بەم جۆرە دەست نیشان ئەکرێ[2] .

[کۆمەڵە دەنگێکی جیاواز گەر لە ناو سیستەمی زمانێکا یەك نرخ پێشان بدەن ، ئەم دەنگانە هەموو لەم زمانەدا یەك فۆنیم پێك ئەهێنن . بۆ هەر فۆنیمەی ، بۆ مەبەستی نووسین ، نیشانەیێ دائەنرێ بە تیپ لەقەڵەم ئەدرێ . واتا تیپ دەنگ نانوێنێ بەڵکو فۆنیم ئەنوێنێ فۆنیمیش لەوانەیە کۆمەڵە دەنگێ بنوێنێ . ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ کە فۆنیم شتێکی (مجرد)ە .]

پەیوەندی‌ی نێوان دەنگ‌و فۆنیم‌و تیپ لەم وێنەیەدا روون کراوەتەوە .




وەك فۆنیمی /س/ لە زمانی کوردی‌یا




وەك لەسەرەوە باس کرا .. فۆنۆلۆجی (بەلای‌کەمی) سێ جۆر یاسا ئەنوێنێ . یەکەم ئەوە بوو باس‌کرا کە بە هۆیەوە فۆنیمەکانی زمان دەس نیشان ئەکرێن .

جۆری دووەمی یاسا فۆنۆلۆجی‌یەکان ئەوانەن کە لە ناو قاڵبی فونەتیکیدا فۆنیمەکان لە یەك ئەدەن بۆ دروست کردنی

برگەی فۆنۆلۆجی .

تا ئیستا زانستی زمان بە هەموو قوتابخـانەکـانی‌یەوە نەیتوانیوە پێناسینێکی بێ کەلەبەری برگە پێشکەش بکات . بەشێوەیەکی گشتی دوو جۆری لێ جیا کردوتەوە .

یەکەم - برگەی فۆنەتیکی - ئەم جۆرەیـان گشتی‌یە . واتا هەموو زمانانی جیهان تیایا بەشدارن . پەیوەنـدی‌ی بە فسیۆلۆجی‌یەتی هـەناسـە وەرگرتن‌و چـۆنیەتی کـار کردنی ئەندامانی ئاخاوتنەوە هەیە . لە نـاو چوارچێـوەی ئەم قـاڵبە گشتی‌یەدا زمانەکان جیاوازی پێشان ئـەدەن لەچۆنیـەتی لە یەکدانی فۆنیمەکانیان . ئەم لە یەکدانـە تایبـەتی‌یە بـرگەی فۆنۆلوجی - کە جۆری دووەمە - پێك ئەهێنێ .

لە هەموو زمـانێکا نـاووکی برگـە ڤاولێکـە لەگەڵ ئـەم ڤاوڵەدا ئەشێ چەن کۆنسـونانتێ دەرکـەوێ . ژمارەی ئـەو کۆنسونانت‌و جۆری ریـز بوون‌و دەرکـەوتنیان بـەیەکـەوە لە زمانەکانا جیاوازن . بۆ نموونە لەبرگەی زمانی کوردی‌یا لە یەك تا چوار کۆنسۆنانت ئەشێ لەگەڵ ڤاولا لەبرگەدا دەرکـەوێ . هەرگیز لە دوو کۆنسونانت زیاتر ناکەوێتە لایەکی ڤاوڵەکەوە . لەبرگەی زمانی ئینگلیزی‌یا ئەشێ پێنج کۆنسونانت دەرکەوێ گەورەترینیـان ئەوەیـە کە سێـان ئەکـەوێتە پێش ڤـاوڵەکەو ودوانیان ئەکەوێتە دوای . لە هەر زمانەی هەندێ فۆنیم هەن هەرگیز بەیەکەوە دەرناکەون لەپێش یا دوای ڤاوولی برگەدا .. هتد . ئەو یاسایانەی دەرکەوتن‌و ریزبوونی کۆنسـونانتـەکان لەناو قالبی برگەدا دەست‌نیشان ئەکەن بە یاسای فۆنۆلوجی ناو ئەبرێن .

جۆری سێیەمی یاسا فۆنۆلوجی‌یەکان ئـەوانەن کـە لە ئەنجامی لەیەکدانی فۆنیمەکان - لەهەنـدێ حاڵەتـا - دەنگ هەیە ئەتوێتەوە ئەبێ یـا پەیـائەبێ . وەك تـوانەوەی (ە) ی امرازی پێناسین (ەکە) کە (ان)ی کۆی ئەچێتە سەر

کوڕەکە + ان ⟵ کوڕەکان

حاڵەتی واش هەیە لە ئەنجامی لەیەکدانی فۆنیمـەکان هەندێ دەنگ پەیا ئەبێ .. وەك دەرکەوتنی (ی) کە فرمانی بێ هێز (ە) ئەچێتە سەر ئەو ووشانەی بە ڤاوول کۆتایی‌یان دێ .

ئەو مامۆستا - ە ⟵ ئەو مامۆستایە

یا پەیا بوونی (ێ) کە راناوی (تملك)ی کەسی سێیەمی تاك (ی)و فرمانی بێ‌هێز (ە) بەیەکەوە وەرئەکەون

ئەو { برا - م - ە / برا - ت - ە / برا - ی - ە (تی) — برایەتی / برا - مان - ە / برا - تان - ە / برا - یان - ە }

هەر زمانەی کۆمەڵە یاسـایەکی دەست نیشـان کراوی هەیە بۆ پەیا بوون‌و لەناو چوونی هەندێ دەنگ لە ئەنجـامی لەیەکدانی فۆنیمەکانی . ئەم یاسایانە بەیاسای فۆنۆلوجی ناو ئەبرێن .

## پەراوێزەکان

1 - زمانی عەرەبیمـان هەڵبـژارد بۆ ئـەم بەراووردی‌یـە چونکـە زۆربەی خوێنەران شارەزای ئەم زمانەن . هەچ دوو زمانێکی تر ئەشێ بۆ ئەم جۆرە بەراووردی‌یە هەڵبژێررێ .

2 - لەگۆڤاری کـۆڕی زانیاری عیـراق - دەستەی کـورد ، بەرگی نۆیەم - سالی 1982 (ل 434 — 449) ووتارێکمان هەیە بە فراوانی لەچەمکی فۆنیم و چۆنیەتی دەست نیشـانەکـردنی لە زمانـا ئەدوێ . بۆ ئەوانەی ئەیانەوێ زیاتر لەم باسە بگەن .

## سەرچاوەکان


1 - ئەمین . و . ع . (1982) - ئیملای کوردی‌و چەن تێبینی یەك - گۆڤاری زانیاری عیراق - دەستەی کورد . ل (434 — 449) .

2 - ئەمین . و . ع . (1982) فۆنیمەکانی زمانی کوردی - گۆڤـاری نووسەری کورد ژ 8 خولی دووەم .

3 - Abercrombie, D. (1966) Elements of general Phonetics" Edinburgh.

4 - Robins, R.H (1979) "General Linguistics. An Introductory Survey. London. Longman.

# دا له زمانی یه‌کگرتووی ئه‌ده‌بی کوردیی دا

**محه‌مه‌د ئه‌مین هه‌ورامانی**

**زمانی کوردیی تائێستەش لەرووی گەشەسەندن‌و رازاوەیی‌و پاك‌و پوختەیی‌یەوە هەر لەسەر بنچینەی رەسەنی خۆیەو رۆژبەرۆژو دەم‌بەدەم شان‌بەشانی رۆژانەی پێویستی جەنجاڵی‌ی ژیانی ئەو کۆمەڵە مرۆڤە کە گفت‌وگۆی پێ دەکەن‌و پێیەوە دەنازن ، هەرگەشە دەسێنێ‌و بێ پەروایانە لەتەقڵ‌و دەوو رێگا بڕینی بەرەوپێشەوەچوون نەکەوتووە .**

کە هەندێ رواڵەتیشی، ئەگەر کاڵ‌و کورچی‌و دواکەوتنی بەرچاو دەخەن ، بێگومان هۆی بۆ ناڵەباریی باری ئابووریی‌و رۆشنبیریی کۆمەڵایەتی‌ی ئەو کۆمەڵە یاخود ئەو گەلە کە گفت‌و گۆی پێ‌دەکەن ، ددگەڕێتەوە ..

رواڵەتێ لەو رواڵەتە کاڵ‌وکورچانەش کە لێکۆڵینەوەی زمانیانەی پێوە دیاری‌یە ئەوەیە کە هێشتا نەك لێکۆڵینەوەی پێویست‌و تەواو نەکراوە بەڵکو تەنانەت دەوری زوربەی کەرەستەکانیشی نازانرێ‌و ناتوانرێ رۆڵ‌و ئەرك‌و واتای هەریەك لەوانە بە راست‌وڕەوانی لە رستەسازی‌دا دیاریی بکرێ .

دیارە ، ئەگەر هەر پسپۆڕێ لەوپسپۆڕە کوردە رۆشنبیرە دڵسۆزانە کە حەزیان لە ناسینی‌زمانی کوردی‌یە . لە لای خۆیەوە ، هەر یەکە ، هەوڵ‌و تەقالایەکی دڵسۆزانەو کۆڵنەدەرانەی لەم رووەوە دا ، بێگومان چەند لایەنێکی زۆری کەرەسەی زمانەکە رۆشن دەکەنەوەو کە ئەمە خۆی لەخۆی‌دا پێشکەش کردنی خزمەتگوزاری‌یەکی نەبڕاوەی هەتا هەتایە.

من ، لێرەدا ، پەلەقاژێی ئەوە دەکەم کە بە پێی تواناو بە مەبەستی پێشکەش‌کردنی خزمەتێ بە زمانی کوردیی ، بیروڕای خۆم ، وەك بەری پشکنین‌و کەژماڵم دەربارەی هەندێ کەرەستەی سینتاکسی زمانی کوردیی بە هۆی لێکۆڵینەوەیەکی سەرپێیەوە دەربڕم‌و تاکو ئەگەر توانیم تووڵە رێ‌یێ بەرەو لێکۆڵینەوەیەکی دیکەی نوێ‌تر پاك بکەمەوەو خوێنەری حەزلێ‌کەری ئەم جۆرە گۆشەیەش زۆر نەبێ کەم لێی لووتەلا نەبێ حەزی‌هەبێ لەوەی کە بیکا بە بنەوای دەستی قەڵەمی .

دڵنیاشم لەوەی کە هیچ لێکۆڵینەوەیێ نی‌یە سەرپاکی خوێنەر لێی رازی بێ‌و بێگومان ئەمەی منیش‌و بۆیە خستنەکاری قەڵەمی رەخنە دەربارەیەوە دەبێتە هۆی کامەرانیم چونکە هاتنەوە دەنگی هەر خوێندەوارێکی دڵسۆز بە مەبەستی دەرخستنی رەخنەی بە سوود ، بەرەو ئاسۆی بیری فراوان‌ترو پان‌و پۆرترمان دەبا .

شایەنی باسە ، ئەم لێکۆڵینەوە سەرپێیەمان تایبەتی‌یە بە ( دا )ی نێو زمانی یەکگرتووی ئەدەبی کوردی‌یەوە ، بۆیە بە باشم زانی کە ئەم رێگایەی خوارەوە بگرمە بەر : ــ

یەکەم : کەژماڵێ ، بە نێو دوێ توێی فۆلکلۆری کوردیی‌و کوردواتەنی‌دا بکەم بەو نیازەی کە ئەم جۆرە بەرهەمە بەرگەگرترین بەرهەمی ئەدەبی کەلەپوورە کە توانای خۆڕاگرتن‌و نەگۆڕان‌و نەمردنی لەبەردەم ناهەموارترین تەنگ‌وچەڵەمەی ئاڵ‌وگۆڕی هات‌ونەهاتی ژیان‌دا هەیە .

دووەم : پەنا براوەتە سەر بەرهەمی جزیری ، جونکە بە پاکترین‌و رەواترین سامپلی زمانی کوردیی‌ی سەردەمێکی باکوری‌کوردستان دەخاتە بەردەست‌و لاشم وایە کەس بەو هەڵبژاردنە لووتەلا نەبێ !

ئەمە لە لایەکەوە ، لە لایەکی دیکەشەوە رۆژهەڵهات‌و کرۆکەی کوردستان‌ــ بە واتای فراوان ــ چەندان کەلەشاعیری وەك سەیدای هەورامی یەکەم‌و بێسارانی‌و خانای قوبادی‌و هی دیکە لە ئەدەبی کوردیی‌ی ئەو سەردەمەی سەرانسەری فەرمانڕەوایی بابانەردەڵانی‌دا جێکاو رێ‌و شوێن‌و پایەیەکی تایبەتی‌و ناسراویان هەبووە ، چونکە توانیویانە بۆ یەکەمجار بە زمانی باوی رەسمی‌و دینی ئەو سەردەمەی ئەو ناوچانە کە

زمانی کوردیی ناوچەی هەورامانە ( شیعر ) بهۆننەوەو واز لە زمانی بێگانە بۆ ئەو جۆرە کارانە بهێنن .

گومانی تێدا نی‌یە کە ئەو زمانە کوردی‌یەی ئەو سەردەمە کەفەسەرە بە کەرەسەی رەسەن ، کە هەرگیز زاناو دلسۆزی زمانو ئەدەبی کورد ناتوانێ لێیەوە دووربێ !

پشکنینی زمانی نالی‌و سالم ـ یش، پشکنینی زمانی ناوچەکانی سەردەمی بابانە کە لە راستی‌دا بە بنەوای زمانە ئەدەبیەکەی ئەمڕۆ سەرژمێر دەکرێ ، بۆیە شارەزابوونی شیرازەی رستەسازیی بەرهەمەکانیان ، واتای زانین‌و ناسینی هەوێنی رستەسازیی زمانی یەکگرتووی ئەدەبی کوردیی ئەمڕۆیە .

سێیەم ـ گەران بە هەندێ بەرهەمی بیستەکانی سەدەی بیستەم‌و پەنجاکان‌و بەملاوەی هەمان سەدەدا ، بە مەبەستی ورد بوونەوەی بێ لایەنانە لەو کەرەستانە ، بۆ دیاریی‌کردنی رۆلی ( دا )و ئەرك‌و واتای روالەتی سینتاکسی کە ( ئاماژە = ئیشارەت ) کردن‌و دیاریی‌کردنیان بە راستورەوانی بە لای منەوە پێشکەش کردنی خزمەتگوزاری‌یەکی گەورەیە بە زمانی کوردیی .

هێنانەوەی سامپلی جۆراو جۆر بە مەبەستی زانینی بەشداریی بوونی زارەکانی زمانی کوردی‌یە لە زمانە ئەدەبیەکەداو هاندانیشە بۆ خزمەتکردن بە گەشە کردنی‌و ئەرکی هەمولایەکیشە کە بە تەنگەوەی بێن .

**پێش دەس‌هەلگرتن لەم وشەیە ، دەمەوێ بلێم ، هەلبژاردنم بۆ وەرگرتەی هەر بەرهەمێ دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی کە بەباشم زانیوەو بەس ، بۆیە داواکارم کە لەم رووەوە کەس دلی گەرد نەیگرێ ، چونکە تەنیا ئاوات هەر ئەوە بووە کە ئێستە نووکی قەلەممان بۆی داداوە چی لە بارەی ( دا )وە نووسراوە !**

دەسکەوتی پەرەپەرە کردنی بەرهەمی زمانناسانی زمانی کوردیی وای خستۆتە بەرچاوم ، کە بلێم زوربەی روالەتەکانی ( دا ) بە تەواویی رۆشن نەکراونەتەوەو هێشتا هەر لەتاریکی‌و نەبینی‌دان‌و تەنانەت روخساریشی هەروەك کەرەسەیەکی زمان نارۆشنە .

دەسپێشخەری‌ـکەر لەم رووەوە دکتۆر ئارنست مەکارۆزە کە (دا)ی داوەتە بەر شۆلەی مەحاکی ناسین‌و وەك رەگی ( کار )و وەك پاشبەندێ لەگەل ( لە)دا دەستی بۆ راکێشاوە ، تەماشای لاپەرە ( ٧٩ )ی کتێبی (Akurdish Grammar) بکە .

نوری عەلی ئەمین ـ یش دەستی بۆ ئەوە راکیشاوە کە (دا) دەبێتە پاشگری پرێپۆزیشنی (پێ)و (تێ)و (لێ)و (وێ). (تەماشای کەلێنێکی‌تر لە رێزمانی کوردی)دا (ل ـ ٤٠ـ٤١)بکە.

ئەوجا دوکتۆر مەکەنزی، (دا)ی وەك کارێکی سەربەخۆو کرداریی بەکارهێناوەو وێنەی (پیاوەکە لە سەگەکە ئەدا) بۆ هێناوەتەوە (تەماشای) لاپەرە (١١٦ـ١١٧).

هەروەها (دا)ی وەك پاشبەندێ. لە فرەێزی (لەرقفان‌دا) بە کار هێناوە ، دەشلێ کە هەولێری بە ( لە پاشان‌دا) دێژن (لە پاشدان) تەماشای لاپەرە (١٢٦)ی ـ Akurdish Dialect Studies بکە.

لە بەرهەمی خاوەنی ئەم وشەیە (سەرەتایێك لە فیلۆلۆژی زمانی‌کوردی)دا لە لاپەرە (١١٢ـ١١٥)ی دا ، (دا) وەك(کار) وەك پاشبەندێ ناوی هاتووە.

لە کتێبی رێزمان‌و ئاخاوتنی کوردی ـ ،لە لاپەرە (٣٢١ـ٣٢٢)دا، (دا) وەك تەواوکەری (پرێپۆزیشنی (لە)و ( بە ) دەستی بۆ راکێشراوە .

رەئووف ئالانی لە گۆڤاری رۆشنبیری نوێی ژمارە (٧٥)ی سالی (١٩٧٩)دا، دەستی بۆ ـ (وەك خۆی دەلێ) ـ ئامرازی (تێ)و (دا) لە وشەی (تێدا) راکێشاوە.

**١ ـ روالەتی(دا)ی فۆلکلۆرو کوردواتەنی :**

پشکنینی بەرهەمی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردیی وامان بۆ دەردەخا کە (دا) هەموو وەختێ بە پۆشتەیی یا ناکەوێتە کارەوە، یا ناخرێتە چونکە جاری وەها هەیە کە دەنگی(د)کەی شارراوەتەوەو کراوە بە ژێر لێوەوە تەنها دەنگی (ا)کەی ماوەتەوە، ئەم جۆرە روالەتەش (دەمانباتەوە سەر دەنگسازیی کە لقەزانستێکی نوێی زمانەو هۆگریشی بە هۆیەوە توانای زانینی ئەوەی دەبێ کە بزانێ، دەنگێ (کار) دەکاتە سەر دەنگی دیکەو ئال‌و گۆرێ بە پێی زۆرداریی‌و کەم‌ـزۆریی ئەمیان لە چاو ئەویان‌و جیاوازیی سازگەیان‌دا روودەدا.

ئەو ئال‌و گۆرەش ، هەر وەك سروشتی هەر زمانێکە ، سروشتی زمانی کوردیشە، حەزی بەرەو ئاسان بوونە، وەك ئا لێرەدا، لەم وێنە فۆلکلۆری‌و کوردواتەنیەدا لابردن‌و بە ژێرلێوەوە کردنی دەنگی(د)کە بە ئاشکرایی دیارە.

ـ ئالتون لە قورا دیارە . ( پەندی پێشینان‌ـی‌خال) (ل ـ ٢٠)
ـ ئاو کرا بە ئاگرا. " (ل ـ ٢٢)
ـ ئاوێ بە جۆگەیەکا رۆی ئەبێ هەر برِوا " (ل ـ ٢٣)
ـ ئەدا بە لای مارا کلکی ئەقرتێنێ "
ـ ئەسپێ لە باخەلیا سەوزەلە گیانمیانە " (ل ـ ٢٩)
ـ ئەگەر زیخێ نی‌یە لە کەوشیا بۆچی ئەلەنگێ " (ل ـ ٣٣)
ـ ئەگەر لووت نەبێ لە بەینا چاو چاو ئەخوا " (ل ـ ٣٥)
ـ ئەلێی نانی بەسەر ساجا سووتارە. " (ل ـ ٥٠)
ـ ئەو خورمایەی تۆ خواردووتە دەنکەکەی وا لە باخەلمنا " (ل ـ ٥٦)
ـ بە درێژی خۆتا ئەروانیت ، بە پانی خەلقیشا بروانە .

. پەندی پێشینیانی خاڵ، (ل-١٠٧)
-دەستی خۆی برد بەدەما. « (ل-٢٣٤)
-بەرخ هەر لە کۆزا نابێ «
-بێ ئەو پەنجە ناکا بە ئاوا « (ل-١٢٦)

ئەوەی کە شایەنی ورد بوونەوەیە لێرەدا، ئەوەیە کە قرتاندن ، یاخود بە ژێرلێوەوە کـردنێ دەنگی (د)ی (دا)کە لەبەر دوو هۆ رووی‌داوە، ئەوانیش، یەکەم، لەبەر ئاسانی‌و سروشتی زمانیش ، هەروەك وتمان بەرەو ئاسانبوون چوونەو دووەم، چونکە ئەو وشانەی‌کە (دا)یان وەك پاشبەند وەرگرتووە، کۆتاییان نە بە دەنگی (ا)و نە بـە دەنگی(ە) هاتووە، بۆیـە نووسەرو **گفت‌وگۆکەری** ئاسایی بۆی هەیە (دا)ی هەر وشـەیێ وەك ئەم وشانەی سەرەوە بە تەواوی (گۆ)بکا یاخود دەنگی (د)ی (دا)کە، بکا بە ژێر لێوەوە، چونکە هەردووکیان رەوان، بەڵام لە کاتی نووسیندا ، بە لای منەوە بنەرەتەکە رەوایـە . واتە ، ئەگەر کوردواتەنی نەبێ دەبێ لە جیاتی :

(لە قورا) بنووسرێ (لەقوڕدا)
بەئاگر بنووسرێ بە ئاگردا
بە جۆگەیەکا بنووسرێ بە جۆگەیەکدا
لە باخەڵیا بنووسرێ بە لای ماردا
لە باخەڵیا بنووسرێ لە باخەڵی‌دا
لە کەوشیا بنووسرێ لە کەوشی‌دا
لە بەینا بنووسرێ لە بەین‌دا
بە سەر ساجا بنووسرێ بە سەرساج‌دا
لەباخەڵ منا بنووسرێ لە باخەڵ من‌دا
بە درێژی خۆتا بنووسرێ بە درێژی خۆت‌دا
بە پانی خەڵقیشا بنووسرێ بەپانی خەڵقیش‌دا
بە دەما بنووسرێ بە دەم‌دا
لە کۆزا بنووسرێ لە کۆزدا
بە ئاوا بنووسرێ بە ئاودا

ئەو وشـەیەش کۆتـایی بە دەنگـی(ا)و (ە) هاتووە، پاشبەندی (دا)کەی بەپامانو زمـانی لەگەڵدا دەنووسرێ‌و (گۆ)ش دەکرێ، بۆ وێنە وەك:

-جوان لە بەرو **بێشکەدا** بناسە.
(پەندی پێشینانی خاڵ،ل-١٦٧)

- ئەوی بە **پەیژەدا** سەرکەوێ ئەبێ لە خوارەوە دەست پێ بکات.
پەندی پێشینانی خاڵ،(ل-٦٤)

-ئەوەش کەوا لە ژێر **بەرەدا**، ئەکەوێتە سەر بەرە.
(پەندی پێشینانی خاڵ،ل.٥٩)

**٢-واتای (دا) لە وێنەی فۆلکلۆریی‌و کوردواتەنی‌دا**

پاش رۆیشتنەوە بە واتای (دا)ی ئەو وێنانەی کە لـە دوێ توێی کورد واتەنی‌دا بە وێنە هێنراونەتەوە، واومان بۆ دەردەخەن کە بە هۆی هەندێ پریپۆزیشنی تایبەتی وەك (لە) و (بە)وەو بە هۆی ئەو کلۆزو فرەیزەوەو ئەو وشەیەی کە (دا) پاشبەندیەتی، واتاکەی زیاتر رۆشن دەبێتەوە، بۆ وێنە:

-لە قوتوی هیچ **عەتاریکدا** نی‌یە.
( ئیدیۆمی زمانی کوردیی )

بە ساکاری ، واتای ئەوە دەدا یاخود دڵنیامان لەوە دەکا کەلەناو جێگای وادا نی‌یە ! - (دڵنیایی‌ی ئاوەڵکاری‌یە)-یاخود شتی وەها نی‌یە!

**-لەقافـدا** گرتی. (ئیدیۆمی زمانی کوردیی) (ل-٤٢٤)

بەبێ زیادوکەم دیـاری کـردنی جێگاکەیە. وەك چۆن ئەندازیاریی توختـەیـەکی راسـتو رەوان دیـاری دەکا. (دیاری‌کردنی ئاوەڵکاری‌یە).

-کەر لە **چاوی‌دا** قازیی‌یە. (ئیدیۆمی زمـانی کوردیی) (ل-٢٧٠)

ئەمەش، ئاماژە کردنە بۆ بەراوردی ئاوەڵکاریی، رادەی زانین‌و ژیریی‌ی ئەو پیشـاندەدا . ئەگەر فرەیزی (لە چاوی‌دا) نەبوایێ ئەو وەختە (قازیی‌یە) بە جۆرێکی دیکە ، لە قەڵەم دەدرا.

-لەگەڵ **رۆژدا** شەڕدەکا.
(ئیدیۆمی زمانی کوردیی، ل-٤٣٢)

لێرەدا روخساری جۆری جووڵانەوەیمان بۆ دەردەخـا ، بەجۆرێ کە لەگەڵ (رۆژدا) شەڕدەکا.

**٣ - ئەرکی (دا) لەم وێنانەدا.**

**١-(دا) وەك پاشبەنـدێ**، لەم وێنـە فۆلکلۆریـانەی سەرەوەدا بـە هـۆی پریپـۆزیشنی (لە)و (بـەوە) ئـەرکی ئاوەڵکاریەتی گرتوەتە ئەستۆی خۆی، بە شێوەیەکی روونتر، (دا)و (لەو) (دا) و(بە) ،بـە دوولانە ئەوجا ئەرکەکـە تەواو دەکەن، ئەویش راست‌ورەوان-کردنی ئەرکی ئاوەڵکاریەتی‌یە، بۆ وێنە وەك:

-چاو(کوڕە)ی ردێن بە گوو
**بە کۆلاناندا دەچوو.**
(فولکلۆری هۆنراوەکانی کوردەواری، ل-٥٤)

**-لەگوندان** بانێ ژێری
دەستیان شوشتن تەڕ بوون مۆری
کیژ دەگرێن کوڕ نامخوازن .
(هەمان‌سەرچاوە، ل-٦٨)

- بەپێش **ماڵیاندا** رابوردم
هێشتا دوور بوو گازی کردم.
(هەمان سەرچاوە)

-بەپێش **ماڵەکەدا** رابوردم
جۆتە کیژەك گازیان کردم
سەرو ماچیان خەڵات کردم

هەمان سەرچاوە

ــ قۆندرەکی **لەپێدایە**
دەگرێ پەنجەو پاشیان
چاوی وەستای کۆرەبێ
لەگەڵ دەرزیو دروومانی
(هەمان سەرچاوە، ل-٨٤)

**ب-(دا) بەبێ هاریکاریکردنی** پرێپۆزیشنی (بە)و (لە)، بە کردەوەی خۆی ئەرکی (کار)ێکی کرداریی دەبا بەڕێوە، بۆ وێنە وەك:

ــبەگورگان خواردوویدا.
(ئیدیۆمی زمانی کوردی،ل-١٢١).

**٤-روالەتی مۆرفۆلۆژی(دا).**

وێنە کورد واتەنیەکانی سەرەوە کە بە وێنە هێناومانەتەوە ،وامان بۆ دەردەخەن. کە بڵێین،

**(ئا)-(دا) دەبێتە پاشپەندی** هەموجۆرە ناوێ (تەماشای وێنەکانی (١٠٢٠٣) بکە. بێ- (دا)دەبێتــە پاشبەندی هەندێ راناوی (ئامازە =ئیشارەت)، بۆ وێنە:

ــئەمە خوێی چێشتە لەچاو **ئەودا**.
(پەندی پێشینان)

**جێ-(دا)دەبێتە پاشبەندی** هەندێ (راناو)ی وەك (من)، (ئێمە)و (تۆ)و (ئێوە)و (ئەو)و (ئەوان)... هتـد.، بۆ وێنە وەك:

ــئەو دەنکە خورمایەی تۆ خواردووتە دەنکەکەی وا لـە گیرفانی **مندا**.
(پەندیپێشینان).

**دێ-ئەگەر دوو** ناو بەهۆی (و)پەیوەزەوە کەفتنە دوای یەکتریەوە، (دا)وەك پاشبەند، دەبێتە پاشگری هیدواییان، بۆ وێنە وەك:

ــبە ئاسو **پەلاسدا** چوو.
(ئیدیوم)

**هێ-ئەگەر دوو ناو** بۆ مەبەستی بەدیارخستنی یەکتریو بە هۆی (ی) دیارخەرەوە کەوتنە دوای یەکتریەوە ، (دا)وەك پاشگرێ دەبێتە پاشبەندی ئەوەی دواییان ، بۆ وێنە :

ــ بە ئاخی **زەویدا** چووە خوارەوە .
( پەندە پێشینان )

**وێ ــ ( دا ) دەبێتە** پاشبەندی ئاوەڵناویش ، بۆ وێنــە وەك .

ــ بەسەر منی **بەدبەختدا** دەبڕێژێ .
( ئیدیۆم )

**٥ ــ (دا) لە نێوشیعری شاعیرانی پێش چەرخیبیستەمدا**

**ئا ــ (دا) لای سالم :**

کەژمالێکی نێو شیعرەکانی ( سالم ) ئەوەمان بۆ دەردەخا کە (سالم) ئەوەندەی بە بەنگ ئاوازو سۆزی شیعرەکەیەوە هاتبێ ئەوەندە بە تەنگ پارێزگاری-کردنی وشەوە نەهاتووە . بـــە شێوەیەکی روونتر ، سالم هەموو شـــتێکی لـەو رووەوە خـــستووەتە ژێر رکێفی ئاوازو سۆزی هۆنراوەیەوە ؛ بۆیـــە لەهەندێ جێگادا پارێزگاری دەنگی [ د ] ی پاشپەندی (دا)کەی کردووەو هەندێ جاریش کردوویەتیە ژێر لێوەوە ، بۆ وێنە :

ــ سەرسامی ماجەرای فەلەك بم ئەگەر ببێ
سەودای عەشقی تۆ **لەسەرمدا** بە سەرسەری
( ئەنجومەنی ئەدیبان ، ل ــ ٥٩ )

هەروەها دەڵێ .

ــ چهرەت بە هەیئەتێکە لەناو شامی **طورەدا**
دەربێ سەحەر لە بورجی ئۆفـو سەمسی خاوەری
( ئەنجومەنی ئەدیبان ، ل-٦٠)

لە جێگایەکیترەوە دەڵێ :

ــ **لەباغا** غونچە مەشقی لێوی تۆی کرد
نوخـستین گوڵ لە خەندەی تۆوە پشکووت
( ئەنجومەنی ئەدیبان ، ل ــ ٦٢ )

لە لایەکی دیکەوە دەڵێ :

ــ وەزنی یەك بۆسەو جورمی سەروجان
لە ترازووی **ئـەوا** سەربەسەرە
( ئەنجومەنی ئەدیبان ، ل ــ ٦٣ )

**بێ ــ ( دا ) لای (نالی)**

١ ــ ( دا ) لە لای ( نـــالی ) ، هەروەك ، هەروەك خۆی ماوەتەوە ، هیچ جارێ بەرچاو نەکەوتووە کە **دەنگی** لێ قرتابێ، یاخود کرابێ بەژێر لێوەوە بۆ وێنە تەماشای :

ــ شاهی جەم ( نالیا ) تەئریخی جەم تەئریخیە
تا نەڵێن لەم **عەسرەدا** ئەسکەندەری جەمجا نەبوو
( ئەنجومەنی ئەدیبان ، ل ــ ٦٧ )

یاخود دەڵێ :

ــ یا عەکسی ئاسمانە **لە ئاوێنەدا** کەوا
ئەستێرەکانی رادەکێشن وەك شەهابی نوور
( ئەنجومەنی ئەدیبیان ، ل ــ ١٢٧ )

یان ، دەڵێ ،

ــ زوڵفت بە **قەدتدا** کە پەرێشانو بڵاوە
ئەمڕۆ لە منی شیفتە ئاڵۆزو بە داوە
( دیوانی نالیو فەرهەنگی نالی ، ل ــ ١٦ )

٢ ــ ( نالی ) لەنێوان پرێپۆزیشنی یاریدەدەری ( بــە )و ( لە )وپاشبەندی (دا)دا وەختی وەها هەیە زیاتر لە وشەیەکی بەکارهێناوە ، بۆ وێنە لەم وێنەیەی خوارەوەدا دوو فرەیزی پەیوەستداری خستووەتە نێوانیانەوەو ئەمەش جۆرە هەناسە درێژیێ پیشان دەدا ، تەماشا : ــ

ــ تۆ کە حۆری وەرە نێو جەنەتی دیدەم چدەکەی

**لەم دڵەی پڕ شەرەر و سینەیی سۆزانم دا**
( دیوانی نالی و فەرهەنگی ، ل ــ ٤٧ )

٣ ــ نالی (دا)ی وەك ( کار ) بەکار هێناوە ، بۆ وێنە :

ــ نالی ئەو نوقتە کەوا بوو بە نیشانەی چاوی
من لە سەفحەی روخی ئەو دولبەرە نیشانم‌دا

**چێ ــ (دا) لای خانای قوبادی**

١ ــ خانا ، (دا)ی وەك ( کار)ێکی کرداریی بەکـــــار هێناوە ، بۆ وێنە وەك :

ــ وەزیری دیوان کەیقوبادی عەشق
( شیرین و خوسرەو ، ل ــ ٢١٠ )
پەری عاشقان بەی طەوردا دا سەرمەشق

**٢ ــ خـانـا ، (دا)ی وەك** پاشــبەند بەهاریکــاری پریپۆزیشنی ( جە ) کە واتای ( لە ) دەدات بەکار هێنــاوە ، بۆ وێنە وەك :

ــ مەواچی گشت عەیب ئێمە **جە سەردا**
نەوینی عەیب وێت هیچ **نـەوەردا**
( شیرین و خوسرەو ، ل ــ ٥٥١ )

**٣ ــ خانا ، بە یاریدەدانی** پریپۆزیشنی ( نە ) کە واتای ( لە ) دەدات پاشبەندی (دا)ی خستووەتە کارەوە ، بۆ وێنـە تەماشای نیوە دێڕی دووەمی ئەو وێنەیەی سەرەوە بکە .

**٤ ــ هەروەها خانا** ، پریپوزیشنی ( وە )ی بە واتای (بە) لەگەڵ پاشبەندی (دا)دا بەکار هێناوە ، بۆ وێنە وەك :

ــ سا بازەم جەی قەصر تەنگ بێ دەردا
پەی ناکامی‌ی وێم بدەم **وە ســـەردا**
( شیرین و خوسرەو ، ل ــ ٥٤٨ )

یاخود دەڵێ :

ــ چون حەلقەی ئەژدەر نەقش **بە وەردا**
پێچ مدا چون مار **بـە** رووی **کەمەردا**
( هەمان سەرچاوە ، ل ــ ٣٣٦ )

**٥ ــ خانا ، (دا)وەك پاشبەند** بـەبێ یاریدەی پریپۆزیشن بەکار هێناوە ،و کردوویەتی بە پاشبەندی پریپۆزیشنی وەك ( تێ )و ( پێ ) ، بۆ وێنە :

ــ هەنی درەنگێ نەنیشـــۆش **تێ‌دا**
بە راویاریچ نـە ویەرۆش **پێ‌دا**
( شیرین و خوسرەو ، ل ــ ٢٤٢ )

**دێ ــ (دا) لای بێسارانی**

بێسارانی لەگەڵ پاشبەندی ( دا ) ئەم پریپۆزیشنانەی بەکارهێناوە :

**١ ــ لەگەڵ پریپۆزیشنی ( بە )**

ــ بێ‌دەرد بێ‌دەردش ئەوســا دیاردا
ناڵەش بێ پـــەروا ئاما **بەشــاردا**
( دیوانی بێسارانی ، ل ٤٠ )

**٢ ــ لەگەڵ پریپۆزیشتی (وە)** کە واتای ( بە ) دەدات .

ــ چراغ داجاریێ بۆ **وە** خـــــاوم**دا**
پابنیـــە **وە**بان هەردوو چاوم**دا**
( دیوانی بێسارانی ، ل ــ ٨٣ )

**٣ ــ لەگەڵ پریپۆزیشنی** ( جە ) کە واتای ( لە ) دەدات

ــ ئەوەند زاییف بیم **جەو** نالین**دا**
دیم ئەجــــەل ئامـــا **وە** بالێن**دا**
( بێسارانی ، ل ــ ١٣٦ )

یاخود دەڵێ :

دایم **جـە** تەن**دا** خیاڵ گیــانمەن
هەر بەو زیندەنان بەو ژیانمەن
( بێسارانی ، ل ــ ٨٨ )

**٤ ــ لەگەڵ پریپۆزیشنی** ( نە ) کە واتای (لە) دەدات وەك ، ــ

ــ ئاهی سەرد کێشوو شەوان **نەجێ‌دا**
بێزار بو نەوجـــا یـــار نەبۆش تێ‌دا
( دیوانی بێسارانی ، ل ٥٦ )

**٥ ــ بێسارانی ( دا )ی** کردوەتە پاشبەندی پریپۆزیشنی ( تێ )و ( پێ ) ، وەك

ــ مەگەر نەی شەڵلآ ئێشێ ها **تێش‌دا**
پۆکەی شـــەوبەندت ئاوردەن **پێش‌دا**
( دیوانی بێسارانی ، ل ــ ٤٣ )

**٦ ــ بێسارانی (دا)ی وەك** کارێکی کرداریی بەکار هێناوە، بۆ وێنە وەك،

ئایر دا نەدڵ دەروونم تاودا
دیدەم بە مژگا سەیلی زاخاودا
(بێسارانی ، ل‌ــ٧٧)

یاخود دەڵێ:

بێ دەرد بێ دەردش ئەوسا دیاردا
ناڵەش بێ پەروا ئاما بە شاردا
(دیوانی بێسارانی، ل‌ــ٤٠)

**هێ‌ــ(دا) لە لای مەلای جزیری.**

مـــەلای جـــزیری پـــاشبــەنـــدی (دا)ی لـــەگەڵ ئـــەم پریپۆزیشنانەی خوارەوەدا بەکار هێناوە.

**١ــپریپۆزیشنی (ب)** کە لەجیاتی (بە)یە، وەك:

وەصفی د جەمـــالا تە بوو ئەووەل کو شەبەق دا
تەحسین ژ ئوستادێ کەلامی وە بـحەقدا
( دیوانی‌جزیری- ل‌ــ٤٢٧)

**٢ ــ لەگەڵ پریپـــۆزیشنی** (د) لەجیـــاتی(لە)، بۆ وێنـــە وەك:

خەدەنگا فرقەتێ رەعـــــد دلێ ئـــەو غەفلەتێ لێ دت
دبێژم‌وەرجەبەل بت ئەو بکەر بت وێ د **گافیدا**

**٣ ــ لەگەڵ (ل)** کە لە جیاتی (لە) بەکار دێ، وەك:

ژ مەحبوب دوور کرم چەرخێ فەلەك وێ پو
هلاڤیتم بزانم دێ ل کودت من د ڤێ دەوران **جەرخێدا**
(دیوانی جزیری.ل-۱۰۱)

**٤ - لەگەڵ ( ژ ) کە** واتای ( لە ) دەدات . بۆ وێنە وەك -
باوەرنەمەها بە درێ ب ئەنگوشتێ دو شـەقدا
وەکزەرپە هەرێ سینە ژ مهراتە شەفەقدا ـــــ
(دیوانی جزیری.ل-٤٢٧)

یاخود لەجیگایەکی دیکەوە دەڵێ:
نەسیمێ سونبولو سێڤان سەحەر دا حەبسو زیندانی
ئەبوو قوفلا مەبێ مفتە زرنگینێ ژ قونلێـــدا
(دیوانی جزیری.ل-۱۰٤)

**٥ - جزیری ( دا ) وەك ( ئاو )ێکی کرداری**
دەخاتە کارەوە . بۆ وێنە وەك :
-جسمان ژ حەق نابن فەصل
بازو ژ بازو شەق نەدا
(دیوانی جزیری.ل-۷۲)

حەبیێ بێ خەطا کوشتم ب دەربا فرقەتێ ئاخر
ژ وێ رۆژێ دزانی من کو ئەو تیر ل جەرگی دا
(دیوانی جەزیری. ل-۱۰۱)

**٦ - جزیری (دا) دەکاتە** پاشبەندی پریپۆزیشنی (تێ )و(پێ)،
بۆ وێنە وەك:
ب نارێ فرقەتێ صوهتم ژ فەرقی سەر حەتاپێدا
خەدەنگا غەفلەتێ نوهتم ژ بەرقا لامعـا تێـدا
(دیوانی جزیری،ل-۹۹)

وێخەستی ئەوەی سەرەوە.

**۱-لە زاری(نالی)و** (سالم)و (پەندیپێشینانی خ ڵ) (ئیدیۆمی زمانی کوردی)و (فۆلکلۆری هۆنراوەکانی کوردەواری)و کورد واتەنیدا پریپۆزیشنی یاریدە دەر (لە)و (بە)ن.

**۲-لای بێسارانیو** خانای قوبادی پریپۆزیشنەکان (لە)و (بە)و (جەو) (نە)ن.

**۳-لای جزیری** پریپۆزیشنەکان (ل)،(ب)،(ژ)و(د)ن.

٤ - پاشبەندی (دا) لای ( جزیری ) و ( بێسارانی )و ( خانا قوبادی) و(نالی)و (ئیدیۆمی زمانی کوردی)و (فۆلکلۆری هۆنراوەکانی زمانی کوردی)بە پامانو زمانی وەك بنەڕەتی ماوەو پارێزگاری کراوە.

٥- پاشبەندی(دا) لای(سالم)و (پەندی پێشینانی خاڵ)، زوربەی وەخت دەنگی (د)کەی لێ قرتاوەو کراوە بەژێر لێودوە . کە ئەمە جۆرە سەرەنجێ رادەکێشێ بەتایبەتی هی ئەوانەی بە تەنگ لێکۆلینەوەی زمانەوەن .

٦-دەوری سنیتاکسیی (دا) چ جیاوازیەکی دەرنەخستووە.

**۷-(دا) لە سەرەتای بیستەکانە** وە تا پەنجاکان (ئا)- (دا)لە پەخشاندا.

**۱-رواڵەتی(دا) بە پێی گفتوگۆکەرو نووسەر دەگۆڕێ.**
تەنانەت لە بەرهەمی یەك نووسەردا بەدوو جۆرە رووالەت خۆی دەردەخا، یەکێکیان کردنە ژێرلێوەوەی یادەبرینی دەنگی(د)ی پاشبەندی(دا)وئەگەر بوو بە پاشبەندی ئەو وشانەی کە کۆتاییان بە دەنگی(ا)و (ە) نەهاتووە:، هی دووەمیان ئەوەیە کە ئەبێ بە تەواوی بنووسرێ ئەویش بەهۆی بەندبوونیەوە بە کۆتایی ئەو جۆرە وشانەوە کە کۆتاییان بە دەنگی (ا)و(ە) هاتووە.بۆ وێنە هەردوو رواڵەتەکە : -

-(...لە شاری کوردە **بەدبەختەکانا** منداڵ بۆچی زوو فێری خوێندن نابێ...) (رۆژی کورد، ل-۷۳)

-(مەعاریف چەند **لەتورەقیدا** بێ میللەت ئەوەندە کامل دەبێ...)
(رۆژی کورد،ل-۷۳)

-(وا ئێمە لە نوسخەی ئەوەڵجاری رۆژی **کوردستاندا** لە جەوابی حیزبی حوری عیراقیدا چەند قصەیەکمان عەرض کردبوون ..)
(رۆژی کوردستان، ژ-۳، ل-۲۵)

بۆ وێنەو بە هۆی کۆتایی وشەوە دەبێ-یاساـ (دا)بنووسرێ،
تەماشا:

- ( .. لە دارایی **دنیـادا** بەختیـارم ، چونکە نیسبەتم بە **قەومیکوردە**...)
(رۆژی کورد، ژ-۲،ل-۷٤)

-(..ئەو نەعتی ریسالەتە، کە لەم **ریسالەدا** موندەریجە..)
(ئەنجومەنی ئەدیبان، ل-۳۵)

۲-(دا) بە یاریدەی پریپۆزیشنی لێکدراوی وەك (لەگەڵ) کە واتای ( لەتەك ) ئەداو هی ( لەتەك )یش کە هەرهەمان واتای هەیە کاری ئاوەڵکاریەتی خۆیان دەکەن، بۆ وێنە وەك.

-(..تەگەرە لەمە گەورەتر ئەبێ چی بێ، ژنەکەت تکات لێ دەکات کە شەوێك **لەتەکیا** دانیشی چونکە زۆر نەخۆشە..)
(دیاری لاوان، ل.۱۰-۱۱)

۳-(دا)وەك پاشبەندێ دەنووسرێ بە کۆتایی هەندێ ئاوەڵکاری وەك (ئەوێ)و،(ئێرە)وە، بۆ وێنە وەك:

-(..هەر **(لەوێدا)** بمێنیەوە، قەت رۆژ نەبێتەوە..)
(دیاری لاوان، ل-۷۵)

**بێ-(دا)،شیعردا** : شتێکی نوێ رووی نەداوە کە شایەنی باس بێ ، تەماشا : بێکەس ( ۹۲٤ ) وتوویەتی :
بە رەنجی خۆت **لەدنیادا** بژی ئازادو سەربەست
هەمووکەس پێت ئەڵێ مەردەو کوڕێکی جوستو چالاکە
( دیوانی بێکەس )

سەلام دەڵێ:

میرم تۆ تەنها لە قەبری **تارا**
منیش بێ کەسم لە کوچەی **شارا** ( ل ــ ٩٣ )

دیسانەوە دەڵێ

**لەیەك لیستەدا** ناویان نووسرابوو
تاقە یەکێکی لێ گوم نەئەبوو
( شیعرو ئەدەبیاتی کوردی ، ل ــ ١١٠ )

شێخ نووری دەڵێ:

ــبە کێوی سەختی **ژیانا** بە پێ، بە چنگەڕێ
خەریکی هەڵمەتی سەرکەوتن بگاتە سەرێ

**مەلا حەسەنی قازی دەڵێ:**

ــ پیاوی مەرد دووجار **لەکونْدا** نایگەزێ دووپشكو مــار
لێرە بەولاوە بە واتەی دوژمنی بێ فەڕ مەکەن
(دیوانی شاهۆ، لــ٧٠)

گۆران دەڵێ:

ــخانووی بەگزادە لە سای **درەختا**
ئارامی بووکە لە کۆشی **بەختا**
(دیوانی گۆران، لــ١٢٩)

قانع دەڵێ :

دوێنێ لە بەختی من یار چارشێوی شەرمی **لادا**
( نامەی قانع ، ل ــ ٢١٠ )

**٨ــ(دا)و بەرهەمی پەنجاکان بەملاوە.**

ئاــ(دا) لە نێو پەخشانی رۆژنامەو گۆڤاردا
١ــ(دا)وەك کاری کرداری زۆر بەکار هاتووە.
٢ــ(دا) وەك پاشبــەند هەرهەمــان ڕێڕەوی قووتدان (گۆ) کــردنی گرتووە، بــەبێ گرتنی ڕێڕەوێ، بۆ وێنە:

(...بــەڵام خــوا بکا پەرەدەیــەکی توندوتۆڵ بە رووی ڕابوردوودا بدرێتەوە..)
(ئەحمەد خواجە،دەفتەری کوردەواری ژــ١،لــ٨)

ــ(...من لەم وتارەما قسە لە شاعیریی شێخ رەزا..)
(شێخ محــەمەدی خــاڵ، دەفتەری کوردەواری، ( ژ ــ ١ ، ل ــ ٨٣ )

ــ(... ئەم هــەڵبەستە لە زانستگای مــۆسکۆ، لە چلــەی گۆرانا خوێنــدراوەتــەوە لەم کۆبوونەوەیــەدا چەنــد ئەدیبو شاعیرێکی کوردو عەرەب بەشــداربوون،..)
(د. ئیحسان، دەفتەری کوردەواری، ژــ١،لــ٢٤)

ــ(بەمەرا بۆمان دەرئەکەوێ کە ڕۆژ هەڵاتناسەکان زۆر خۆیان بە زمانی کوردییەوە خەریك کردووە..)
( دەفتەری کوردەواری ، ( ژــ١ ، ل ٣٧ )

ــ .. ( لێرەدا نمە باران یــان شــەونم ئەنجامی ڕووداوەکەیە کە بارینە..)
( د.نەسرین ، العراق، ٢٦ــ١٠ــ١٩٨٣)

ــلە ناو هەندێ لەو کاغــەزانەی تردا کە شێخ رەزا بۆ ئەمین فەیضی نووسیوە ..)
(ئەنجومەنی ئەدیبان،لــ١٤)

لەمەی سەرەوەدا دوو ڕواڵــەتی سینتاکسی(دا)مــان دەست کەوت ئەوانیش:

١ــ(دا) دەبێتە پاشبەندی(تر)و(دیکە)
٢ــبۆ تەواو کردنی کاری ئاوەڵکاری پاشبەندی(دا)، لەوانەیە دوو پرپیۆزیشنی وەك (لە) بکەونە نێو ئەو ڕستەوە، هی یەکەمیان لەکار دەکەوێو هی دووەمیان پەیوەندی بــە ( دا ) وە دەمێنێ

**بێــ(دا) لە چیرۆکدا**

زوربەی چیرۆك نووسان (دا)یــان بە **دوو جۆر ڕواڵەت** بەکار هێناوە.

ــ(لە کاتێکدا من هەر لە سووچەکەی جارانما ماتو بێ دەنگ دانیشتبووم بەم جۆرە ...کەمێکی تاڵم بۆ بکە بەسەرا ...لە تاڵیــا نەئەخورایەوە ...منیش شــەپۆلێکی رقوکینە دڵمی ئاوسـانو لە دڵی خۆما وتم...)
(حسین عارف، کلافەیەك ژانیتووڕە ،ل٧٦ــ٧٧)

لەجێگایەکی دیکەوە دەڵێ:

ــ(....ئەم باسە تیایا شای باسان بوو...)
(هەمانسەرچاوە،لــ٩٤)

ــ(..ئەمیش بەکەناری لای چەپی شۆستەکەدا سەرەو ژوور ملی ئــەنــا . ڕێگــا لەبەرچــاویــا ســووڕاو ... بــە پلیکانەکاندا ...)
(ڕەئووف بێگەرد هاوار ،ل٦٠،٦١،٦٢)

ــ(..کە چەند ساڵێك لەمەوبەر لە جەنگێکا لە بارمەتی حاکمی سۆرانا ...بۆ ئەوەی لەتەنگانەدا فریایان بکەوێ...)
(مستەفا سالح کەریم، شەهیدانی قەڵای دمدم، لــ٩٨)

ــ(..لــەمــەدا بوو کەتینی ڕەشەبــا بەهێزەکــە لــە درزی دەرگاکەوە شــاڵاوی... گەڕانەوەو خۆی کــرد بەژێر لێفەکەدا...)
(عبداللە عزیز خالد، پەرستگا، ل ٣١،٣٢)

**جێ. (دا) لەنێو شیعردا**

هێمن، هــەموو جۆرە (دا)یــەکی بەکار هێناوەو بــە تەواویو پامانو زامانی **پارێزگاری ڕواڵەتەکەی کردووە**، بۆ وێنە وەك:

(کار):

ــ(نە دەستی پاشبارەی ناسی
نە ساوێکی دا لەداسی
تاریكو روون، لــ١٨٩

پێشگر = پێشبەند
ـ(خەمو خەفەت دادەبێژێ
شادیو ئازادی دەنێژێ
(تاریكو روون، ل–١٨١)
پاشبەند = پاشگر
دامرکا، بوو بە ژیلەمۆ
لە ناو **ناورگاندا** پشکۆ
(تاریكو روون، ل–١٨١)
پاشبەندی پریپۆزیشنی ( تێ )
ـ گۆڕستانی خامۆشە شار
**تێیدا** نەماوە زیندەوار
( تاریكو روون ، ل – ١٨٠ )

پێش‌ئەمەی لەم وەرگرتانەی خواردوە وردبینەوە ، دەبێ ئەوە بڵێین : ئەوە بۆ شاعیر دەلوێ بۆ یەکێکی دیکە نالوێ .
لەتیف هەڵمەت دەڵێ :
ـ دەستی شا لەخوێندا گەشگەش بوو
چاویشی وەك جاران هەر رەش‌بوو
( کاروان ، ژمارە ١٣ ، ل ٣٨ )

شێرکو دەڵێ :
ـ چیرۆکی من .. **لەگەڵ** چیرۆکی زەمینـا
**لەگەڵ** پشکووتنی چاوی ساوای **ژینا**
**لەگەڵ** گرمەی ژانی **هەورا**
**لەگەڵ** مژدەی .
تۆفو رەهێڵەی **بارینا**
**لەگەڵ** یەکەم چاو ترووکەی
وەرزی ناسۆرو **ئازارا**
**لەگەڵ** شالاوی **ئاگرا**
دەس پێ ئەکا .
( من تینویەتیم بەگڕ ئەشکێ ، ل – ١٢٦ )

فیعل مصطفی دەڵێ :
ـ ئەو چ دلە دسینگێ تەدا
گۆهـ نادەتە کەلو ژانا
( ئەڤین ، ل ١١١ )

ئەوجا دەڵێ :
وەك گولیلکا روی **بخوناڤا**
وەك تەڤنە تاڤا رۆژاڤا
( ل – ١٣٤ )

**ئەنجام**

بەرهەمی وەرگرتنی سامپلی ئەدەبیی جۆراوجۆری مێژوویی زمانی کوردیی لەسێ زارە سەرەکیەکەیدا ، گەیشتمە ئەوەی بێژم (دا)بە چەند رواڵەتو روخسارو کردەوەیەکەوە خۆی پیشاندام . یەکێ لەو رواڵەتانەی کە زۆر کار دەکاتە سەر رێڕەوی زمانی کوردیی ( پێش بەکارهێنانی پاشبەندی (دا)یە ) کە لێرەدا کارمان پێیەوە نییەو ئەوانی دیکەش ، بە لای منەوە لەمانەی خواردوە بەدەرنین .

**یەکەم ، (دا) چۆن نووسراوەو ( گۆ ) کراوە ؟**

٢ ـ ئەوەی کە بۆمان رۆشن بووەتەوە ، ئەوەیە کە هیچ نووسەرێ لەسەر رێڕەوێکی تایبەتیو دیاریی بۆ ( گۆ )کردنو نووسین (دا) نەڕۆیشتووە ، چونکە ، تەنیا نووسەرێ لە یەك ( وتار ) ، یا پارچە شیعردا ، وا رێك کەوتووە کە بە دوو جۆرە رووالەت (دا)ی پاشبەندی ، بەبێ هۆ ( گۆ ، کردوودو نووسیویەتی . بێگومان ئەمە جگە لەو وشانەی کە کۆتاییان بە دەنگی [١] و [٥] هاتووە ، پاشبەندی (دا)کەیان دەبێ ( گۆ بکرێنو بنووسرێن .

ئەمە ئەگەر بە شێوەیەکی گشتیی لێی بدوێین ، بەڵام ئەگەر دوانەکەمان نەختێ قووڵتر بێ ، دەبێ بڵێین ، ( گۆ نەکردنی (دا)ی پاشبەند سەری لە لای ( سالم )ی شاعیرەوە دەرهێناوە ، کە زمانەکەی رەوانترین وێنەیە بۆ زمانی بابان ، کەچی ( نالی ) ، ئەگەرچی لەگەڵیدا هاوچەرخن ، زمانەکەی لە (دا)ی پاشبەندددا وەك ئەو نییە .

کەوابوو بۆمان هەیە بڵێین ، ـ پاش پەنابردنە سەر وەرگرتەی جۆراوجۆر ـ (دا)ی پاشبەندی زمانی ( نالی ) لەگەڵ ئیدیومو فۆلکلۆری هۆنراوەی کوردەواری ، شاعیری ناوچەی سۆرانو هی جزیری وبێسارانو خانای قوبادیدا ، یەکەو ، جیاوازە لەوەی ( سالم )و ( پەندی پێشینانی خاڵ ا زمان ( رۆژی کوردستان )و زمانی شاعیرانو نووسەرانی ناوچەی بابان ، لە بیستەکانەوە تاوەکو ئەمرۆ !

ب ـ (دا)ی پێشبەند بەبێ ملەجیرێ ( گۆ ) دەکرێ ، بۆ وێنە مدحت بێخەو دەڵێ :
ـ چونکە لەم دەمو دەستەدا
چۆن بە منو بە وشەی **داماو**
( کاروان ، ژ – ١٢ ، ل – ٧١ )

حـ ـ ( دا ) وەك کاری کرداریی سەربەخۆ ، وبەبێ‌چارە گۆ دەکرێو دەنووسرێ ، بۆ وێنە شێرکۆ بێکەس دەڵێ :
ـ دیسانەوە بیستو حەوت جار
باڵەکانی لەیەك **ئەداو** ،
**گوێ**یان لێیە : شتێك ئەڵێ :
بێسارانی دەڵێ :
ـ ئایر دای نە دڵ دەروونم **تاودا**

دیدەم بە موژگان سەیلی زوخاو**دا**
( دیوانی بێسارانی ، ل ٧٧ )

جزیری دەڵێ :

شەمس د نیف بورجا شەرەفدا
سەد کەواکیب چار طەرەف**دا**
( دیوانی جزیری، ل – ٣٧٢ )

**دووەم : ڕۆڵی مۆرفۆلۆژی‌ی (دا)**

١ – ( دا ) وەك ( كار ) ،كردەوەیەكی كرداریی هەیەو وەك هەر تێپەرێكیش پێویستی بە ( كارا )و بەركاریش هەیە ، بۆ وێنە بێكەس دەڵێ :

– لەبەر تۆ زەربەم **داوە** لە خۆشم
وا تێ‌گەیشتم كە چەند بێ هۆشم
( دیوانی بێكەس ، ل ٧٧ )

ب – (دا) كە دەلكێ بە پێشەوەی هەندێ ڕەگی ( كار )ەوە زوربەی وەخت زاراوێ پێك دەهێنێ ، بۆ وێنە : ( نیشت ) ، لەگەڵ (دا)دا، وشەیەكی لێكدراو دروستدەكەن ، كە واتاكەی، جگە لە ( كاری دانیشتن ) ( وازهێنانە لە ئیش ) ، واتە : ئەگەر وتت ، ( ئەو دانیشت ) ، واتای ( ئەو وازی هێنا لە كار ) ئەدا.

داكەوت ، جگە لە واتای ( كەوتنەخوارەوە )ی، واتای ( دامركا ) یاخود ( لە جمو جووڵكردن كەوت )

هەروەهاش ( دابەش)و ( دامركا )و ( داڕزا )و . . . هتد

د– وەختی وەهاش هەیە كارێكی لێكدراو دروستدەكاو هەموو جۆرە ئەركێكی ( فرمان )ی بە دوولانە بەڕێوە دەبەن ، بۆ وێنە (داخست)، بەم بۆنەیەوە گۆران دەڵێ:

–(شاری پەنجەرەو دەرگا **داخستوو**
وەك یەك گیاندارو بێ‌گیان تیا نووستوو.
(دیوانی گۆران، ل–١٣٦)

یاخود مەلا حەسەنی قازی دەڵێ:

– ( ماڵ‌و میراتی بە ناحەق بۆچی وا **دابەش‌كرا** .
بۆچ لەناو جەمعی بەشەردا بێ بەش‌و بێ ناوە كورد
(دیوانی شاهۆ،ل–٢١)

ه–(دا)، وەختی وەها هەیە خۆی دەنووسێنێ بە پێشەوەی هەندێ چاوگی (كار)ەوەو چاووگێكی لێكدراو دروستدەكەن، بۆ وێنە (كاردۆخی دەڵێ):–

–(بەم **دانیشتنە** ڕازی بوون هەموو
(ئەبتان) بە پەلە، ئەهاتو ئەچوو
(دیوانی كاردوخی،ل–١٠٦)

یاخود گۆران دەڵێ:

هەچ كەسێك تازە بێتە دیوەخان
كرنووشێ ئەكا بەسەر **دانەوان**

هەروەها دەڵێ:

دەست لەسەر خەنجەر چاوەڕێی فەرمان
چ بۆ سەربڕین چ بۆ سەر**دانان**
( دیوانی گۆران ، گەشتێ لە هەورامانا )

و–(دا)دەبێتەپێشگری (ئاوەڵناو) و (ئاوەڵكار) دروستدەكا (گیر) ئاوەڵناوەو واتاشی ڕۆشنە، بۆ وێنە دەڵێن: (كابرا گیرە)، واتە :(لەوەی وتی پاشگەز نابێتەوە). بەڵام، كە وتت :(كابرا ئەوێ‌ی داگیركردووە)،واتای، ( دەست بەسەر گرتن زۆرەملی ) دەدا .

**ز–(دا) وەك پاشبەند:**

١–(دا) دەبێتە پاشبەندی هەموو جۆرە ناوێ‌و بەهاریكاری–كردنی پریپۆزیشنی (لە)و (بە)لە سەرپاكی زارەكانی زمانی كوردیی‌داو بە یاریدەدانی پریپۆزیشنی (جەو/نە) لە زاری هەورامانی‌داو (ژ)،(ب)و (د)لە زاری كرمانجی ناوچەی بادینان‌دا. (تەماشای وێنەكانی سەرەوە).

٢–(دا) دەبێتە پاشبەندی هەموو جۆرە ئاوەڵناوێ‌و بە هاریكاری ئەو پرێپۆزیشنانە كە ناویان لە (١–ز)دا هێنراوە.

٣ – پریپۆزیشنی یاریدەدەر لە زمانی یەكگرتووی ئەدەبی كوردیی‌دا بۆ تەواوكردنی كردەوەی ئاوەڵكاریی (دا)

وەك پاشبەندی تەنها (لە)و(بە)ن، كە بەكاردێن، ئەگەرچی ئەمانە لە سەرپاكی زارە كوردیی‌یەكان‌دا بەكارهێنانیان سەرلەبەرە بەڵام (تایبەتێن) بە بنەڕەتی زاری بابانەوە. كە(سالم) باشترین ئاڵا هەڵگریەتی.

٤–(دا) وەك پاشبەند، بەهاریكاری كردنی پریپوزیشنی لێكدراویش كارە ئاوەڵكاریەكەی تەواودەكا، ئەو پریپوزیشینانەش (لەگەڵ=لەتەك)ن.

٥–(دا)وەك پاشبەندێ بە كۆتایی پریپۆزیشنی (تێ)و (پێ) (لێ)وە بەند دەبێ‌و كاری ئاوەڵكاریەتی خۆی جێ‌بەجێ دەكا. بۆ وێنە خانای قوبادی دەڵێ:

–(هەنی درەنگێ نەنیشۆش **تێدا**
بە راویاریچ نەوبەرۆش **پێدا** )
(خوسرەو وشیرین،ل–٢٤٢)

٦–هەر بە هاریكاری كردنی پریپۆزیشنە یاریدەدەرەكان دەبێتە پاشبەندی هەموو راناوێك، كاری ئاوەڵكاریەتی دەبەن بەڕێوە بۆ وێنە –(بەسەر تۆی‌دا ڕژاند..) ئیدبۆم

٧–(دا)، بەهاریكاریی كردنی‌پریپۆزیشنی یاریدەدەر دەبێتە پاشبەندی هەندێ ئاوەڵكارو هێزو كردەوەی ئاوەڵكاریەكە دڵنیاتر دەكەن، بۆ وێنە:

لە+ئێرە+دا، دەبێتە (لێرە)دا
لە+ئەوێ+دا، دەبێتە (لەوێ)دا

—(لێرەدا مەبەستمان ئەمەو **لەوێدا** ئەو.)

٨—(دا)بە هـاریکاریی کردنی پرێپۆزیشنی یـاریدەدەر دەبێتە پاشبەندی ئامرازی (ئاماژە=ئیشارەت)، بۆ وێنە.

—بە+ئەوە+دا=بە ئەوەدا=بەوەدا

—بە+ئەمە+دا=بە ئەمەدا=بەمەدا

—بە+ئەوانە+دا=بە ئەوانەدا=بەوانەدا

—بە+ئەمانە+دا=بە ئەمانەدا=بەمانەدا

**هەندێ رۆڵێ سینتاکسییی(دا)**

(١)(دا) وەك (کار)ێکی تێپەڕی سـەربەخۆی کـرداریی بزێو توانای هەیە:—

أ—(کارا)و (بەرکار) وەرگری، بۆ وێنە وەك:

—پردی کناچانو کوڕانیان دا بە ئاودا

(تێبینی: ئەمانە دووپردی کۆنو دێرینی ناوچـەی شارەزوورنو لە سەروکلاوی ساسانیدا نوێ کراونەتەوە.)

ب—هەر لەبەر تێپەڕی دەگرێ سـە(کاری کارازر =مبنی للمجهول) بۆیە بەرکار لە جیاتی (کارا) وەردەگرێ.

بۆ وێنە وەك:

—پردی کناچان **درا** بەئاودا

(٢)—هەندێ جارو بـە پێی جۆری بەکارهێنان، دەوری (ئەدڤێرب=ئاوەلکار)ێکی سەربـەخۆ دەبینێو (ئـەدڤێربەڵی چۆنیەتی)دروستدەکا، بۆ وێنە:

—**دا** دەبەزێ

—**دا** دەکەوێ

٣—دەبێتە پارچەیـەك لە جۆرەچـاووگێو چـاووگێکی لێکدراو دروست دەکەنو (کاری)ناو دەبا بەڕێوە، بۆ وێنە:—

أ—دەبێ بە (سەبجێکتی)رستە

— **دانیشتن** تەممەڵیە.

ب—(بەرکاری) پرێپۆزیشن، وەك:

—**لە دانیشتن‌دا** ئازایە.

٤—وەك کارێکی یاریدەدەر، لەگەڵ هەندێ (ناودا)ناوێکی لێکدراو دروستدەکەنو دەوری ( سـەبجێکت )و (بەرکار)یش دەبینێ بۆ وێنە وەك:

أ—سەبجێکت

—**بانگدان** پیرۆزە.

ب—گوزارە

—ئەوە بانگدانە.

—وتەی وەها **جنێودانە**

ج—بەرکاری پرێپۆزیشنی

لە جنێودان‌دا هاوتای نیە!

٥—(دا) وەك (بەندە مۆرفیم).

أ—لەگەڵ هەموو جۆرە نـاوێکدا فرەیزێکی ئاوەلکاریی دروستدەکا.

—**بە شارەزووردا** گوزەریکرد

—**بە یەکدا** دای

—بەشاندا کەوت.

—**لە ئاوەدانیدا** دەمیهارە.

ب — شایەنی باسە، هەموو فرەیزێ (شاوشەی تێدا)ە کە ئەشتوانین ناوی بنێین وشەی (سەرە)ی فرەیزکە. دیارە. (دا)، لەگەڵ وشەی سەرەدا یەکدەگـرێو بەندی کۆتـایی دەبێو فرەیزی (ئاوەلکاریی) لێ دروست دەکا. ئەوجا ئەگەر هەر ناوونیشان هەڵـدەرێك کەوتـە دوای وشەی سـەرە. (دا)دەبێتە پاشبەندی ئەو وشەیە، بۆ وێنە:—

١—فرەیزی ئاوەلکاریی وشەوسەرەکەی ناوە:

**لە بەکراوادا**

٢—فرەیزی ئـاوەلکاریی (وشەی سـەرەکـەی ناودو. ئاوەلناویش بە دوایا هاتووە بۆ نیشانهەڵدانی، بۆ وێنە:

**—لە بەکراوای دێرین‌دا**

٣—ئەگەر فرەیزی کەوتە دوای ئەم فرەیزە (دا)،دەگوێزرێتەوە بۆ ئەوەی دوای، هەر لەسەر هەمان یاسا. بۆ وێنە وەك:

**—بەسەر پـردی کناچـانو شـارەزووری رەنگامـەدا** گوزەریکرد. (پەیوەستەکانیـان بـە هۆی ئامرازی پەیوەستی وەك (ی)و(و)و (ە)وە....).

ج—(دا)، سێ جۆرە فرەیزی ئاوەلکاریی دروستدەکا. بۆ وێنە

١—فرەیزی ئاوەلکاریی جێگا.

**—لە قافـدا** گرتی. (کوردواتەنی)

٢ — فرەیزی ئاوەلکاریی ماوە.

**— لە سێ ساڵێکدا** دوکتۆرای وەرگرت.

٣ — فرەیزی ئاوەلکاریی چۆنیەتی.

**لەگەلیدا** چووە. **لەگەڵ رۆژدا** شەڕدەکا (کوردواتەنی)

٤ — فرەیزی ئاوەلکاریی چەندانە، بۆ وێنە وەك

**— لە چەندا** کۆتایی پێ دەهێنی

**سەرچاوەکان**


١ — رێزمانی ئاخاوتنی کوردیی بەپێی لێکۆلینەوەی لیژنەی زمانو زانستەکانی — لەچاپکراوەکانی کۆڕی زانیـاری کورد، ١٩٧٦.

٢ — ئەنجومەنی ئەدیبان، ئەمین فەیضی بەگ. تۆژینەوەی لیژنەی وێژەو کەلەپوور، چاپخانەی کۆڕی زانیـاری عیراق، ١٩٨٣.

٣ ــ رۆژی کورد ، بلاوکردنەوەو پێشەکی‌و لەسەر نووسینی جەمال خەزنەدار بەغدا ، ١٩٨١ ( چاپخانەی ، المؤسسة العراقیة للطباعه ) .
٤ ــ رۆژی کوردستان ، کۆکردنەوەو پێشەکی جەمال خەزنەدار ، چاپخانەی دار الحریە ، بەغدا ، ١٩٧٣ .
٥ ــ من تینویەتیم بە گڕ ئەشکێ ، شێرکو بێکەس ، چاپخانەی ( دار الحریة ) بەغدا ١٩٧٣ .
٦ ــ کاکەی فەلاح ، چاپخانەی ( الحوادث ) بەغدا ــ ١٩٨٠ .
٧ ــ شەهیدانی قەلای دمدم ، مستەفا سالح کەریم ، لە بلاوکراوەکانی کتێبخانەی سلێمانی ، چاپخانەی عەلاء ، ١٩٨٢ .
٨ ــ بەرستگا ، عبدالله عزیز خالد ــ چاپخانەی (دارالحریة) بەغدا ــ ١٩٨٠ .
٩ ــ هەوار ، رەئووف بێگەرد ، چاپخانەی ( الحوادث ) ــ ١٩٨١ .
١٠ــ نیو هەنگاو دوور لە دۆزەخ . د. کاوس قەفتان ، چاپخانەی ( دار الحریة ) ــ ١٩٧٩ .
١١ــ کلافەیەك ژانی تووڕە ، حسین عارف ، چاپخانەی(مطبعة النعمان ) لە نەجەف ( ١٩٧١ ) لەچاپدراوە .
١٢ــ ئەڤین ــ فیصل مصطفی حاجی ــ چاپخانەی (دارالحریة) بەغدا .
١٣ــ دەفتەری کوردەواری ژمارە (١) ، سالی ــ ١٩٧٠ بەغدا .
١٤ــ سەرجەمی بەرهەمی گۆران ، بەرگی یەکەم ، چاپخانەی کۆری زانیاری کورد ، بەغدا ــ ١٩٨٠ .
١٥ــ مێژووی ئەدەبی کوردی ، بەرگی یەکەم ، چاپخانەی ( المعارف ) ، بەغدا ــ ١٩٧١ .
١٦ــ دیوانا مەلایێ جزیری ، توێژاندنا صادق بهاءالدین ئامێدی ، لە چاپخانەی کۆری زانیاری عیراق لە بەغدا ١٩٧١ لەچاپدراوە .
١٧ــ دیوانی بێسارانی ، کۆکردنەوەو لێکۆلینەوەی ، کیومرث نیك رەفتار ، چاپخانەی ( الادیب ) سالی ــ ١٩٨٢ ، بەغدا .
١٨ــ دیوانی صەیدی هەورامی ، کۆکردنەوەی کاردۆخی ، چاپخانەی کامەران ــ سلیمانی ، سالی ــ ١٩٧١ .
١٩ــ دیوانی شاکەلی ــ ساغکردنەوەی جەمال محەمەد محەمەدئەمین ، چاپخانەی ( الامة ) ، بەغدا ، سالی ــ ١٩٧٩ .
٢٠ــ دوو چامەکەی ( نالی )و ( سالم ) ــ علاءالدین سجادی ، چاپخانەی ( المعارف ) ، بەغدا سالی ــ ١٩٧٣ .
٢١ــ دیوانی بێکەس ــ رێکخستنی محەمەدی مەلا کریم ، چاپخانەی ( الادیب ) لە بەغدا ، لە سالی ١٩٨٠ لەچاپدراوە .
٢٢ــ پەندی پێشینان ، شێخ محەمەدی خال ، چاپخانەی کامەران ، سلێمانی سالی ١٩٧١ لەچاپدراوە .
٢٣ــ دیوانی نالی‌و فەرهەنگی نالی ، د. مارف خەزنەدار ، چاپخانەی ( دار الحریة ) سالی ١٩٧٧ لە بەغدا لەچاپدراوە .
٢٥ــ فۆلکلۆری هۆنراوەکانی کوردەواری ــ محەمەد کریم شریف ، لە چاپخانەی (مطبعة الشمال) لە کەرکوك سالی ١٩٧٤ لەچاپدراوە .
٢٦ــ دیوانی شاهۆ ، کاردۆخی ، چاپخانەی کامەران ــ سلیمانی ، سالی ١٩٨٠ لەچاپدراوە .
٢٧ــ زاری زمانی کوردیی لە ترازووی بەراووردا . محەمەدئەمین هەورامانی لە چاپخانەی ( المؤسسة العراقیة للطباعه ) لە بەغدا ــ ١٩٨١ لەچاپدراوە .
٢٨ــ سەرەتایێکی فیلۆلۆژی زمانی کوردی ــ محەمەدئەمین هەورامانی چاپخانەی ( المعارف ) لە بەغدا لە سالی ــ ١٩٧٣ لەچاپدراوە .
٢٩ــ ئیدیۆم لە زمانی کوردیدا ــ جەلال مەحموود عەلی ، چاپخانەی ( حسام ) لە بەغدا لە سالی ١٩٨٢ لەچاپدراوە .
٣٠ــ کاروانی ژمارە (١٢) ، (١٣) .
٣١ــ تاریك‌و روون ــ لە بلاوکراوەکانی بنکەی پێشەوا ــ هێمن لە چاپخانەی دەولەت ، لە بەغدا ــ ٩٧٤ لەچاپدراوە .
٣٢ــ شیرین‌و خوسرەو ــ خانای قوبادی ــ محمدی مەلا کریم ، لە چاپخانەی کۆری زانیاری ، سالی ــ ١٩٧٥ لە بەغدا لەچاپدراوە .
٣٣ــ دیوانی کاردۆخی ــ محمد امین کاردۆخی ، لە چاپخانەی ( دار الحریة ) سالی ١٩٧٨ لە بەغدا لەچاپدراوە .
٣٤ــ گرتنی کەلێنێکی تر لە رێزمانی کوردی ، نووری عەلی ئەمین چاپخانەی ( المعارف ) لە بەغدا لە سالی ــ ١٩٥٨ لەچاپدراوە .
٣٥ــ شیعرو ئەدەبیاتی کوردی ــ رەفیق حلمي ، لە چاپخانەی ( الشباب ) سالی ١٩٥٦ لەچاپدراوە .

36- Akwdish Grammar.
by
Ernest N. McCaus
American Council of Learned Societies
New York
1958

37- Kurdish Dialects Studies
by
D. N. Mackenzie
1961

شێرکۆ بێکەس

# بەهارە شیعرێک

وەکوو درەختێکی تەنیای
بەر زەردەپەڕ
لەپاڵ دەوەنی گردێکا
ڕاوەستاوم .
سەروملو تا ناو قەدم
لەبەر هەتاو
قاچو قولو تا ژوور ئەژنۆ
نوقمی سێبەر .

بەرامبەرم :
کێوی بەردینی گەردن لووس
وەک دیواری شووشەی شینباو
ڕێک هەڵکشاو

کە گلێنەم ئەفڕێ بۆ لای
وەک سەرنجم هەڵ بخلیسکێ
چاو ئەتروکێو کزە بایەک

کالانە پڕ ئەکا لە ئاو .
لەم لاشەوە تەمو مژێ
وەک قژی خاو
بە دەم «با» وە
دێتو ئەچێو جارێک ئەچێتە سەر لەشی
بەفری نووستوو دای ئەپۆشێو
جارێکی تر وەکوو هەڵبێ
بەرەو دواوە
بەرەو دۆڵی ئەودیوی شاخ
مل ئەنێتو بە هێواشی دائەگەڕێ .
لەو لاشەوە لووتکەی تیژی
شێوە خەنجەر

پەڵە هەورێکی سمیوەو
چەتری سپی
هەڵداوە لەسەر تەوقە سەر .
لە بناردا و لە سەر ڕووبار
کە شەوقی ئاوێنەی ئاوی :
چەپکە پرشنگ
ئەدا لە پەڵکە گیای دەشتی
ڕاکشاوی تەختی کەنار .
پۆلە ماسیگرەی سپی
سپی وەکوو گوڵی چواڵە
باڵ وەرئەدەن لە تەنکاوو
تنۆکی سارد ئەپرژێنن

لە دەمو چاوی هەڵاڵە .
بەلای ڕاستدا : پەڵەچنار
لە جۆگەدا قاچی تەزیو
لەرەلەروو خشە خشی گەڵای گوارەی
وەک ختووکەی لامل بدا
دائەچڵەکێو پێ ئەکەنێو لەنجە ئەکا
چلی بەرزی گەردانە زیو .
بە لای چەپدا :
ڕێگەی نسرمی ناو دەربەند
ئەم بەر .. ئەو بەر

هەتا ئێستەش دەستو پەنجەی
دارستانی شین هەڵگەڕاو لە گۆکەوتوو
بنچک لە ژێر بەفرا خەوتوو
کە سەرنجی زیاد لێ بگرم
من لێرەوە لە سەرماندا
وەک شۆڕەبی هەڵ ئەلەرزم .

ئێوارەیەو خۆرنشینەو هەر وەستاوم
لەوساکەوە پەیکەرێکی بلووز شینم
هەر دوو دەستم لە گیرفانداو نەجووڵاوم
ئەوا ئێستەش
لە دامێنی زەردو سووری ئەم گردەدا
تۆ ئەبینم ئەی کچی جوان
کراسو کەوای پوولەکەت
نێرگزی قژ
بریسکو هووڕ
بریقو باق :
وەک گزنگو دەنکە تەرزە
وەک پوولەکەی پشتی ماسیی
گۆمی زۆر ڕوون .
وەک پزیزکی ئاگری شوانی
بە قەد پاڵەوە سووتاوم
وەک دڵۆپی هەڵپرژاوی
سەر قەڵبەزە .
هەزار تیشکی
ڕەنگاوڕەنگ ئەدەن لە چاوم .
گەرای سەدان شیعری بچووک
لە ناو ناخی‌مندا ئەخەن .
بە ئەسپاییو بە ژێی دڵم
زۆر مۆزیقای دەنگ سیحراوی
نە بیستراوم بۆڵێ ئەدەن .
ئەی شۆڕە کچ !
ئەبێ چی جوانتربێ لە تۆ ؟!
مەگەر تۆزێکی تر وەختێ
کە تاریکیی بە پەلە پەل
بۆ ئێرە دێ

● ملا مسعود بێبەش ●

1984 / 4 / 20

# دیاری بۆ «کاروان»

پێشکەش بە «کاروان» بێ بۆ یادگاری
ئەم هەڵبەستانەم وەکو دیاری

گۆڤاری کاروان کاروانی خۆمان
هەروات ببینم بمێنێی بۆمان
جێی شانازییە هەر مەدحت بکەم
تاکە گۆڤاری بەرزی ئێمرۆمان

لەجێی ژیانو ژینو هەتاوی
گەلێ سوود بەخشی بەرزو بەناوی
ئاواتە خوازین هەروا سەرکەوی
هەر سەرکەوتووبی هەتاکو ماوی

ئەم چەند گۆڤارە هەرچەند نەماوە
ئێمرۆکە دەوری تۆیە لەم ناوە
ئەوانیش وەکتۆ دەوری خۆیان دی
هەرچەند نەماون ناویان ماوە

بەراستی کاروان بۆمان دەرکەوتی
سوپاس بۆ خودا کە زۆر سەرکەوتی

پاکو بێ غەشو زیڕی بێگەردی
دژی زۆردارو دوژمنی چەوتی

باکورد بزانێ کاروانی کوردی
ڕێگا باش ئەبڕی بەمەردی ووردی
لەم بڕوایەدام وێنەت زۆر کەمە
بەحەقم زانی جا مەدحم کردی

حەقتە گەر بڵێم تاکە گۆڤاری
(لەم کوردستانە بەرزە) دیاری
ئەم هەڵبەستانەم پێشکەشت ئەکەم
لەزێڕ چاترە لەبۆ دیاری

لەهەمو شارێك ناوت داوەتۆ
تا ئێستا دەرچووی لەئەو ساوە تۆ
هەروا بنووسی درێغی نەکەی
ئەوجا پێت ئەڵێم جێت سەرچاوە تۆ

چەندی مەدحتکەم کاروان هەر کەمە
دەبێ ببوری دڵم پڕ غەمە
هەرکەس غەمی خۆی هەرخۆی دەیزانێ
ناکرێ بیڵێم ئەو غەمەی هەمە

کاروان بابەسبێ ئاخری قسەم
سوندت پێ ئەخۆم قەسەمبێ قەسەم
لە قسەی ڕاستیو حەق لام نەداوە
مەشهوورم (بێبەش) ئەمن ئەو کەسەم

---

▷ من ئەڕۆمو
ئەو لە جێگەم دائەنیشێ .
وەختێ لەگەل
دەنگی سەوزی «خالقی» دا
سوار ئەبمو
بەرەو شار ئەگەڕێمەوە
وەختێ لە پڕ
لەسەر ملەی تاسلووجەوە
لەو دیو جامی تاکسییەوە
«سلیمانی» م دەرئەکەوێ
مەگەر هەر ئەو لەم شەوەدا
لە دوورەوە
شەپۆلی درەوشانەوەی چاوەکانی
تیشکی مرواری بەر دەمی
هەلڕێژراوی
وەك کراسو کەوای بەرت
پوولەکە چن ..
مەگەر هەر ئەو
وەك تۆ جوان بێو بگاتە تۆو
بە هەردووکتان شیعری جوانیش
بدەن بە من .

# دیماهیا چیرۆکەکێ

● عصمت محمد بدل ●

ئەی شرینێ ..
هیڤیەك دناڤ دلێ مندا
د چقچقی
ئو من دگوت
تو چ جارا ژڤی ڤیانێ نانڤی
هەردێ لڤی
ڕۆژو مەهو سال لێ بورین
ئو من هەر گوت
ئو من چ جارا ئاگەهیا خوە نەفروت
ئو دلێ من هەر دکەلی

ئو هەر د سووت
سەر هندێ راما ل ژڤانێ
ما ل ژڤانا تە جانێ
نێ دیماهێ من گوت کانێ ؟
دڤێتن هەر ژبیر بکەم
چنکی خوە د هزرینت ڕۆژ
ئو چ بتن ئەز نە ڕۆژم
بەلێ شەڤم
ئو گەر وەبت دێ بڤێ رێڤە
هەر کەڤم .

# مێژووی شاری سلێمانی

بوو بە دووسەد سال شاری سلەیمانی
بناغەی دانا کوردی بابانی
نەوەی سەلاحەددینن بیزانی
سەلاحەددین بوو بە قارەمانی
چەن سەد سال لەمەوپێش بە ئاسانی
شکستی خستە سەلیبیەکانی
کەوتە ناویان بە پاڵەوانی
ئەو سەلیبیانەی کوشتو شکانی
کەبۆ ناو ئیسلام هێرشیان هانی
بۆ قودسو عەرەب موسلمانانی
بە شیرو شمشێر تیرو کەوانی
دەری پەڕانن کەوتە قڕانی
ئیسلام ڕزگاربوو سەرتاپایانی
لەشاری (تکریت) پەیدابوو گیانی ؟
ئەنجا بنچینەی شاری سلەیمانی
نەتەوەی ئەون کوردی گۆرانی
ئازاو نەبەردن دانیشتوانی
زمان شیرینن پیرو لاوانی
خزمەت گوزارن تێکرا بە جوانی
غەریب نەوازن بۆ غەریبانی
ناسراو بە شاری هەڵمەت قوربانی
داخوازیم وایە من لە یەزدانی
دووربن لە بەلاو دەردی نیهانی
بەخۆشی بژین بێ پەریشانی
دووچاریان نەبێت ئێشی پەنهانی
لەگەڵ کۆمەڵی موسلمانانی
کوردو عەرەبو باقیی گەلانی
ئەوی خزمەتکات بەبێ لایانی
خەباتکات بۆ بەرزی نیشتمانی
بەوانە دەڵێن دیارە ئینسانی
کەس بەبێ خزمەت هۆزی سۆرانی
نەبوە پێبگات بێ تێکۆشانی
تەمەڵ دیارە بەماڵ وێرانی
دەمێنێتەوە بەبێ گومانی
داخی گرانم لە هەندەرانی
کورد وەکو عیراق شیعرو پەخشانی
نایەڵن چاپکەن لەزۆر شوێنانی
گۆران بێو بادینانیو سۆرانی
دووعای چاك ئەکەم بۆ چاکەکانی
نایکەم بۆ بەدخوو بەد کردارانی
یا رەگەز پەرست پیس ڕەوشتانی
بەلەعنەتیەکەم شەڕ فرۆشانی
با « شوکری » خوابێ ڕۆژو شەوانی
باش ئەژین ئێمە کوردی ئاریانی

د . شۆ

1983/11/22

# بۆ نیشتمانەکەم

نعمت عبدالله
کربلاء

لە سەرەتای هەموو رۆژێ
کە ئاگادێم ..
وا دەزانم ئەتۆ هەر هەی
لەگەڵ چرپەی دڵدارەکان
دەڵێم ئۆخەی ...

کە ئاگا دێم ...
زۆر پەرۆشم بەرەو تۆ بێم
چەند حەزدەکەم
لەبەر چاوی ناحەزەکان
مل لە سامی ڕێگا بنێم ...

کە ئاگادێم ...
عەشقی مردن
هەناسەکانم تەنگ دەکا
بەڵام بێجگە ئەتۆی زیندوو
کێ لە مانای مردن دەگا ...

هەر چەند تەنیای ؟
بێباوەشی منە دەگری
بۆ دنیای وونبووی منە
ئەتۆ دەگری ...

ئای کە بەیانیش بەئاگا دێم
فریشتەی ئەم عەشقە کۆنە
هەڵدەنیشێ ...
لە سەر لق و پۆپی سەر ڕێم ...

# ئێستا هەر ئەوەم

محسن ئاوارە

ئەی هاوسەری پاک و ڕەسەن
ئەی هاوڕێی دەروون و تەمەن

لەو ساتەوەی گیرۆدەی تۆم
بەندەی ژێر چەپۆکی هەڵۆم

دەمێ هەوراز ، دەمێ نشێو
دەمێ هێمن ، دەمێ پەشێو

بەڵام ئێستاکەش هەر ئەوەم
ئەی ڕەزە سەوزە جوانەکەم

سبەو دووەو تا مردنیش
ئەتۆ ئەگۆڕێی نە منیش

هەر چەندیشە دوو درەختین
هەر درەختێ لە ئاقارێ
نەواللە ئێمە دوو ماسین
هەر ماسییێ لە ڕووبارێ

ئەم ڕووبارەو ئەو ڕووبارە
نابنەوە یەک لەم هەوارە

لەنێواندا جۆگە ماوە
دەمێ ووشکە ، یان پڕ ئاوە

بەشەو دزەو بەرۆژ دزە
لێک ئەبەستین گریەو بزە

جارجاریش جۆگە دەپسێ
دوور بوونەوەی تر دەڕەخسێ

وەی لە چەپۆکی پایزو
ئازاری گەڵاڕێزانی
وەی لە فرینی باڵندەو
تەنیایی درەختەکانی

بەڵام ئێستاکەش هەر ئەوەم
ئەی ڕەزە سەوزە جوانەکەم

سبەو دووەو تا مردنیش
ئەتۆ ئەگۆڕێی نە منیش

# هێلینا خەما

بۆ هەمی
خەم خۆرو بارگرانان

● هاشم محمد مصطفیٰ ●

دلێ منۆ
تەژی خەمۆ
خەم هەلگرۆ
ئەڤە سەرێ چەند سالانە
ل وارێ تە هەر تالانە
ژینا خۆشە غاردەو هەرێ
* ● *
دلێ منۆ
ماکا خەما
بەرێ خۆ بدە ئارمانجا دویر
فرەهـ بکە بێ هزرو بیر
بلندتربە ژ کەڤتنێ
ژ چەمیان و هەرفتنێ
باش موکم کە ڤێ باوەرێ
* ● *

دلێ منۆ
خەم هەڤالۆ
هێلینا خەما دیسا ڕزی
برینا دەما مایە تەزی
دارا بلند ژی دەرزی
* ● *
دلێ منۆ
خەم نیاسۆ
دوژمنن خەم‌و شادی
هەڤرکن ئەو ب بێدادی
لێ کۆ هەکە هاتڤە شادی
کەنگی دێ مینیتن یادی
* ● *

هۆ دلۆ
سوتیێ خەما
سوژە لۆ ڤێ هێلینێ
ژینا خۆشە دا بکەڤینێ
ژ دەریایێ ڤێ ئەڤینێ
ئاڤا بکە هێلینا شادی
ل ناڤ دلان
ب هێزا ملان
خودان بکە ب ڕەنگێ گولان
ب دەنگێ کەوان‌و بلبلان
ئاگەهدار بە
بپارێزە بپارێزە

## دوو چیڤانۆک بشعی

ئیسماعیل تاها شاهین
دهۆک
1982 / 2 / 22

(1)

رۆژەکێ گۆتنە بەقێ
برینە دەرو جیرانا
برینە کویسەلەو رەقێ
تو دبینی دەنگ ژ یەکێ تێ
خەلکی تەڤێ ئەڤە دڤێ
چ دەنگ‌و دورە لتە بانا
تە روو نینن بنێشن ؟!!
تە بهش بێخن جان‌و مانا ؟
تشتێ ژ بەقێ هاتی گۆ :
هەڤالێن من نە تو سەرن
خەلك بدە سەر دلێ وان
ئەڤن ، هوون ئاشکەرا دبینن
هەر دکەرن ، هەر دکەرن
لێ عەیبا من ئەز دقورم
کفنێ خوە بدەستێ خوە دبرم
باشە نێ ئەز هۆژی نەکم
بۆ خودێ بێژن دێ درم

(2)

رۆژەکێ گۆتنە چەمەکێ
چ بش‌بشە ژ خوە تینی
چی‌یە هەرگاڤ بگری‌و شینی
چرت لڤرو چرت لوێ
تە خێرە ئەڤ رەنگ بلەزی

خودێ خێرکە
خوەنە دینی
ئینا وی‌ژی ئاشەك هێرا
بدەنگەك مەلوول
بدەنگەگی پڕ شەواتی

سەرهاتیەکا رەزیل گێڕا
گۆ : کەلۆ ..
هەڤالێن من دارو بەر بن
دەرو جیران من بێ سەر بن
چاوا ناکمە قیڕو گازی
ما دێ چاوا برین دەر بن ؟!!

# دوو هۆنراوە

○

ڕازی

○

«بەهەڵە چون»

ئەوەی خۆشم ئەویست نەیبیست
ئەوەی منی ئەویست نەم ویست
ئەوەی چاوم ئەگێڕا بۆی
لەبەرچاوی بوم نەی بینیم
ئەوەی چاوی ئەگێڕا بۆم
لەبەر چاوم بو نەم بینی
ئەوەی ئەبوم بەقوربانی
دەم و لێوو باڵای جوانی
هەرگیز نەی بیست
وتەم جارێ
نەسکاڵام نەهاوارێ !

ئەوەی سێبەری دوی من بو
لە خۆشەویستیما ون بو
تەنیا هەر من مەبەستی بوم
تەزوی (وەتێری) هەستی بوم
ئەوەی کسپەی دڵی ئەبیست
ئەوەی خۆشی منی ئەویست
ئەوەی بێ من بێ ئارام بو
چێژی ژیان لای بێ تام بو
نەم ئەدواند خۆشم نەویست
نەم ئەلاواند کاتی پێویست

ئای کەئێستا پەشیمانم
ئای سەخت و قورسە تاوانم
لە پاش چی تازە نازانم
خولم ئەدا ئەم سورێنێ
تلم ئەدا ئەم سوتێنێ
کڵپەی ئاگری ویژدانم

ئەوەی هەناسەم سوار بو بۆی
ئەوەی لێوم بەباربوبۆی
ئەوەی ژینم پڕژاربو بۆی

سودی نەبو
گوێی نەداپێم
ئاوڕێکی
نەداوە لێم

## پایزی دڵ تەنگ

نم نم ئەباری بارانی
پایز
بەسەر گیای ووشکا
هەم شاخی سوتاو
تەڕی کرد گڵی سەر گڵکۆی
ئازیز
وەك تکەی خوڕی

فرمێسکی گریاو

قەدپاڵی تەنی هەورو تەم و مژ
وەك هەناسەی من
ڕوی لەباڵندەی ئاوارە کرد گرژ
کەوتنە کۆچ کردن

گەڵای درەختی وەراندە خوارێ
پەڵ و پۆی روت کرد
رە شەبا پەڕی ناسکی گوڵی
لەگەڵ خاك جوت کرد
هەوری چلکنی تۆزاوی و توڕە
ڕووی ئاسمانی گرت
چەخماخەی ڕقی وەك ئاگری کورە
سیمای جوانی برت

لێڵی کرد ئاوی سەرچاوەو کانی
ڕووباریش بو خوڕ
تینی پەیاکرد سەرمای شاخانی
بەردەلانی چڕ

سەرپۆشیان پۆشی (قەندیل) و (ئاکۆ)
لەڕووی هەوری ڕەش
تەمیان ئالاندە بەژن و باڵای خۆ
فریشتانی عەرش

# خاڵێکی نادیار

بکر باراوی
ئایاری / 1983

هەستایت و بەنابەدڵیەوە کەرەستەی کارەکەت ئـاخنیە نێو قەدی پشتێنە رەشەکەتەوە .. وەك بۆ زیندا نێکی تاریکت بنێرن ، لەگەڵ هەموو هەنگاوێکتا بۆ لەیـەکت لێوە ئـەهات . هەموو بۆ لەیەکیش کەمەکێـك لە گێنگڵی ژانـەکانی دەروونی خۆتت پێ دائەمرکانەوە . لەبەر خۆتەوە ئەتووت :ـ
[بـەلامدا لەکـاری وا ، کـە هێنـدە ژان تێکـەڵ بـە هـەوێنی خۆشەویستی ببێ ! .]

ناهەقت نەبوو ، زۆر جار فەرمانی وا ، شانی نابە دڵی پێ نەوی کردوی . زۆر جاریش خۆشەویستی کارەکەتی لە دەرونتا ئەگوشی و ژانی بەدەمارەکانتا ئەهێناو ئەبرد .
زۆر کەسیش لەکاری خۆی نابەدڵە : بەلام تۆنە ! چونکە پێنج ساڵەو تادێ ، چەکەرەی خۆشەویستی پیشەکەت ، وەك تەمەنی لادێت لەناختا رەگ دائەکوتێ .. تۆش پتر بە ناخی ئەوا رۆ ئەچویت . بۆیە کە هەمیشە هەستت ئەکرد بویتەتە «مۆم» یکی گـر گرتـوی ماڵە هـەژاریك و در بـە تاریکی ژوورەکـانی ئەدەی .

لەبـەر تیشکی هەمـوو توانـەوەیەکتـا ، پەنجـە کـوڵە وژەکانی دایکە پیرەکەت و زامی گڕی سەر تەنووری ماڵانی ، تیا ساڕێژ ئەکەیت ! بەلام فەرمانی کاری وا .. هەموو ئەوانەی لەیادا ئەسریتەوە . وەك کوڵە قورسەکەی دڵ و دەروونی پیرە دایـك ، درابێ بـە شـانی تـۆدا ، هـەنگـاوەکـانت لە دووت نـەئەهـاتن . بێ پەرواش ، چـاوت بەو خـەڵکەی ئـەمبـەرو ئەوبەری شەقامەکەدا ئەگێرا . هەریەکەیانت بـە ئەکتـەرێك ئەهاتە پێش چاو ، کە فەرمانی کارێکی بەسەردا درابێ و پەلەی جێ بەجێ کردنی لێ بکەن .
(کەواتە راستە گۆی زەوی شانۆیەکی فراوانە !)
بزەی سەر لێوی کیژێکی تازە خونچە ، بەلاتا تێ پەری ، وەك هەوالی سەرکەوتنی تاقی کردنەوەیەکی قوتابخانەی لەبن هەنگلیا تـوندکـردبێ ، سەرنجی راکێشـای . بەدوی خـۆیدا خستیتیـە گێژاوی دەریـای خەیـاڵێکی بێ پەیـەوە ، بـەدوی خاڵێکی نادیاردا وێڵی کردی .
(شانۆ چەند فراوان بێت .. هێندەش ئەکتەری تیا بەدی ئەکرێ . بەلام گرنگ سەرکەوتووترینیانە کە لە چ خاڵێکدا خۆی ئەنوێنێ ! ؟)

نەت ئەزانی ، فەرمانی ئـەمجارە بـۆ دیتنی کام شـانۆ ئەکانت پێ ئەدا ؟ گورو تینی مەچەکە ئەستـورەکانت لە کـام ژووری پۆشتەو رازاوەدا ئەخەیتـە کار ؟ یـان بە دووی کـام باریکە هێڵی «وایر»یکدا وێڵ ئـەبیت ؟ تالاوی چـەند تـوێپەڵە بزماری ژەنگاوی بەگەرووتا ساڕێژ ئەبێت ؟ .
کاتێ بیرت لەمانە ئەکردەوە .. وەك هەموو جارێکی دی ، دەمارەکانی لەشت کرژ ئەبوون . هێزی رووژانی دیکەی تیا بەدی نەئەکرا ! .

کاتێ سەرت هەڵبری ، لەنێوان کۆمەڵێك خانووی لەیەك چوردا و لەکولانێکی چوڵی سەرو بن گیراودا ، خۆت بینیەوە . سەرت هەڵبـری ، دیمەنی نـەخش و نیگارو پـەنجەرە چنـرا وەکانیان ، کە بە پێی یاسایەك داڕێژرابوون ، لە چاوەکـانتا

بەدی کرد . لەبەر خۆتەوە ئەتووت :ـ
[دوور نی یە ئەم نەخش و نیگارە ، هەزارو یەك نهێنی دڵدارانی بەیەك نەگەیشتووی ، لەدوو تویێ خۆیدا حەشار دابێ !]
یەکێ لەوتەلارانە قۆستیتیەوە . ترنجایتە نێو کۆمەڵێکی نەناسەوە .

بەڵام ئەمجارەیان ، بەرێرەوێکی تەسك و تاریکداو بە نێوان چەند ژوورێکی کڵۆم دراودا ، شۆر بوونەوە . گوێت بۆ ئەو دیو ژوورەکان هەڵخست . هەریەکەیان ناڵەو نوزە تاریکیەکی خەستتر ، پۆشیبوونی . تەمی ئەوتاریکیەش شالاوی بەرووتا ئەهێنا . گەرەکت بوو ببیە مۆمێکی کزو پەی بەتاریکی و نهێنیەکانی ئەو دیو بەرێت .

(کەواتە ئەمانەش هەر یەکەیان بەشێکن لەو شانۆ فراوانە !) دابووت لە شەقەی باڵی خەیاڵێکی بەرزەفرو ، بەرەو ساڵانی منداڵیت پەلت ئەکوتا . ووشەی دایکە پیرەکەت بوە پەلە هەوریك و بەسەرتا دائەباری و لە مێشکتا دەنگی ئەدابەوە .

(رۆڵە .. باوکت چەندین ساڵ شارو بەرەی ئەکرد .. دری بە تاریکی شەوەزەنگ ئەدا . کۆی نەئەکرد . پەلی لە ئەستێران ئەکوتا ! ماندوو نەئەبوو . تالەشەوێکی ئەنگوستە چاوا ، بووە ئەستێرەیەکی گەش و بەرەو خوار کشا !)
زرمەی دەرگایەکی پولایین ، تەمی ئەو خەیاڵانەی رەوانیتەوە .

فەرمانێکی رەق لەکەللەتا دەنگی دایەوە . لەژووری شانۆیەکی کڵۆم دراوی تاریکدا ، خۆت دۆزیەوە .
دڵت پتر کەوتە لێدان . تیشکی چاوەکانت لە گۆمی

تاریکی ئەو ژوورەدا ئەتوایەوە . بۆ ساتە وەختێك کپ بوویت . نوزەیەك لەسوچێکی شانۆکەوە .. بێ دەنگیەکەی ئەلەرانەوە . کەوتیتە خۆ . هەنگاوی درێژترت بەدەریای ئەوتاریکییەدا ئەنا . گوڕو تینی جاران .. جێی ژان و ئازارەکانی ، لەبازوە ئەستورەکانتا ئەگرتەوە . گەرەکت بوو پوختەی کار ، لە

سەرتەختەی ئەوشانۆیە هەڵرێژی ..
«مادام ئەم جۆرە شانۆیانە هەیە ! کەواتە گرنگ نی یە کێ خۆی تیا ئەنوێنێ ! !»

تا ئەهات خۆشەویستی پیشەو کارەکەت ، ئەبوە خۆشەویستی کیژێکی ناسك و وەك خرۆکەیەکی سوور ، بە کەلەبەرەکانی لەشتا سووری ئەخوارد . بەپەل کوتان خۆت گەیاندە سوچێکی ژوورەکە .

کەرەستەی بەرپشتێنەکەت خستەکار . تالاوی بزمارە ژەنگاویەکانت لابووە گەزۆو مازوو . ماندوو بون لەشلپەی دڵۆپەی باراناوی ژێر پێتا توایەوە .

کەوتیتە دوای هێڵی وایرێکی باریك و پیاهەڵزنایت . تاخۆت گەیاندە نێو دڵی گڵۆپێکی رەنگ زەردی خەم هەڵگرتوو . تا ئەهات بزەی لێوەکانت تێکەڵ بەو تیشکە کزە ئەبوو . تا بوە پرۆجکتورێکی سوورو دری بەو تاریکیەدا . بەپەلە لات کردەوە .. گوڵێکی ژاکاو ، سیمای قوتابیەکی بزیوی تیا بەدی ئەکرا . پرچێکی سەر ناو کەوتوی ئاڵۆزکاو ، کە لێشاوی لافاوێکی قوراوی رای ماڵیبێ . یەخەیەکی دادڕاو . جوتی خونچەی هەڵبڕو چقاوی تازە گەشاوە تیا ملیان بەلارەوە نابوو .
دووچاوی رەشی بەشەوارە کەوتوو .. وەك ژیلەمۆ بەناختا شۆر بوونەوە . شا دەمارەکانی لەشت خوێنیان تێزا .
وشەکان لەقورگتا خنکان . تەنها چاوە گەشەکانی بە کزیەکەوە بە رووی تیشکی رووناکی ژوورەکەدا ، هەڵبڕی . تا تینوێتی خۆی پێ بشکێنێ . هێدی هێدی پێڵوەکانی لەیەك نزیك ئەبوونەوە . وەك لە ئامێزی عاشقێکی سەر هەڵگرتودا ، سەر خەو بشکێنێ کزتر بوون ، بۆ پشووی چەند شەو ئیشك گرتن لێکی نان .

هەناسەیەکت هەڵکێشا .. تۆش وەك مۆمێکی کز بە دیاریەوە .. ووردە ووردە توایتەوە . تەنها ئەوەت بۆ کرا بڵێی :ـ
(کەواتە سەر کەوتو ترین ئەکتەر .. لەگچکە ترین خاڵی ئەم زەمینەدا خۆی ئەنوێنێ !)

# عیشق تا مردن

کەماڵ عەولا

... چیا تا بڵێی پانو بۆرو نەقوڵایە ، نەسەری دیارە نەبنی ، لووتکەو توقەڵەی بەتەمێکی سپی دووکەڵاوی داپۆشراو ، باوەشی بۆ چەند تۆپەڵە هەورێکی پچڕ پچڕی قان قان ، کرد بووە . هەورە خوڵەمێشی یەکان هەندێ جار دەستی یان لە مل شاخەکان دەکردو هەندێ جاریش بەرز ، دوور بۆ بنی ئاسمان هەڵ دەچوونو بە عاستەم دیار دەبوون . کزە بایەکی ساردو بەرسنگی تاوێرە زەقو شێتەکاندا دەکشاو ، سەوزە گیاو گولیلکە سوورو سپیو شینو مۆرەکانی قەرماڵو بنارەکانی دەهەژاندەوە ... بەفر بە تەواوی ڕەش ببووە . هەوایەکی بۆندار ئەو دەشتو دەرەی پڕکرد بوو .

بۆنی ڕێحانە کێویو جاترو گولزار ، خۆش خۆش ، تیژو تفت ، بۆنی شتی نوێو شیناتی نوێ دەبوژایەوە ڕۆڵو کونو کەلێنو بە پێدەشتەکەی خوارەوە دەڕۆیشت ئیدی هەموو شتێ ، زیندەوەرێ دڵو دەروونی پڕ دەبوو لە بەختەوەریو شادییەکی بێ کۆتایی . هەموو شتێ دەنگی لێوە دەهات وەئاگا دەبووە ... سۆزێکی نوێ لە ناخیا کڵپەی دەسەندو ئاوازێکی نوێ ، گۆرانییەکی نوێ ، لە دایك دەبوو . لە باسی عەشقو جوانیو نەمرێ دەدوا .

ڕۆژەکە گاڤەك دەکەوتە بن هەورو پاش بەینێك وەدەرکەوتەوە .. کە دەهاتەدەر تیشکە زیوینەکەی دەیدا تاشە بەردە سپی یەکانو دار بەڕووە تەڕە پەلك دەرکردووەکان ئەوەندەیتری سپیو کەسكتر دەکردن . چیاکەش ڕەنگێکی تێر تری بەخۆوە دەگرت .

لەو کاتانەدا هەردەتگوت بووکێکی ڕازاوەیەو شاییو زەماوەندی بۆ دەگێردرێ .

لەسەر ترۆپکی کەپکە شاخێکی ملەوەز ، کەوێك هەڵنیشتبوو . قاچە سوورو پەمەییەکانی لەسەر لێواری بەردە سپییەکە چریکە چریك دەچریکانەوە . قاسپەو قەپە قەپی دارو بەردی بێدار کردبووەو لە خەوی خۆش وە ئاگا هێنابوون .

دەنگەکە بەناو دۆڵو ئەشکەوتەکانا دەنگی دەداوەو دەلەرییەوە .. بێجگە لە هاشەی ئاوی جۆگەو کانیاوەکانو قاسپەی کەوەکە ، وورتە لە هیچ شتێکی دیکەوە نەدەهات . هەندێ جار قەدەرێ ڕادەوەستا ، ملە بە خاڵ جینجرەکەی بۆ ئەم لاو ئەولا ، بۆ بلندترین بەرزاییو هەڵدێر درێژ دەکردو ڕادەما ... گوێی ڕادێخستنو چاوەڕوانی وەلامێکی دەکرد . ئینجا لە ناوەوە دەجۆشاو وەك چیتر نەتوانێ خۆ ڕابگرێ دەستی پێدەکردەوەو تێی هەڵدەکردەوە . ئای چەندە گەرمو شێتانەی دەخوێند .

چ ئاوازێکی ناسكو دڵ تەزێن لەو گەرووە باریكو دەندووکە گچکەلانەیە دەهاتەدەر . کێ دەزانێ ؟ بە چ هەستێكو هیوایەك واگەرمو بەتێن ئەو گۆرانییە دەچڕێ . دلی شادەو بەختەوەر . بۆ هاوسەرو دلدارەکەی ... بۆ دنیای جوان .. خەمو خەفەتێکی کۆن ... کێ دەزانێ ! بەلام هێندە هەیە نیشانەی دەنگی سەربەستییەکی لە بن نەهاتووی سروشتە کە هیچ هێزێکی درندانە ناتوانێ ڕێی لێ بگرێو ئەو حەزە لە دڵیا بشواتەوە . ئای چەندە بەختیارە ئەو کەسەی بەئازادی دەمرێ .

لەپیش تاوێرە بەردێکا ڕاوکەرە چلێسو چاو هەمیشە برسییەکە ، شێوەی تفەنگەکەی لە سینگی کەوە دەنگ خۆشو ئازاکە گرتبوو . لوولەی تفەنگەکەی چەقاند بووە ئەو گەردنە پڕ خاڵو خەتە ڕەنگینەی ، ئێستا نا ئێستا پەنجە شایەتمانەکەی سەر پەلاپیتکەکە دادەگرێو لە سەر شاخەکەی هەڵدەدا ،

ئاخۆ بەرملی کەوی‌و بپەڕێنێ یاخود لە سینگ‌و بنەسکی کون بەدەرکا چاو قوچانێکە هەموو شت دەبڕێتەوە . ئەو هەموو حەزو ئارەزووە گەرم‌و گوڕەی ژیان ، وەك پۆلی‌یە ئاگرێکی سوور بۆوە بەرئاو بکەوێ‌و بکوژێتەوە ئاوا دەکوژێتەوە .

لە ماوەی هەناسە هەڵکێشانێکا وەك بلقێکی سەر ئاو فووی لێ بکرێ وەپووکێتەوە .

مەلی قوڕ بەسەر لەبەر ئێش‌و دەردی دڵی خۆی ئاگای لە هیچ نەبوو . ئەوەندە مەست‌و شەیدای کەژو کێوو بەهاری جوان‌و بەهەوەس ببوو مردنی لەبیر چوو بۆوە . هەر دەیزانی گۆرانی‌یەکەی ، لاوك‌و حەیرانەکەی بچڕێ‌و ئەوەی لە دڵی دایە هەڵی ڕێژێ ، لەو بلندی‌یە وای دەزانی هەموو شتێ خۆش دەوێ‌و ڕق‌و کینە لە گۆڕێ دانی‌یە . کلۆڵی‌و نەگبەتی بۆ خۆت‌و بەختی سیات ئەی باڵندەی نازدارو سەرشێت ، ئەی بەرگە گرتووی دەم بەفرو شەختەو تاکە سواری عیشق‌و گۆرانی .

لەو دەمەدا هەموو شتێ شادو بەکەیف‌و بێ‌وەی بوو گژو گیاو حاجیلە مل سپی‌یەکان ، دارو دەوەن ، تەیرو توار هەموو پێ دەکەنین‌و هەوای پاکی چیایان هەڵدەمژی ...

لەبنەبانی خانووچکەیێ ، لە گوندەکەی دامێن چیاوە ، کە ڕووەو پێدەشتە بەرەڵلاو سینگ فراوانە کە دەیڕوانی‌و قووت ببۆوە . دەنگێك ، کزکز ، خەمبار ، بۆنی نووزانەوەو ئێش‌و ژانی عەیامێکی پڕ مەینەتی‌و بێ‌کەس لێوە دەهات ، هاتە بەرگوێ . وەلامی کەوە ئازارەکەی سەر چیابوو . هی کەوێك بوو بۆ مانگێ دەچێ دەندووك بە داری قەفەزەکەی دەخشێنێ‌و پەلان پەڕو باڵەکانی پیس‌و بێزەوەر ، تووکی بن سك‌و سنگی دەرهاتبوو ڕووت ببۆوە . پەلە قاژەی مان‌و نەمانی‌بوو . چ هاوارێکی سەخت ، چ نالەو شیوەنێك لەو گیانە ساردو سڕە بچکۆلانەیەی دەهات . دەردی دیلی‌و دووری‌و دابڕانی لە چیاو بەردو ئاسمانی شین ، لە دۆڵ‌و نشێوو کانی ، لە پەلەوەری هاو جنسی خۆی ، هەمووی لەو دەنگە بە سۆزو باریك‌و بێ هێزەی‌دا کۆکرد ببۆوە . لە حەوڵ‌و پەل هاویشتنەکانی‌وا تێدەگەیشتی کە دەیویست بۆ دوا جار بفڕێ‌و بەرەڵلا بسووڕاباوە . باڵەکانی دوو سێ جار بەهێز لێك داباو بەرز بەرز ، بۆبن پەڕەکەی ئاسمان ، بۆ ناو هەورو تەمەکەی سەر چیا هەڵ چوو باو تێر تێر ، هەوای پاکی دەری‌هەڵ مژیبا .

سەیری دارو بارو سەوزایی کێوو لووتکە بەرزەکانی بکردایە ، جا خوای دەکرد لەوێندەر سەرەنگون دەبووو دەکەوتنە خوارێ . بەسەر تاشە بەردە نووك تیژەکان‌و هەڵدێرە تووش‌و ڕکەکانا خلۆر دەبۆوە . هەنجن هەنجن دەبوو . پریشکەی خوێنی بەردەکانی دەنەخشاندو گیانی دەسپارد .

لەگەڵ پەنجە داگرتنی ڕاوکەرەکە دەنگی تەقەیەکی گەورە ئەو ناوەی هەژاند . پێکای‌و لەسەر کەپکە شاخەکەی پەراند ، مەلی بەستەزمان هێشتا هەر لە حەوا بوو گیانی دەرچوو بوو . لەسەر هەڵدێرە هەزار بە هەزارەکەی فرێ‌دا لەشە بچکۆلەکەی بەڕووی تاشە بەردەکان دەکەوت‌و هەڵ دەزوقی‌یەوە تا لە بنی گەلییەکی قووڵ ، لە پاڵ تەڕاشێکا خۆی گرتەوە .

هەستایە سەرپێ ... هەناسەیەکی شادمانی هەڵکێشا بە هەلە داوان‌و بازدان شۆڕبۆوە خوار . کە دەستی دایە پەڕەکان‌و تووکە نەرمەکەی بن سکی هەموو خوێن بوو . لەسیقەدانەی دابوو لە پشتی چوو بووە دەر ... قەدەرێ لێی ڕاماو بەخۆشییەکەوە خستییە ناو هەگبەکەی پشتییەوە کە لاشەی دوو سوێسکەو کەوێکی تری تیابوو . لەدڵی خۆیدا گوتی (بوون بەچوار بەشی ژەمی ئێوارە دەکا) . بەسەر بلندی‌و لە خۆ بایی‌یەوە ڕێگەی ماڵەوەی گرتە بەر .

ئاسمان تا دەهات لێڵ ترو بۆرتر دەبوو ، ڕۆژ بەتەواوی کەوتبووە بن هەورێکی ڕەش‌و شین ، ڕەشە بایەکی بەتین هەڵی‌کرد . هاژەو هووروژمی بایەکە هەموو هێمنی‌و کپی‌یەکی دەگەڵ خۆی ڕامالی .

لەسەر لووتکە بەرزەکانا هەورە چرەکە تێك دەئالاو بایەکە دەگەڵ خۆ دێنا خوارێ . ئیدی باران دای کرد . بەڕێز نەباریە سەر سەوزە گیاو درەختە چرۆ دەرکردووەکان . گرمەو تریشقەی هەورەکە جار جار چیاکەی لە بن‌و بۆتکەوە دەجوولاندو ڕۆشنایی دەخستە دڵییەوە .

باریکە رووناکی‌یەك هەورەکەی دەکردە دوولەت‌و ئاسمانی شەق دەکرد ـ ئەوەش ڕقی ئاسمانی بوو دای دەڕشتە سەر زەوی ـ نالەو هاوارەکە بێ پسانەوە دەهات ، قاسپەی کەوەکەش هێشتا هەردەهاتە گوێ ، خوێنەکەش تێکەڵ بە ئاوی بارانەکە بووو بەناو جۆگەلەیەکی خوارو خێچ ، ڕۆچووە خواری بۆ ناو گەلییەکەو ناخی زەوی‌یەکە .

• صديق خالد هروری •

چیروك بۆ زارۆكا

# عەورێ كاروانی

عـەور كاروانینـەو رێڤنگێد رێكـا دویرن ، بـەلێ وەكی كاروانیا دەوار نینن و هەر ئەو بخۆ بارێ خۆ یێ گران دهەلگرن و دبن .. ئو بارێ وان ژی بارانە ، ئەو بارانا دباریتن .. هەرجهێ تێهنی دا پێ بهێتە ئاف دان و دارو بارو دەخل و دان پێ شین ببیت .

ڤێجا رۆژەكێ ژ رۆژێد بۆهارا درەنگ عەوری زانی ... زەڤیا جوتیاری یا تێهنی یـەو جو تیـاری چاڤێ وی لرێكێ یـە لهیڤی یا عەورا راوستایە دا بهـێن بۆ ئـاف بدەن ، دا پـاشی زاڕووكێد وی نەمیننە برسی .

ئینا عەور ژی سڤك رابوو خۆ لێكداو بارێ خۆ دانا سەر پشتا خو ئو قەستا زەڤیا جوتیاری كر . برێڤە عەوری برویسێد دژوار ڤەدان و ئەنیا خۆ كرە گرێ و خۆتێكدا رەش كـر دا چو پنسیێد عەورێ دی درێكێدا نەمینن و خۆ ژرێكا وی ڤەدەن ، چونكی یێ بلەزە دا زویكا بگەهیتە هنداف عەردێ جوتیاری ، بەلێ هندی عەوری لەزكرو بەزی .. نەگـەهەشتێ ، چـونكی زەڤیا جوتیاری گەلەكا دویر بوو .

ئینا عەور گەلەك وەستیاو هندی هاتێ ئێدی نەشیا برێڤە بچیت ڤێجا مەجبوور بوو بۆ خۆ سەحكەتە رێكەكێ ، داپیچەك بێهنا خۆ ڤەكەت ئو پاشی بدەتەڤە رێ .

ئینا سەحكرە بەراهیكا خۆ .. دیت چیایەكێ بلند لپێشیا وی‌یەو سەرێ خۆ یێ بلند كری ، گەلەك كەیفا وی هات و هەر دگاڤێدا گوت : ئەو كومتێ هە بۆ من خۆش قوناغە ئەز دێ بێهنا خۆ لوێرێ ڤەكەم .

وەختێ عەور نێزێك بووی گەلەك كەیفـا چیای هـات و گوت : ئەز گەلەكێ تێهنی بوویم و ئەڤە عـەورێ هات بـۆ من بارانەكا بۆشا ئینای .. !! هۆسا عەور نێزیك بوو گوتێ كومتێ : بلند .. هەكو تو بهێلی ئەز بێهنـەكێ بێهنا خـۆ ڤەكـەم ، ئەز گەلەكێ وەستیایم و رێكا من دویرەو دێ زویكا چم .. بەلێ چیای گوتێ : هەكو تو ئەوێ بارانێ بسەرێ مندا نەكەی ئەز ناهێلم تو لسەر سەرێ من دادی و بلندیا من دنـاف رە شاتیـا خۆ دا بەرزەكەی و ڤەشێری .. !

ئینا عەوری گوتێ : بلا ئەز دێ بارانا خۆ دەمە تە ، بەلێ پا ئەز ژ دوێرێ هاتیم لسەر خاترا جوتیـارەكی زەڤیا وی‌یـا تێهنی‌یەو زاڕووكێد وی دبرسینە ، ڤێجا ئەز دێ ئەڤی باری بۆ وی بەم ، پاشی دێ ئێكە دی بۆ تە ئینم .

وەختێ عەوری هۆ گوتی‌یە گەلەك كەیفا چیای ژی پێ هات و گوتی : وەرە لسـەر سەرێ من روینـەو بێهنا خـۆ تێر ڤەكە . ئو پاشی هەرە ،! چونكی ئەو گەلەكێ ژمن فەرترە .

ئینا ژ نویكا عەورێ بـار گران روینشتـە سەر كـومتێ چیای ، بیستەكێ بێهنا خۆ ڤەكر ئو بۆخۆ گەلەك منەت ژ چیای هەلگرت و گوتێ : پاشی جارەكا دی دێ بارێ خۆ بۆ تە ئینم ، هۆسا خاترا خۆ ژێ خاست و عەور كەڤتەڤە رێ و قەستا زەڤیا جوتیاری كر ...

وەختێ گـەهەشتی‌یـە هنـداف زەڤی‌یێ .. جـوتیـارو زاڕووكێد خۆ لهیڤی‌یێ نەو گەلەك كـەیفا وان هـات ، پێكڤە هەمیا دەست قوتان و گوت :

عـەور هـات و بـاران ئـینـا
زەڤـیـا تێـهنـی بـۆ ئـاف ئینـا
زارۆو دبـرسی بـۆ نـان ئـینـا

هـەر بـژیـن عـەور بـاو بـاران
هـەر بـژیـن كـاروانی و كـاروان
هـەر بـژین ئـاش ئـارو ئـاشڤـان

چـیـا دبـلـنـد عـەورا رادگـرن
دابـێـهـن دەن و بـشـێن بـڤـرن
ددویـریـن دویـر ژی نـامـرن

هۆسا عەوری بارێ خۆ یێ بارانێ هەمی بسەر زەڤیا وان دا باراندو زەڤیا وان تێر پێ ئاف‌دا ئو بۆ هەمیا كرە كەنی و خاترا خۆ ژێ خاست ئو بلەز زڤری و چوو ، دا زویكا بۆ چیای ژی بارەكێ بارانێ ببەت ...

# فرمێسکی ڕازی دەریا

دەریاکە وەك ساوا لە کەروێشکە خەودابوو . سەر ڕووی ئاوە شینەکەی تارایەکی ئاوریشمینی شینی کاڵی ئەنواند ، لە کەنارەوە هێدی هێدی ئەلەنجاو شەپۆلی ئەدا بەڕووی کەنارەکان داو بەچەقەنگی‌یەوە بەسەر یەكدا ، ئەشکانەوە . خۆر بالایەك لەسەر ئاسۆی ڕۆژئاواوە بەرز بوو ، ئاوریشمە شینەکەی ئەدرەوەشانەوە .

لێرەو لەوێ چەند پاپۆڕێك جوان‌و ڕازاوە ڕەگیان لە ئاوەکەدا داکوتابوو ، بەلام بێ‌جوڵەو ژیان ، لەکێلی گۆڕی بلند بلند ئەچوون . چەند بەلەمێك وەك چەند پنتکە تۆزێکی ناو دەفرێك مەرەکەبی ئاسمانی لە جوڵەدابوون .. بەو بچوکی و نزمی‌یەش پڕ لەژیان‌و چالاکی بوون ، هەندێکیان لەسەرخۆ ئاوەکەیان ئەشێلا ، ئەوانی‌تر بەگوڕ سکی دەریاکەیان ئەکێلا .. وکەفێکی ئالتونی‌یان لەقەراغ بەلەمەکان‌دا دروست ئەکرد دەستیان خستبووە ناو ئاوەکەوە ، کەف بگرن . کەفەکە تا ماوەیەکی کەم لەسەر لەپی دەست‌و پەنجەیان ئەمایەوە ، وەکو دڵۆپە ڕۆن ئەبریسکانەوە ، وردە وردە ئەتوانەوەو بە قامکەکانیان دائەچۆڕایەوە ناو دەریاکە . نەرمەبایەك تێکەڵ بەزەردەخەنەکەیان ئەبوو ، تابلۆیەکی بەهاری ئەنواند .

- [ئەو دڵۆپانەی بەرتیشکی چاوت ئەکەون ، لەگەڵ هەموو باران بارینێك‌دا ، باسی تۆم بۆ ئەگێڕنەوە] .
- [فرمێسکی دەریا ، شادی هێنە] .

- [هەوالی تۆ شادی هێنە] .

بزەیەکی گەش دەمو چاوە سپی‌یەکەی ڕۆشن کردەوە ... بەفری مانگەشەوی کوێستانی بیر مرۆڤ ئەخستەوە . بەلەمەکە چەند کەوانەیەکی فراوانی لە ئاوەکەدا کێشا ، لە پنتێکی کەنارەکەدا لە شوێن قەیاغەکەدا هێمن بۆوە ، گڤەو ڤرەی ماتۆڕەکەی نەما . شەپۆلی وردی کەنارەکە بەلەمەکەیان وەکو بێشکەی ساوا ڕائەژەنی . گوڵئەندام پێش کەوت ، دەستی بەکۆڵەکەکانەوە ئەگرت تا خۆی لە ڕاژەنینەکە بپارێزێ . هەنگاوی نایە سەر پێشکۆی بەلەمەکە ، شەپۆلەکان بەلەمەکەیان ئەلەراندەوە ، خەریك بوو لەترێك‌بات ، دەستێ لەکەنارەکەوە درێژ بوو ،

- [دەستت بێنە با نەکەوی] .

دەستێکی زبرو چڵکن‌و نینۆك درێژ ، دەستی ناسك‌و نەرم‌و سپی‌و قامکە درێژەکانی گوڵئەندامی گرتە دەست . لاوێك بوو سی‌و دوو ساڵە ، دەم‌و چاوو لوتەقوتەکەی دێز ، سەر لوتی سوورو هەتاو بردەڵە چاوەڕەشەکانی دوو ئەستێلکی پڕ لەڕازو ژان بوون ، گەرچی برژانگەکانی بزرکاو چڵك گرتووبوون ، پەرژینی دوو چاوگی گەش‌و بریسکاوە بوون . بالا بەرزو لاواز ، قژە درێژو نەرمەکەی بژو بزرکاو بوون . ڕیش هاتوو ، سمێڵ‌و ڕیش‌و لاجانگی تێکەڵ بوو بوون . جل‌و بەرگی ڕیشاڵ ڕیشاڵ‌و لەچڵکا بۆر بوو . پێستە هەتاو بردەڵە کەی لە قەلبەی جلەکانی‌یەوە سەرە تاتکێ‌یان ئەکرد . بەدەنگی نەرمی قوڕگێکی گریاوەوە ووتی :-

- [هەزاران دڵی بیابان ، بەهیوای بارانێکە] .

بە دوو چاوی پڕ لە فرمێسکی قەتیسەوە چاوی تێ‌برین :-

- [بەهارو دەریاو ڕازی مرۆڤ ئالودەن] .
ئەم بەدڵێکی گوشراو ، دەستێکی لەرزۆکەوە ، دەستی درێژ کرد بۆ تەوقەکردن :
- [چۆنی کاکە ؟ !]

- [وەك ئەمبینن ، ئالودەی چڵكو یادگاری پڕ سوێو جەنجاڵی ئەم بەندەرەم] .
- [خوابکا باش بی] .

دەربڕینی دەمو چاوی گۆڕا ، چاوەکانی گەشانەوە ، بزەیەکی هەڵبزرکاو کەوتە سەر لێوی کە نیوەی بە سمێڵ داپۆشرابوو

- [هەر ئەگەڕێتەوە ، هەر وەندە ئەبینی ، ئێوارەیەك وەك بوکی دەریا ، لە ناخی دەریاکەوە بەدەم لەنجەی شەپۆلەکانەوە ، گەڕایەوە ، سەری هەڵدا ، منیش دەستی بۆ درێژ ئەکەمو ..]
دایە قاقای پێکەنین ، لەپڕ گۆڕی بەپرمەی گریانێکی بەکوڵ .
- [بابەجێی بهێڵین تا زیاتر نەهەژاوە] .
- [ماڵئاوا] .

لەسەر خۆ بە جێیان هێشت ، بەڵام هەر ئاوڕی یان لێ ئەدایەوە . ناڵەو گریەی لەو دوورەشەوە ئەبیسترا . زۆری نەبرد بێ دەنگ بوو ، دیار بوو بەلەمێکی تر گەیشتە کەنار ، خۆی بەسەر پێشکوکەی داچەماندەوە ، دەستی ڕاگرت بۆ پەڕینەوەی کیژێکی تر .

ئەم پرسی :ـ [لەوە ئەچێ خەمێکی قوڵ تێکی دابێ !]
گوڵئەندام ووتی :ـ [ئەمەش یەکێکە لەو ڕازانەی دەریا ، کە تۆ هەمیشە باسی ئەکەی] .
چاوی بریە دەریای هەنگوینی پڕ لە ڕازی چاوەکانی ، بزەیەکیان گۆڕییەوە .
- [پاش دوو ساڵ ، ئازاری دووریو چاوەڕوانیی تاڵی خۆشەویستییەکی قوڵ ..] .
- [بە دوو سەد ساڵ چووە] .

تێنواڕینێکی لەیەك گەیشتن لەیەك ڕوانین .
- [لە سەرەتای هاوسەرییانەوە هانن بۆ ئەم شارە ، پاش چەند ڕۆژێکی پڕ لەتاسە کوشتن ، ئێوارەیەکیان ، کە دەریا هەژا بوو ، شەپۆلەکانی وەکو خەنجەر لەکێلانی قوڵاییەوە دەر ئەهێناو ئەیماڵی بەقەراغی پاپۆڕو کەنارو بەلەمەکاندا ...
دەریای هەژاو ئافرەتێکی سەرەڕۆیە . دولبەرەکەی پێ لەوە دائەگرێ کە بچنە ناو دەریاوە . ئەچن ، شەپۆلەکان بەلەمەکەیان ئەکەنە لانکی مناڵێکی گریانۆك . گەردەلوولو شەپۆڵو هەڵبەزو دابەز ناچاریان ئەکات بگەڕێنەوە کەنار]
گەیشتنە لای قەرەباڵغی لای ماشینەکان ، سەرکەوتن :ـ

- [ئی دوایی ؟ !]
- [لەکاتی سەرکەوتنو پەڕینەوەدا ، دولبەر لەترێك ئەداو ئەخزێو ئەخلیسکێتە ناو ئاوەکەوە ، شەپۆلە هەژاوەکان هەڵی ئەگرنو دووری ئەخەنەوە [مەلە نازانێ ، مەلە نازانم] ، خۆی هەڵ ئەداتە ناو ئاوەکەوە ، شەپۆلەکانی ئەمیش هەڵ گرن ، وەك دوو چۆلەکەی بریندار ، ئەکەونە لنگەفرتێو باڵەفرێ ، تا خەڵکەکە فریایان ئەکەون]
ماشینەکە وەستا ، یەك یەك دابەزین ، یەك یەكو دوو دوو بڵاوەیان لێکرد .

- [تا خەڵکەکە فریایان ئەکەون ، شەپۆلی دولبەر ئەکا بە قوتاو ئیتر کەس نایبینێتەوە ، کابرا نزیکتر بوو ، فریای کەوتنو نەیان هێشت بمرێو ژیا ...]
چرچییەك کەوتە نێوان برۆکانییەوە ، هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا :ـ
- [ژیا بۆ چەرمەسەرییو ژانو سوگواری ئەم ژیانەی] .
- [لەو کاتەوە ، ساڵێ زیاترە لێرە ماوەتەوە ، بە ڕۆژ ئەم کوچەو کوچە ئەکا ، ئێوارە هات ئەو شوێنەی کەنار ئەگرێ ، بەئومێدی گەڕانەوەی] .
- [دڵی بیابانی بەتەمای بارانێکە] .

خۆری دەم زەردەپەڕ ، کورەی خۆرنشینی سوور کردبوو ، شنەبایەك تێکەڵ بە خشەو خرتە وورشەی گەڵای دارە حوچەکانو جریوەی پاساری یەکان بوو بوو ، ئاوازێکی خەمباری پێك هێنابوو . ئاوازی ماڵئاواییو لێك دابڕان بوو ....




هەمزۆ خرە زەلامەکێ ژێهاتی یە ، یێ بەژن بلندێ کەیس ماقویلە ، دەپێ سینگێ وی وەکی حەلانەکی یە ، سەرێ وی مینا سەرێ گایە ، یێ قەلەوە ، لێ گەلەك بـ سەر کەلەخێ ویڤە دچیت ، سمبێلێد وی دبوشن ، دزەرن بـ سـەر سووری ڤـە دچن ، یێ کابرای ببینت دێ بێژیت ئەڤە خولـ دیوارەکی بدەت دێ ژ بن هاڤێت ، هەر ژدویر مروڤ دزانیت ئەڤە عالەمێ هەمیێ بـ میەکێ سمبێلێن خو حساب ناکەت ، کارێ وی ژی هـەمی دەما کارێ زاڤانیێ یە ، هەمی گاڤا دێ بێژی دەهواتا وی یەو یێ ژ سەرشویێ دهینن ، هەر سپێدەکێ جووتەکێ پێلاڤا یێ دهێ ی ، هـەر رۆژەکێ دەستەکێ شـەلوشەپکـا یێ دبـەر ، ناهێلیت دەرسوکـێن وی قرێـژ بگرن ، لێ شیتکـا وی هەر یـا رەشە ، نزا ئەو رەشاتی ژ زەوقا دلێ وی یە ، یان ژی ژ رەشاتیا دلێ وی یێ پیسە ؟

هـەمزۆ نـە ئاغـایە ، نـە مروڤـەکێ هەیی یـە ، ئەژی فەقیرەکێ لـ بەر خوراوەستایە ، لێ لـبەر وی ئاغا کی یە ؟ هەیی کی یە ؟ هەر خو بتنێ دڤێ دونیایێ دا دبینت ، لـ دەمێ لـ سەر عەردی بـ رێڤە دچیت دێ بێژی یێ منەتا لێ دکەت ، هەر وەکی وی درست کری و ئەڤ خەلکە هەمی لـ بن سیبەرا وی بـرێڤە دچن ، وەسا خو مەزن ددانیت ، دێ بێژی کا چی یە ؟ .

رۆژەکا پاییزیێ یا دی کورت ، هەمزۆی وەکی هەر رۆژ کارێ خو ژبیر نەکری یە ، دەستەکێ شەلوشەپکێن شەرنەخی یـێن نوی یـێن دبەر ، جـووتەکێ دەرسـوکا یێ دسـەرێ خو پێچای ، چەق چەقا پێلاڤا وی لـ سەر جەهدێن ئاخێ دێ بێژی کا یێ لـ سەر کیش جەهدا ڤێر کری بـ رێڤـە دچیت لـ کیش باژێری ، یێ خو ژبیرڤە بری کو یێ لـبەر چەمێن باب کالێن خو بـ رێڤە دچیت ، ئەو چەمێن پاییزێ بەلگێن وێ هند زەرکرین و هند هێلاینە کەسك ، کەسك و زەر تێکدا خەملین ، خو بـ سەرڤە نابەت کو خەلکێ ڤی گوندی یە ، ئەو گوندێ لـ سەر گرەکێ پڕی دار و بـار ، دار باهیڤ و تـوی و کەزان و ... لـ بنـەڤانـا زنارا چیای ، ئەو چیایێ وەکی شکێرەکی ئاسێ ، ئەو شکێـرێ پێ گوتی لـ نك خەلکێ گوندی ، یێ پڕی دەهبە و گەناور ، دێ بێژی هەمزو یێ ژ کەڤرێن ڤی شکێری ژ ناڤ وان دەهبا دەرکەتی ، نە خەلکێ ڤی گوندێ وەسا ژارە ، نـە کوڕێ ئـەحمەدێ سلویێ گاڤانە ، نە کوڕێ فاتا دەیکا ئێتیمایە ، ئەوا هەتا ئێڤاری لـ سەر کومڕاو لـ دیڤ شێن خەرتوکا دگەڕیاو خدامینیا خەلکی دکر .

هەمزو یێ بـ رێکا خو دچیت و تـزبیا دهـژێنت ... هند ئاگەهـ ژێ بو ، تومبێلەکێ کر چیڕو لـ نك راوستیا ، سەر ملێ خو یێ چەپێ زڤری بەرێ خو ددەتێ دەرگەهێ تومبێلەکا مەزن ڤەبو ئێکی خو ژێ هاڤێتە دەر .. زەلامەکە ، جلکێن وی هەمی یێن رەش دکەن ژ دۆن و گریزا ، شوفێرێ تومبێلێ بو ، سلاڤی هەمزۆی کرو گوتێ :

- «ئەرێ پسمام زەحمەت نەبیت رەژیا حەجی عەلی لـ کویرێ یە ؟ گوت بو من یا د رێکێ دا بەری تو بـ گەهیە گوندی» .
- (هەمزۆی بـ رەقی ڤە گوت :)
- من چ پسمام نینن ، ئەز ژ کوی و تو ژ کوی ؟» .
(شوفێری گوت :)
- «بلا بخێرا تەبیت ، باشە ؟» .

(هـەمزۆی دەستێ خـو درێژ کـرە لایێ راستێ ژ دەرڤەی جەهدێ ، بـ رەقی و چاڤ کرێڤە گوتێ :)
«ما تو یێ کورەی ؟ نێ ئەڤە لـ پێش چاڤێن تە ، لـ بن ڤێ دارێ»

(شوفێری شەرم ژ خۆ کرو گۆت :)
- «پانێ من گەلەك چاڤێ خۆ لـ ڕێکێ گێڕا بەلێ من نەدیت» .
(شوفێری گۆت)
- «ما هەوە چ های ژ دونیایێ هەیە ؟ هەمی گاڤا شۆل‌و شۆل ، دێ بەسە دێ ، هەوە چ بـ ڤی شۆلی ڤەهاند ؟»
(شوفێر ما هزرێد خۆ کرن : چەوا دگەل ڤی باخڤیت ؟ چەوا وەسا بتنێ دێ فەردا بارکەت ؟ چوو نك ڤەرداڤە ، پاش پێ لـ شەرما خۆ ناو گۆت :)
- «ئەگەر زەحمەت نەبیت ، زەحمەتە ژی بۆ تە دێ شێی هاری من کەی مە ئەڤ فەردە بارکربان ، کەس لـ ڤێرە نینە ، بلا بـ خێرا تە بیت» .
(هەمزۆی بـ نەرمی‌و دفن بلندی ڤە گۆت :)
- «بلا دێ هاری تە کەم ، بەلێ تۆ دزانی ئەز کی‌مەو ئەز چەندم ؟»
(دەنگێ خۆ هێش نزم تر لێ کرو دەستێ خۆ درێژ کرە چیای‌و گۆت :)
- «ئەز هندی ڤی چیای مە !»
ڕێکا خۆ گرت‌و چوو …

* * *

شوفێر نەما وەسا ، ڕاستە وەکی دبێژن «شۆل شێرە ، ئەگەر مەکر دێ بتە ڕیڤی» ، گرانی هەر ئەوە هندی مرۆڤی دەست پێ نەکری ، ئەگەر مرۆڤی دەست پێ‌کر دێ هەر ڕێکەك بۆ پەیدا بیت ، وی ژی بـ هەر حالەکێ هەی ، ئەگەر شڤانەکی هاری کری‌و ئەگەر ڕەزڤانەکی یان گاڤانەکی ، یان ژی خۆ ژنکەکێ ڕەژیا خۆ بارکرو جارەکادی لـ تومبێلا خۆ سویار بوڤە ، دوێ ڕێکێ‌را زڤڕی یا تێڕا چووی ، ژێهەلیێ وی بو ژووردانی … .

* * *

مەزن دبێژن :

«خودێ یا ڤی دەستی بۆ ڤی دەستی ناهێلیت» .

ڕۆژەك ژ ڕۆژێن زڤستانەکا ڕەش‌و تاری ، یا بـ مژو دۆمان‌و هڕو با ، چرفە چرفا بریسیایە ، دێ بێژی ڕۆژەکا بهاری یە ، عەورێن نزم بووین‌و وەسا یێن دچن ، دێ بێژی دیکێلەکە یسا ژ کومرەکێ بلند دبیت ، باران ژی وەکی گۆسکی یا لێ دکەت ، دێ بێژی عەسمانێ کون بووی‌و «چ یێ ڕوون خۆ تێ ناگریت» وەکی چەوا شرکێن ئاڤێ دپەقە بانادا دهێنە خار لـ ڕۆژەکا بهاری ، چاخێ تاڤ دبارن‌و دبانێن نەهێی یێن نەهسی‌دا دهێنە خار ، ئەو بانێن شینکی نە دیتێن‌و ئەو پەق هێلاینە ڤالاو مستەکا ئاخێ نەچوویێ .

لـ وێ ڕۆژێ نێزیکی ڕۆژئاڤایە ، شوفێرێ لـ تومبێلا خۆ سویارە بەر ڤ مال ، یێ بـ دلێ خۆ دچیت‌و ئاڤ یا ڤ جامێن تومبێلێ دا دهێنە خار ، ئەو جەهدا پڕی ئاڤ بووی‌و جۆك‌و جۆبار سەر نشیڤ دچنە خار ، شوفێرێ قەستا مال دکەت .. ئەگەر تشتەکێ حەلال بخۆو زاروکێن خۆ شۆل کری‌و ئەگەر ژی دەست ڤالا زڤڕی ، یێ دچیت ، هند دیت دەستەك لێ بلند بۆکۆ ڕاوستیت ، وی ژی بەرێ خۆ دایێ ، ڤێ سڕۆ سەرمایێ‌و ڤێ سەقەمێ ، ئەڤە کی‌یە وەسا یێ بێ دەولەت لـ بەر ڤێ بارانێ ڕاوستیای ؟ تومبێلا خۆ لـ نك ڕاوستاندو بەرێ خۆ دایێ ، مرۆڤەکێ کارکری یێ تەڕو تەلیسك بووی‌و یێ بوویە ئاڤ ، هۆ چاڤێ وی ڤێ کەت ؟ هەمزۆیێ کوڕێ ئەحمەدێ گاڤانە ، کوڕێ ڤاتا دەیکا ئێتیمایە وەسا مەلویل‌و دامای ، یێ دبێژیتە شوفێری :
- «ئەگەر زەحمەت نەبیت ، زەحمەتە ژی بۆ تە ، تە چەند دڤێت دێ دەمە تە ، تە ئەز گەهاندبامە مال ، ئەز دبێژم مە بەری نوکە ئێك‌و دوو یێ دیتی» .
(شوفێرێ دگەل دئاخڤیت‌و ئەو یێ دلەرزین ژبەر وێ سەرمایێ)
- «ئە ، مە ئێك‌و دوو یێ دیتی ، مانێ تۆ بخۆ دزانی ، دێ چەوا پارا ژ تە وەرگرم ؟»
(هەمزۆی سەرێ خۆ شۆڕکر ، نەداو نە ستاند ، پاش گۆت :)
- «تە چ گۆت ؟» .
(شوفێری باش مەیزاند ، بەرێ خۆ دایێ ، پاشی گۆت :)
- «بلا ، سەرچاڤا ، دێ تە گەهینم ، پا ئەگەر تە نە گەهینم دێ کێ گەهینم ؟ بەلێ پا تۆ بخۆ دزانی تومبێلا منا بچویکەو نەشێت چیایەکی هلگریت ، لـ من نەگرە ، چیا گەلەکێ گرانە» .

تومبێلا خۆ دا شۆلی‌و هاژووت‌و چوو .. وەکی چەوا هەمزۆی لـ ڕۆژا گۆیینێ ئەو هێلای‌و چووی .




ژنم ، لە دەمێکەوە منجەمنجی لەگەڵ دەکردم کە خانوویێك ، وەدەست بێنم ئەگەر چی کوخیش بێت ! هەتا لە خانووی مەردمدا لەمو لەو هێندە قسەو قسەلۆکمان گوێ لێنەبێ‌و نازو فیزی خاوەن خانووان هەڵنەگرین . ئەو منجە منجە ئەوەندەی درێژە خایەند تا ناچاری کردم ، بەقسەی ژنکەم هەر چۆنێك بێت خانوویێکی کۆن‌و نابووت بە قەردو فەرد بکرم .

دایکی جەنابی «مستەفا» لە شەش حەفت مانگی ئەوەڵدا زۆر خۆش‌حاڵ بوو ، بەڵام پاشان کەم کەمە دەستی بەرەخنەکردنێ کرد وەئەوشتەی کە لە هەمووشتان پتر ئەوی نارەحەت کردبوو ، نەبوونی تەلەفۆنێك بوو .

من بەرگەی هەر شتێك دەگرم ، بەڵام بەرگەی بۆڵە بۆڵی دایکی مندالان ! ناگرم ، کەوتمە دەست‌و پێیان بۆ ئەوەی تەلەفۆنێك بکێشم هەتا ئەو کەم‌و کوری‌یە گەورەیە لابەم کە برە برە بەنسبەت خاتون بەشێوەی گرێیەکی دەروونی خۆی نواندبوو !

بۆ ئەم مەبەستە لە «ئەحمەدئاغا»ی دەڵاڵی موعامەلاتی تەلەفۆن پارامەوە کە بەقسەی خۆی سی ساڵە لەم کارەدایەو ئەویش یەکسەر تەلەفۆنێکی بۆ کریم .

قسەو بریار هەمووی تەواو بوو ، پارەشم دایێ ، بەڵام هەتا مانگی ئەوەڵ لەگەڵ ئەوەشدا کە موعامەلاتەکە تەواو ببوو ، دەربارەی بەستنی تەلەفۆنەکە چ دەنگو باسێك نەبوو ، هەتا رۆژێکیان مەرحەباو برادەراتیم لە لایەك دانا ! وقەزیەم بە «ئەحمەد ئاغا» گوت ! «ئەحمەد ئاغا» بەهەمان ئاوازی تایبەتی دەڵاڵان کە هەموومان دەزانین گوتی :

- کاك مەحمود منداڵەکانم بمرن کاتم نی‌یە کە سەرێك لە دایەرەی تەلەفۆن بدەم ئەگینا ئەو ئیشە هەر دوو دەقیقەی پێ دەچێ !! بەم قسەیە مانگێکی تر ئارامم گرت ؟

هەموو رۆژێ چاومان لە چێرەی رەش‌و کریتی

تـەلەفۆنـەکە بـوو بەڵکـو ڕۆژێـك لە ڕۆژان زەنگێـك لێبـداو بەکارکەوێ ..

بەلام پاش تەواو بوونی مانگێکی ترکاسەی سەبرم پڕبوو تایبەت لە مـاڵ ، لەدەست گاڵتـەو گەپی دایکی منـدالان ئاو بەئیسراحەت لە گەرووم نەدەچووە خواری‌و تەلەفـۆن ببووە مایەی یاری پێکردنی بێمەعنای مندالان ! وسەرچاوەی تیز پێکردنی دایکی مندالان‌و هـاوسێیان ! ئـەو بوو کـە ڕۆژێك بەیانی زوو خۆم گەیاندە (بنکـەی موعـامەلاتی تـەلەفۆن)ی ئەحمەد ئاغاو زۆر بەجیدی پێم گوت :

- ئـەحمـەد ئـاغـا ، تـو خـودا ئـەوە ویـژدانـە تـائێستـا تەلەفۆنەکەمت بۆ نەبەستاوە ، دەبۆمی تەواوکە
- بە گیانی تۆکاك مەحمود ، دەتائێستا ش دەرفەتێکم نەبووە سەرێ لە دایەرەی تەلەفۆن بدەم ، ئەگینا ئەم جۆرە شتانە هەر دوو دەقیقەی پێدەچێ !!
- کەواتە خولامتم ، وەرە بابچین ئەم کارە دوو دەقیقەییەی کۆتایی پێبهێنە هەتا وەکو دەربەدەر نەکراوم !
- باشە وەرە بابرۆین ..

دوورلە ئێوە ! بۆ لای دایەرەی تەلەفۆن بەرێ کەوتین !!

لە دایەرەی تەلەفۆن ، بەیاریدەی پرسگە موراجەعەت بەیەکی لە ژوورەکانمان کرد !!

ئەحمەد ئاغا ڕووی تێکردە فەرمـانبەرێـك کە لە پشت یەکەمین مێز دانیشتبوو :

- ببورن گەورەم من دەمەوێ تەلەفۆنێك .. فەرمانبەرەکە بێ ئەوەی تەماشای عەریزەکە بکات کە ئەحمەد ئاغا بۆ لای درێژ کردبوو گوتی :
- بێ زەحمەت بیبەنە نهۆمی دووەم ژووری نمرە 13 .

لەسـەر پلیکـانـەکـانی پـەییـژە کـە بـەرەو ژوور بێ هەلدەگەڕاین ئەحمەد ئاغا ڕووی تێکردوو گوتی :

- وەرە .. نـەمگـوت هـەردوو دەقیقـەیپێ دەچێ .. !!

هەربگەینەچینی دووەم کارەکە تەواوبووە !

- تۆ بڵێیت هەتا نیوەڕۆ جێبەجێ بێت ؟
- نیوەڕۆی چی خاڵە ، وادەزانی بەگاڵتە پێت دەڵێم «هەردوو دەقیقەی پێدەچێ ؟ !»

تائێستاش کە تەلەفۆنت نەبەستراوە سووچی خۆتە (!) ئەگینا فەرمانبەران هەر عەریزەیان وەرگرتوو ، وەك بروسـك کۆتایی پێ دەهێنن !

لە ژووری نمرە «13»ی چینی دووەمدا پێنج شەش نەفەر لە پشت مێزە کانیان دانیشتبوون . یەکەم کەس کە سەری بڵند کرد ئەحمەد ئاغا بەخەندە لێوەوە پێی گوت :

- ببورە ، دوو مانگە تەلەفۆنێکم ...
- عاید بە (مستەفا خانە) !
- ئەو لە کوێ دادەنیشێت ؟
- لە ڕارەوی هەمان نهۆم .

بپرسە ، بپرسە ، ژووری مستەفا خانمان دۆزیەوە ، لە پشت دەرگای ژوورەکە ، لەوکاتەی ئەحمەد ئـاغا کـە سەرو قاڵبی خۆی ڕێك دەخست دەستی بەزمان لووسی کرد :

- ببنیت وەختی مـرۆڤ بـزانی بـە چ جـۆر دەچێتـە لای فەرمانبەران یەکسەر ئیشی بۆ جێبەجێ دەکەن ...

ئـەوانەی کـە دەڵێن لە دایـەرەکـانـدا کـەس ئیشی بـۆ ڕاناپەڕێندرێت لەکەمتەرخەمی خـۆیانـە ، جۆری قسـەکردن نازانن !! لەبەر هەندێش فەرمانبەرەکان لە گەڵیان گـرژو دڵ تـەنگ دەبن ، ئێستـا هەر بگـەینە پێش مستـەفا خـان ئیش تەواوە !!

دیـاربوو لە ژوورەکـدا چەنـد کەسێـك دانیشتبوون ، ئەحمەد ئاغا ڕووی لە فەراشی دەرگاکە کرد :

- برا کامە مستەفا خانە ؟
- کارتان لەگەڵ کامیان هەیە ، چونکە ئێمە چوار «مستەفـا خان» مان هەیە ؟ !
- هەر بە ئێمەیان گوتووە مستەفا خان ئیتر کامیانە نازانم !
- باشە ، فەرموون ئێستا چ کارێکتان هەیە ؟
- موعامەلەی تەلەفۆنێکمان تـەواو کردووە ، مـاوەتە سـەر بەستنی تێلەکەی .
- ئیشی ئەو بەستن نی یە ! ؟
- خۆ هیچ نەبێ قسەیەکی لێوە دەکات .
- باشە ... کاتی لە دەرگا دەچنە ژووری بە دەستی ڕاست ژووری یەکەم مێزی سێیەم .

لە ڕووکاردا سەروسەکوتی مستەفا خان وای دەنوانـد کەپیاوێکی خاوەن تەجرەبەو دنیا دیتەبێت .

ئەحمەد ئاغا سـلاوی کردو بـە ئەدەب‌و حـورمەتـەوە گوتی :

- گەورەم ، تەلەفۆنێك دوو مانگە ..
دیار بوو مستەفا خان قسەکەی بەچاکی گوێ لێ نەبوو ، لەبەرئەوە دەستی وەکو بلندگۆ ـ مکبرة ـ خستە سەر گویچکەی و گوتی :
- دەبێ زۆرم لێ ببووری ... نەختێ دەنگت بەرز بکەوە
ئەحمەد ئاغا زیاتر چووەپێش و هەمان قسەی بەدەنگێکی بلند دووپات کردەوە . مستەفا خان گوێی لە سەرتاپای فەرمایشتەکانی ئەحمەد ، ئاغا گرت و تەنانەت چەند دانە پرسیاریشی ئاراستە کردو پاشان کە چ قسەی پێ نەما دەربارەی بەستنی تەلەفۆنەکە ، سەری خۆی بادا و بەپێکەنینەوە گوتی :
- ها ، ها .. بەهەڵە چووینە !! دەبێ بچیتە چینی خوارەوە ، دەستی راست دەرگای دووەم
- گەورەم چوینەوێ ، ئێمەیان نارده ئێره .
- دیاره ناتانەوێ تەلەفۆنتان بگوازنەوە ؟
- نەخێر ، گواستنەوە تەواو بووە ، تەنها بەستنی ماوە ، مستەفاخان دەستی لەسەر هەنیەی داناو نەختێ بیری کردەوەو گوتی :
- بێ زەحمەت ژمارەی تەلەفۆنەکەتم پێ بڵێ .
ئەحمەد ئاغا بە دوو دەستان عەریزەکەی بۆلای درێژ کرد کە ژمارەی تەلەفۆنەکەشی تێدا نووسرا بوو .
مستەفا خان ماوەیەك تەماشای ژمارەکەی کردو پاشان لە ناکاو وەك کەسێك کەشتێکی بێتەوە یاد گوتی :
- ئەم تەلەفۆنە راگیراوە ؟ !
- چی ؟ !
- راگیراوە !
- سەهووی قوربان ، من بەخۆم پێشی گواستنەوەی موعامەلەکەیم تەواو کردوە !
ئاوازی وەڵام دانەوەی قەتعی ئەحمەد ئاغا کاری خۆی کردو مستەفا خان دووبارە عەریزەکەی خوێندەوەو گوتی :
- ئاها ... لێم ببورە : من (2) دووم بە (3) سێ خوێندەوە !! ، ئێوە دەبێ تەشریف کەنە چینی چوارەم ژووری نمرە 26 پاشان شتێکی لە پەراوێزی عەریزەکە نووسی و دایەوە دەست ئەحمەد ئاغا .
وەختێ لە ژوورەکە هاتینە دەرەوە ئەحمەد ئاغا گوتی :
- نەمگوت ئەم کارە هەر دوو دەقیقەی پێ دەچێ .
- من گومانم نی یە بۆ نیوەڕۆ تەواو دەبێت !
- پەح ، ئەوە چ دەڵێی . ئەم ئیشە تانیوەڕۆ دەجار تەواو دەبێت !
هەر چونێك بوو ، گەیشتینە نهۆمی چوارەم لە ژووری نمرە 26 دا خانمێك دانیشتبوو سوراوی لە لێوەکانی خۆی دەسوی عەریزەکەی وەرگرت و پرسی :
- ئەوە چی یە ؟ !
- عەریزەی بەستنی تەلەفۆنە !
خانمی مەئمور پێکەنی .. ئەحمەد ئاغاش پێکەنی .. پاشان خاتوون کە لولەی مکیاجەکەی دەخستە ناو جانتاکەی ئیشارەتێکی بۆ پەراوێزی عەریزەکە کرد کە مستەفا خان شتێکی لەسەر نووسی بوو و پرسی :
- کێ ئەمەی نووسیوە ؟
- مستەفا خان !
- چی نووسیوە ؟ !
- چ بزانم خاتوون ، کاغەز لە دەست تۆیە قەرموو بیخوێنەوە !!
- باشە ، کەواتە یەك دەقیقە مۆڵەتم بدەنێ ، بیدەمە هاورێکانم بیخوێننەوە !!!
- بۆ تۆ زەحمەت دەبێ !!
- تکا دەکەم کاکە ، زەحمەتی چی ، ئەرکی خۆمانە دەبێ یارمەتی خەڵك بدەین !
خاتون عەریزەکەی بردەپێش فەرمانبەرەکانی تر کە بۆی بخوێننەوە ئەحمەد ئاغاش دەستی بەئاخاوتن کرد :
- نەمگوت ئەوەندە رەش بین مەبە ! تەماشا کە هەر دوو دەقیقەی پێ دەچێ ،
هەر ئێستا بەس کەسێك خەتی مستەفا خان بخوێنیتەوە ئیش تەواوە !
خانمی فەرمانبەرو هاورێکانی دەکۆشان بۆ ئەوەی نووسینەکەی مستەفا خان بخوێننەوە چ تاقێکیان سەری لێ دەرنەدەچوو !
- نووسراوە : «ئەمر دراوەتە ئیجرا کە تەلەفۆنەکە هەراج بکەن»
- نە بابا «بۆ هۆبەی ... پارەدان رەوانە کراوە ...» !!!

- تا قوربانتان بم «بۆ دایەرەی گواستنەوە گەراندراوەتەوە .» !!!

بەم تەرزە هەر کەسێ بەتەرزێ پەروانزەکەی خوێندەوەو رافەی کرد . !

خانم گەراوەو عەریزەکەی پێ داینەوەو گوتی :

- کاتی خۆتان بە فیرۆ مەدەن ، گومانم هەیە کە ئەم تەلەفۆنە ساغ نەبۆتەوە ، بریویانە !
- نابێ خاتوون ، چونکە لە مەحزەرەکەی وادیارە !
- کەواتە تەشریف کەنە لای جەنابی علی !
- ئۆدەی لە کوێیە ؟
- نهۆمی سێیەم ژووری نمرە 24

وەختی کە دوو دوو بەسەر پلیکانەکانەوە دەکەوتین گوتم :

- ئەگەر هەتا نیوە رۆیێ تەواوبێت باشە ها .. !
- هەتا نیوەرۆ .. ؟ ! ئەم کارە هەر دوو دەقیقەی پێ دەچێ ! ئیستا کاتژمێر یازدەونیوە ، تۆ بەتەمای تانیوەرۆ لەم شوێنە بین !! ؟

لە چینی سێیەم ، چووینە بەردەمی جەنابی علی ، ئەویش یەکەم جار عەریزەکەی خوێندەوە پاشان تەماشایەکی سەروگوێلاکمانی کردو ئینجا لەگەڵ ئەحمەد ئاغا کەوتنە ئاخاوتن و گوتی :

- براوە !!
- چی براوە ؟
- تەلەفۆن !
- لەبەر چی ؟
- بە تاوانی تەشقەڵە پێکردن !
- بەکێ ؟
- چ بزانم بەنیادەمانی خودا زۆرو زەوەندن !
- کەی ؟
- ... تەحقیقم لەگەل دەکەی کاکە گیان ؟ دوو رۆژ لەمەوبەر .
- لە کوێ نووستوی باوکم ئەو تەلەفۆنە چوار مانگە گواستراوەتەوە وەتائیستاش نەیانبەستۆتەوە ، کتو دوو رۆژ لەمەوبەر قەشقەڵەی لەگەڵ کراوە ! ؟
- ئاها .. تێگەیشتم .. برۆنە چینی یەکەم ژووری نمرە یەك .

لەژووری ناوبراودا ، ئەفەندیێك لەپشت مێزەکەی خەریکی جوینی سمێڵەکەی بوو !

کە عەریزەکەی دیت تورە بوو و نەڕاندی :-

- بۆ چاوەدێری زنجیرەی موراجەعات ناکەن ، جەنابینە ئەم کارە هەر دوو دەقیقەی پێ دەچێ ؟ !

ئەگەر لە سەرە تاوە بهاتاینە ئێرە سەد زەمان بوو ئیشتان جێ بەجێ کرابوو ، ئەحمەد ئاغا بە زەردە خەنەیەکەوە گوتی :

- لێمان ببورن .. زۆرمان ئازار داون . ئێستا تۆ برا گەورەی ئێمەی دەبێ بەزووترین کات کارەکەمان بۆ راپەرێنی !
- تەنها دەتانەوێت ببەسترێت ؟ وەنی یە ! ؟
- بەڵێ ، بەڵێ !
- ئێستا هەموو چوونەوە بەیانی کاژێر دوو بگەرێنەوە عەریزەکە شتان دەبێ وەرگرتەبکرێت ، سەرۆکیش دەستووری لەسەر بدا ئەو حەلە من کارەکەتان تەواو دەکەم .
- نابێ هەر بەم تەرزە جێ بەجێی بکەی ؟ !
- نەخێر ، دەستووری سەرۆك پێویستە . زوێر نەبن هیچ نی یە ، هەر دوو دەقیقەی پێ دەچێ !! .

ئەحمەد ئاغا گەراوە لای من :-

- نەمگوت ؟ ! پاشان رووی لە لێپرسراوی بەستنی تەلەفۆن کردو گوتی :-
- باشە کەی بێینە لای جەنابتان ؟ !
- هێواری دەبێت ئیشەکانی ئەمرۆ تەواو بکرێت ! بەیانیش کە سەرۆکی بەرێز ، کۆبوونەوەی هەیە ... ئێوە دووبەیانی تەشریف بکەن .
- زۆر نی یە ؟
- نە بابا ، ئەوجارەی هەر دوو دەقیقە تاخیر دەبن !!
- باشە ، من ئیتر عاجزتان ناکەم ، ئیشە هی کاك مەحمودی هاورێمە ، خاوەنی تەلەفۆنەکەیە ، ئەگەر بەخۆی بێت خۆ چی تێدا نی یە ؟
- نەخێر ، چێ تێدایە بەسەر چاو ؟ !

ئێستا دوو مانگی رەبەقە کە هەموو رۆژ بەیانیان یەکەم کەس دەچمە دایەرەی تەلەفۆن و لە کۆتایی دەوامدا لەگەڵ فەرمانبەرەکان لە دایەرە دێمە دەرەوە بەلام بەستنی تەلەفۆن ، کە بەقسەی هەموویان «هەر دوو دەقیقەی پێ دەچێ» ئێستاو ئێستاش تەواو نەبووە !!

جەلال تەقی

# بوومەلەرزە و وێرانکاری

سروشت لای هەموان خۆشەویست و رازاوەیەو بەنیشانەی کامەرانی و ئاسوودەیی دائەنێین . کەلەبەهاردا دەشت و دەری سەوزو پڕلەگوڵ ئەوپەری خۆشیمان ئەداتێ ئەوە نایەت بەبیرماندا کە لەهەمان کاتدا رەنگە هەندێ شوێنی ئەم سەرزەمینە دووچاری کارەساتی لەناوبردن و وێرانکاریی سروشتی ببێ .... لەرۆژانی گەرمدا کەشەماڵی فێنك ئەدات لەروومان بیر لەوەناکەینەوە کەئەوشەماڵە لەلایەکی تری جیهاندا لەشێوەی گەردەلوول و بای روخێنەرو سزابەخشدا دەرئەکەوێ ... کەمرۆڤێکی بەساڵدا چوو پێمان ئەڵێ «بەردت لێ بارێ ! ..» گاڵتەمان پێ دێ و بەشتێکی نەشیاوی دائەنێین و ئەوە لێك نادەینەوە کەباپیرانمان دوورنیە رۆژێك لەرۆژان دووچاری سزای کەوتنەخوارەوەی هەزارەها بەردی وردو درشت بووبن لەئاسمانەوە بەهۆی کارەساتێکی کەردوونی یەوەو ئەورووداوە لەمێشکیاندا چەسپ بووبێ و ئەوقسە بەکاکڵە نایابەی لەشێوەی گفت و گۆی هەمە رۆژانەدا دروست کردبێ و نەوە لەپاش نەوە وەری گرتبێ .... بۆیە لای ئێمە سروشت هەمووی جوان و نازەنینە ، گوری لاوی و جۆشی خۆشەویستیمان لەگەڵدا بەراورد ئەکەین و بیر لە «تووڕە بوون» و جەزرەبەی ناکەینەوە کە ناو بەناو لەقوژبنێکی ئەم جیهانەدا مرۆڤایەتی دووچاری سزاو لەناوبردن ئەکات و ئەفسانەو کارەسات دروست ئەکات .

* * *

رووداوە سروشتی یەکان . بێ سنوورن و برانەوەیان نیەو هەمیشە لەشێوەی نوێدا دووبارە ئەبنەوە ...

ئەفسانەی زۆربەی گەلان پڕن لە هەواڵی وێرانکاری و کارەساتی سروشتی کەلە ماوەیەکی کەمدا ولاتی وێران کردووەو هەزارەها کەسی کوشتوە . مرۆڤی کۆن بەترسەوە سەیری کارەساتی سروشتی کردووەو خۆی لەبەریدا بێ هێزو بێ دەسەلات زانیوەو نەیتوانیوە بەرگری بکات ... هەر ئەوەندەی بۆکراوە لەخوا بپارێتەوەو بوتەوەی بەموعجیزەیەك رزگاری بکات . بەلام سروشت گوێی نەداوەتە پارانەوەو کاری خۆی هەرکردووەو وێرانکاری یەکەی بەردەوام بووە .

لەگەڵ ئەوەشدا مرۆڤ چاونەترسی بووەو هەمان سروشت کەبۆتە هۆی ترس و لەناوبردنی ژیانی لاخۆشەویست کردووەو هێزی داوەتێ و هانی داوە خەبات بکات دژی لەناوچوون ، بۆیە لەشوێنی شارو دێهاتی کاول کراو دووبارە بەهێزی بازوو خانووبەرەی دروست کردوتەوەو وردە وردە ژیانی تێدا تازە کردوتەوە ... ئەم خەباتە سەختە لەئەفسانەو هەواڵی ئەوکارەساتانەدا دەنگی داوەتەوەو نەوەی پاشەرۆژی لەهێزو توانای باپیرانمان ئاگادارکردوە .

.... یەکێك لەهۆ سەرەکی یەکانی وێرانکاری بوومەلەرزەیە کەلە ئەنجامدا لەچەند سانیەکدا وزەیەکی بێ سنووری سروشت لەناخی زەوی یەوە دەرئەپەرێ ...

ئەوە بەسە بلێین کەوزەی هەندێ جۆری بەهێزی بوومەلەرزە لەتەقینەوەی ملیونەها بۆمبای ئەتۆمی بەهێزترە .

زانایان هێزی بوومەلەرزە بە «پلە» ئەپێون . بوومەلەرزەی یەك پلەیی تەنها ئامرازی پێوانی تایبەتی تۆماری ئەکات . دوو پلەیی مرۆڤ هەستی پێ ئەکات ، لەپێنج پلەیی دا دیواری تیغەی مالان قرچە قرچ دەست پێ ئەکات و دەرگای پێوەدراوی کلیل نەدراو ئەکرێتە وەو سواغی دیوارو بن میچ ئەکەوێتە خوارەوە . بوومەلەرزەی ئەبێتە هۆی وێرانکاری و خانووی لەبەرد دروستکراو ئەرووخێنی و زەوی قلیشی تێ ئەبێ . کەگەیشتە دەپلە پردی پتەو ئەرووخێ و هێلی ئاسنی شەمەندەفەر ئەچەمێتەوەو ئەو بۆری یانەی بەژێر زەویدا رۆیشتوون لەیەك ئەپچرێن . بوومەلەرزەی یازدەو دوازدە پلەیی کارەساتی واگەورە ئەقەومێنێ کەلەماوەی چەند سانیەکدا رووی زەوی لەناوچەی رووداوەکەدا ئەگۆرێ ... شاخ لەجێی خۆی ئەترازێ و ئەکەوێ ، لەناوزەریادا دوورگەی تازە پەیدا ئەبێ و دوورگە ئەبێ بە ژێرئاوەوە ... زەوی قلیشی گەورەگەورەی تێ ئەبێ و ئەبێتە هۆی دروست بوونی دۆڵ و شیوی وەك قلیشە بەناوبانگەکەی دەوری رەواندزو گەلی عەلی بەگ ! ..

بوومەلەرزەیەکی لەم جۆرە لە «1899»دا دای لەکەنارەکانی ئۆقیانوسی هێمن لەبەری ئالاسکا داو بووبەهۆی

بەرزبوونەوەی (10 — 12) مەتری ناخی زەریاو کەناری زەریا بەرەو ئاوەکە کشاو لەهەندێ جێگای تردا بەدرێژایی چەند کیلۆمەترێك زەوی کەنار بوو بەژێرئاوەوەو لەشوێنی تردا بەپانایی چەند کیلۆمەترێك دارستانەکەی نزیك زەریا ئاوداپۆشین .

هەر لەوسالەدا بوومەلەرزەیەکی کوشندە لەکالیفۆرنیا ڕوویدا . زۆر لەوەپێش ، لەوێ بەدرێژایی چەند سەد کیلۆمەترێك لەنزیك ڕۆخی ئۆقیانوسەوە قلێشێکی گەورە بووبوە زەوی کەبەڕای زانایان لەئەنجامی بوومەلەرزەیەکی گەورەدا پەیدا بووبوو .

بوومەلەرزەکەی ساڵی «1899» قلێشێکی تازەی چەند کیلۆمەتر پانی لەتەنیشت ئەو قلێشە کۆنەوە دروست کرد .

پەیدا بوونی قلێش لەسەرزەوی لەهەموو شتێکی تر مەترسی پتر ئەخاتە دڵی مرۆڤەوە ، بەتایبەتی ئەوانەی بڕوایان بەئاین هەیە . بۆیە هیچ سەیر نیە کەلەکۆنەوە ئەوە باوە کەئەوترێ «زەوی ئەقلێشێتەوە بۆ ئەوەی گوناهباران قووت بدات» هیچ دوورنیە زاراوەی کۆنی کوردی «بەناخی زەویدا چووە خوارێ» لەئەنجامی پەیدا بوونی قلێشێکی واو قوتدانی چەند کەسێکدا نەهاتبێتە کایەوە .

لەڕابوردوودا بوومەلەرزەی وابەهێز ڕوویداوە کەبووە بەهۆی لەناوچوونی وڵاتی گەورەو حکومەتی بەدەسەڵات . لەم دواییەدا کۆمەڵێك لەزانایانی شوێنەوار پەردەیان لەسەر شارستانیەکی بەهێزی هیندی کۆن هەڵدایەوە کەبەسێهەم شارستانیەتی دائەنرێ پاش شارستانیەتی سۆمەری ومیسری کۆن . پێش چوار هەزار ساڵ لەدۆڵی هینددا دوو شاری گەورەی پێشکەوتووی «هەڕاپا»و «مۆهینجۆدارۆ» هەبوو . لەدەوروبەری هەزارو پێنج سەد ساڵێك «پ .ز» . لەپڕ ئەم دووشارە «ونبوون»و شوێنەواریان نەما ! زانای بەناوبانگی ئەڵمانی «ڕێیکی» لەکاتی لێکۆڵینەوەو پشکنینی ئەم ناوچانەدا نیشانەی بوومەلەرزەیەکی گەورەی بەدی کرد کەبەهۆی سەرەتای لەناوچوونی ئەوشارستانیەتە مەزنەی دانا ... بەڕای ئەوزانایە شاری «مۆهینجۆ دارۆ» بەم جۆرە لەناوچوە : لەئەنجامی ئەو بوومەلەرزەیەدا لایەکی زەوی بەرز بۆتەوەو بەری ڕوباری «ئیندە»ی گرتوەو بەمە ئاوەکەی پەنگی خواردۆتەوە . لەوەپاش بورکانەکان تەقیونەتەوەو کەرەستەی ئاگراوی فڕێداوەتە ناوی‌و بوە بەهۆی پەیداکردنی زونگاو قوڕی خەست‌و کۆمێکی گەورەی قوڕاوی ناوچەکەی داپۆشیوە .

دانیشتوانی شاری «مۆهینجۆرادۆ» بێدەسەڵاتانە دانەنیشتون‌و کۆڵیان نەداوەو شوێنەواری خەباتیان دیارە . ئەم قوڕاوە پێنج جار شاری داپۆشیوەو هەموو جارێك لەسەر کەلاوە ڕوو خاوەکان دووبارە خانوو بەرەیان دروست کردۆتەوە ، بەڵام نەمانی زەوی کشت‌و کاڵو بڵاوبونەوەی نەخۆشی‌و برسێتی ناچاری کردوون لەکۆتاییدا شار بەجێ بهێڵن . بەم جۆرە سروشت لانەیەکی گرنگی شارستانیەتی مرۆڤایەتی لەناوبرد .

لەم دواییەشدا کارەساتی وا بەڵام بەلاوازتر ، ڕووی داوە : لە 1912 دا بوومەلەرزەیەکی (12) پلەیی دای لەنزیك شاری «ئەڵماتاتا» و بەقسەی ئەوانەی ڕزگاریان بوو شاری کرد بەدۆزەخ ! .... زەوی ئەیلووراند ، لەقلێشە گەورەکانەوە دەنگی‌وەك هەورەتریشقە گوێی کەڕ ئەکرد ، خانوو بەپێوە نەما لوتکەی شاخی خوارووی شار لەجێی خۆی ترازاو کەوتە دۆڵەکەی تەنیشتیەوە . زانایان ئێستا ئەڵێن کەئەو وزەیەی لەناخی زەوی‌یەوە بوەهۆی دروست کردنی ئەو بوومەلەرزەیە بەهێزترین ئێستگەی دروست کردنی وزەبە «300» ساڵ توانای پەیداکردنی نیە ! ....

هێزی وێرانکاری بوومەلەرزە بە هۆی نزیکی سەرچاوەکەی لەسەر ڕووی زەوی‌یەوە ئەگۆڕێ ئەوسەرچاوەیە هەتا قووڵتر بێ لاوازتر ئەگاتە سەر زەوی‌و وێرانکاری کەمتر ئەبێ .

لەماوەی ملیونەها ساڵی تەمەنی زەویدا گۆڕینی زۆری بەسەردا هاتووە ، شاخ لەهەندێك شوێندا لەناوچوە ، شێوەو سنووری‌و شکانی‌و زەریا گۆڕاوە ، ناخی زەویش هەمیشە لەگۆڕیندا بوەو لەرزیوەو لەرینەوەکەی گەیشتۆتە سەر زەوی .

کەئەوترێ سەرچاوەی بوومەلەرزە مەبەست لەچەقی ئەو لەرزینەیە کەباسمان کردو تەقینەوەی تێدا ڕوونەدات وزۆر بەخێرایی قەبارەی گەورەی زەوی بەهەموو لایەکدا پاڵ پێوە ئەنێ‌و ئەیجوڵێنێ ... لەئەنجامی ئەمەدا ، لەناخی زەویدا قلێشی گەورە پەیدا ئەبێ‌و کەرستەی ئەو ناوچەیە بەخێرایی لەیەکتری ئەترازێ‌و لە یەك ئەدات‌و ئەو لەرینەوە بەهێزە دروست ئەکات‌و ئەگاتە سەر ڕووی زەوی .

سەرچاوەی بوومەلەرزە لەقووڵایی جیاجیادا پەیدائەبێ . هەندێ جار پەنجا کیلۆمەتر لەژێرو ڕووی زەویدایەو هەندێك جاریش لەقوڵایی دەکیلۆمەتر تێناپەڕێ

لەگەڵ ئەوشدا بوومەلەرزەی واتۆمار کراوە کە سەرچاوەکەی لەقووڵایی « 300 – 800 » کیلۆمەتردا بووە ، ئەو بوومەلەرزەیەی لەبەرەبەیانی 26 ی نیسانی 1966 دا دای لەشاری تاشقەندی سۆڤیاتی و هەشت کەسی کوشت و زیاد لەهەزارکەسی بریندار کردوپتر لەدوو ملیون مەتر چوارگۆشە خانووبەرەی ویرانکرد سەرچاوەکەی لەقووڵایی 7 – 8 کیلۆمەترا بوو !

زانایان لەمێژە ئەوەیان ئاشکرا کردوە کەلەجیهاندا دوو پشتێنە هەیە کەبوومەلەرزەی زۆریان لێئەدات : یەکەمیان لەرۆژهەڵاتەوە بەرەو رۆژئاوا لەدورگەکانی زوندەوە هەتا پەنەما بەشاخەکانی هیمالایاو پامیرو قەفقاس و نیمچەدورگەی بەلقان و شاخی ئەپەنی و پیرێنی دائەکشێ و بەئۆقیانوسی ئەتڵەسیدا ئەگاتە مەکسیک و ئەمەریکای ناوەراست . پشتێنەی دووەم ناوچەی ئۆقیانوسی هێمن ئەگرێتەوەو گەماروی یابان و فیلیپین و دورگە کانی هاقای و کوریلی ئەدات و ئەگاتە ئالاسکاو ئیسلاند او لەوێشەوە بەدرێژایی رۆخی رۆژئاوای ئەمەریکای سەروو و خواروو ئەکشێ و لەشاخەکانی کالیفۆرنیاو پیرۆ وشیلی یەوە بەرەو ئەنتراکیتدی قوتبی باشوور ئەروات .

بەرای زانایان پەیوەندی یەکی نزیک هەیە لەنێوان شوێنی ئەودوو پشتێنەیەداو دروست بوونی شاخ لە جیهانداو لەو باوەردان کەئەو شاخانەی لەدەوری دروست بوونی کۆتایی دان و بورکانیان تێدایە پتر دووچاری بوومەلەرزەی بەهێزدەبن ... لەگەڵ ئەوەشدا بوومەلەرزە لەدەرەوەی سنووری ئەم دوو پشتێنەیەشدا روودەدات و نموونەی زۆری لەم چەشنە لەساڵی (1091)ەوە تۆمار کراوەو بەرای زانایان لەسەر رووی زەوی شوێنێك نیە کەرۆژێك لەرۆژان دووچاری بوومە لەرزەی گەورە یان بچووکی هەست پێ نەکراو نەبووبێ و ساڵی نزیکی سەد هەزار جار روودەدات ، واتا رۆژی نزیکی «300» جار زەوی «ئەلەرزێ» ! ...

باهەندێك بگەرێینەوە بۆمێژووی رابوردوو : بوومەلەرزەیەکی قەراغەکانی زەریای سپی ناوەراست لەساڵی 526 ز . دا کاولکاری یەکی بێسنووری بەرپاکردو نزیکی دووسەد هەزار کەسی [illegible] . لەناوچەی «شان – سیی» ی چیندا لە 23ی کانوونی دوهەمی 1556دا لەئەنجامی بوومەلەرزەیەکی بەهێزدا «830» هەزار کەس لەناوچوو ، هەر لە ئەنجامی ئەم بوومەلەرزەیەدا زۆر لەو جوتیارانەی لەئەشکەوتەکاندا ئەژیان بەهۆی رووخاندنی شاخەکانەوە بوون بەژێرەوەو مردن .

وەك نووسراوە کۆنەکان باسی ئەکەن ، لەسەدەی پێنجەمی زاینەوە لەو وڵاتەدا هەرشەش ساڵ و نیوێك بوومەلەرزەیەك رووی داوە .

رۆژی یەکی تشرینی دووەمی «1755» سێ بوومەلەرزەی بەهێز شاری لیشبۆنەی رازاوەی کاولکرد ... بێجگە لەمە ، لەئەنجامی کاول کاری یەکەدا ئاگرێکی واکەوتەوە کەزۆر بەدرەنگ کوژایەوە ... زۆر کەس بەرەو کەنارە بەردینەکەی زەریا چوون کەخۆیان رزگاربکەن بەڵام دووەم «لەرینەوە»ی زەوی ئەوکەنارەی بەخەڵکەکەوە برد بەناخی زەریاداو نوقومی کردن .

لەیەکی ئەیلولی 1923دا بوومەلەرزەیەکی (8،2) پلەیی دای لەدورگەی «هۆن سیو»ی یابان و کاری کردە سەر زۆربەی شارەکانی ئەو ناوچەیە بۆ وێنە لەیەکێك لەگەورەپانەکانی تۆکیۆدا کە «95» کیلۆمەتر لەوێوە دوورە نزیکی «40000» کەس لەناوچوو ! لە «6»ی تشرینی یەکەمی 1948 دائەو بوومەلەرزە «7،3» پلەیەی شاری ئەشخابادی پایتەختی تورکمەنستانی سۆڤیاتی ویرانکرد ، زەوی مۆسکۆی دوور لەوەوە «0،4» ملیمەتر ترازاند ! .... بێجگە لەمە «30» گوندی ئێرانی سەر سنووری لەگەڵ زەویدا تەخت کرد .

لە 22ی مایسی 1960 دا بوومەلەرزەیەکی «11» پلەیی شاری ڤالدیڤیۆ پیۆتۆرمۆنت ، وکاستروی لەشیلی و یران کردو پترلە «50 000» خانووی بەدرێژایی «600» کیلۆمەتری سەرزەوی قەراغ ئۆقیانوسی هێمنی لەگەڵ زەویدا تەخت کرد .

بوومەلەرزەی ناوبراو هێندە بەهێز بوو بوو بەهۆی تەقینەوەی بورکانی «پویوی» . هەروەها بوەهۆی بەرزبوونەوەی ئاوی ئۆقیانوسی .... لەهەندێك جێگادا ئاوەکە دەمەتر بەرزبوەوەو شەپۆلی بەخێرایی «700» کیلۆمەتر لەسەعاتێکدا زەوی بەهەموو شتێکەوە داپۆشی .... ئەم شەپۆلانەی ناو ئۆقیانوس ئەوەندە بەهێز بوون گەیشتنە کەنارەکانی یابان و بەندەرەکانی شاری «هۆن – سیو»و «هۆ – کایدۆ» ی داپۆشی .

ئەو بوومەلەرزە 10 — 11 پلەیەی لە 27ی مارتی 1964دا لە ئەلیاسکای دا لە روبەرێکی «20 000» کیلۆمەتر چوارگۆشەدا ویرانکاری زیانبەخشی نواند .

بوومەلەرز ە سەیرە «11 — 12» پلەییەکەی چواری کانوونی یەکەمی 1957ی شاری «هۆیی – ئەلتای» کەئەکەوێتە

خوارووی مەنگۆلیاوە لەسەر رووی زەوی شەپۆلی گڵو خۆڵی لەشێوەی شەپۆلی ناوزەریادا دروست کرد !

کارەساتی بوومەلەرزەی ژێرزەریاو کەنارەکانی لەکارەساتی بوومەلەرزەی سەر ووشکانی ترسناکترە ، چونکە لەئەنجامی ئەمە وە شەپۆلی وا دروست ئەبێ ، هەرچەندە لەناوەراستی زەریادا لەمەترێك بەرزتر نابێتەوە ، بەلام کەلەکەنار نزیك ئەبێتەوە قەبارەی زۆر ئەگۆڕێو خێرایی ئەگاتە 700 — 900 کیلۆمەتر لەسەعاتێکدا !

لەساڵی 1755 دا ئەوبوومەلەرزەیەی لەوەپێش باسمان کرد چەند شارێکی پورتوگالی وێران کردو نزیکی «30 000» کەسی کوشت . لەناخی ئ ۆقیانوسی ئەتلەسیدا بوومەلەرزەیەك بنی زەریای شلەقاندو ئەو شەپۆلە «30» مەتر بەرزانەی کەناری لیشبۆنە نزیکی «60 000» کەسی لەناوبرد .

ئەو بوومەلەرزەیەی ناخی زەریا ساڵی 1960 دای لەشیلیو لەوەپێش باسمان کرد درەختی سەدەها ساڵەی لەرەگو ریشە هەڵکێشاو خستی ، قوروڵیتەی ژێر زەریا کە سەرئاو کەوت چەند کەشتییەکی بەجۆرێك داپۆشی لەوەپاشیش نەتوانرا رزگاربکرێن . شەپۆلی ئاو نزیکی شەش مەتر بەرز ئەبووەوە و ئەگەرایەوە دواوەو ناخی کەنارەکان دەرئەکەوتن و لەوەپاش بەهێزێکی گەورەترەوە خۆیان ئەدایەوە لەشارو لەئەنجامدا زیاتر لە «1700» کەس لەناوچوو ! ... ئەم بوومەلەرزەیەی شیلی هەمووخرۆکی زەوی جووڵاندو ناخی زەریای لەجێی خۆی ترازاندو شەپۆلەکان ، کەدرێژی یان 200 — 300 کیلۆمەتر بوو بەخێرایی «700 — 900» کیلۆمەتر ئۆقیانوسی هێمینیان بڕیو گەیشتنە یابانو دایان لەکەنارەکانی بەندەری «هۆنسیو»و «هاکایدۆ»کە «17 000» کیلۆمەتر لەسەرچاوەی بوومەلەرزەکەوە دوور بوون . ئەوەی شایانی باسە لە (2500) ساڵی رابوردودا (355) بوومەلەرزەی وابەهێزی ناوزەریا رووی داوە ، بەلام بوومە لەرزە لاوازەکان ئەگاتە نزیکەی «19000»

## «هۆی پەیدابوونی بوومەلەرزە»

لای زانایان ئاشکرابوە کەبوومەلەرزە کارێك نییە لەخۆیەوە دروست ببێ یان بەهۆی هێزێکی نادیارەوە پەیدابێ بەڵکو لەئەنجامی جووڵەی ناخیزەویدا رووئەدات ، بۆیە پێویستە لەهۆو شێوەو جۆری ئەم جووڵاندنە بکۆڵرێتەوە بۆئەوەی بتوانرێ کاتو شوێنی ئەم بوومەلەرزانە لەپێش روودانیدا بزانرێ .

هۆی ئەم جووڵاندنە زۆرن . لەناخی زەویدا گەرماییەکی زۆر بەرز کۆبۆتەوە . رووی زەوی لەبەر ئەوەی گەرمایی ئەداتەوە سارد ئەبێتەوەو بەو هۆیەوە چینە جیا جیاکانی زەوی پاڵەپەستۆی جیا جیایان ئەچێتە سەرو «گرژ» ئەبنو ئەکەونە جووڵە ! .

بەهۆی گەرمی ناخی زەوییەوە ئەوکەرەستەو مادانەی تیایدان لەدۆخێکدا نامێننەوەو قەبارەیان ئەگۆڕێو ئەمەش دووبارە ئەبێتە هۆی جولاندنی زەوی .

هێزی راکێشانیش هۆیەکی تری «جوولەکردن»ی زەوییە . قەبارەی قورسی وەك شاخ هەوڵ ئەدات رۆبچێتو قەبارەی سووك ، بەپێچەوانەوە ، ئەیەوێ بەرزبێتەوە ، هێزی راکێشانی مانگو رۆژیش هەندێك جار یارمەتی ئەمە ئەدەن !

خێرایی سووراندنەوەی زەویش هەمیشە لەگۆڕاندایەو ئەمەش دووبارە هۆیەکی تری «لەرزین» ی زەوییە !

گۆڕینی هێزی موگناتیسی زەویش هۆیەکی تری ئەو جوولەیەیە کەتووشی زەوی دێت .

لەم دواییەدا زانایان گەیشتونەتە ئەو رایەی کە رووداوو تەقینەوەی سەرخۆر هۆیەکی گرنگی پەیدابوونی کارەساتو رووداوی سروشتی سەرزەوین ... دەرکەوتووە کەئەوسالانەی تەقینەوە لەسەر خۆر زیاد ئەکات بوومەلەرزەش لەسەرزەوی پەرەئەسێنێ . لەم بارەیەوە دکتۆر سیمپسۆنی ئەمەریکی ، پاش لێکۆڵینەوە لە 22 هەزار بوومەلەرزەکە لەنێوان ساڵانی 1950 — 1963 داڕووی داوە نووسی : «ئەگەر تەقینەوەی سەرخۆر لە «50» وەبگاتە «150» تەقینەوە لەئەنجامی ئەمەدا رادەی بوومەلەرزە لەسەر زەوی 31٪ زیاد ئەکات !

چۆن تەقینەوەی سەر رۆژ کە «150» ملیون کیلۆمەتر لەزەوییەوە دوورە کاری وای تێ ئەکات ؟

وەك ئاشکرایە رۆژ بەردەوام کۆمەڵە ئەلەکترۆنو پرۆتۆن ئەهاوێژێو ، کەئەگەنە سنووری کارەبایی زەوی ، تەوژمی موگناتیسی دروست ئەکەن . تەوژمی بەهێزی لەم جۆرە خێرایی سوراندنەوەی زەوی ئەگۆڕێو ئەبێتەهۆی جووڵاندنی ناخی زەوییو پەیداکردنی بوومەلەرزە بۆیە هیچ سەیر نییە کە لە «15»ی تەموزی «1959»دا کەلەسەر رۆژ تەقینەوەیەکی بەهێز رووی دا لەهەمان کاتدا لەسەر زەویش ژمارەیەکی زۆر بوومەلەرزە پەیدا بووە .

شتێکی سەیرتر ! .... لەماوەی «900» ساڵ تۆمارکردنی کارەساتی سروشتی زانایانی جۆرجیا ئەوەیان بۆ دەرکەوتوە

کەزۆربەی بوومەلەرزەکان لەو ماوەیەدا لەوکاتەدا بوە کە مانگ لەشەوی چواردەدا بوە ! لەم بارەیەوە زانای «مانگ ناس» کەزیروف ئەلێ . «لەوەناچێ مانگ تەنێکی ئاسمانی سەربەخۆبێت ، بەڵکو زیاتر لەوە ئەچێ پارچەیەك بێ لەزەوی چونکە کەبوومەلەرزەیەك لەمیسر یان لەیابان روویەدات لەهەمان کاتدا لەسەرمانگ تەقینەوەی غازبەدی ئەکرێ .. لەکاتی بوومەلەرزەی سەرزەوی‌و دوای تەواو بوونی بورکان‌و جوڵاندنی سەر رووی مانگ پەیدا ئەبێ .... ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ کەبوومەلەرزەی سەرزەوی ئەبێتەوە هۆی گۆڕینی سەر رووی مانگ ! ... ئەمەش ئەمانگەیەنێتە ئەو ئەنجامەی **کەئەتوانین** بڵێین وەك چۆن هەندێك باڵندەو گیان لەبەر لەپێش روودانی بوومەلەرزەدا هەستی پێ‌ئەکەن‌و خۆیان ئامادە ئەکەن هەروەها مانگیش هەستی پێ‌ئەکات‌و نیشانە پیشان ئەدات ....

ئەمەش ئەبێتە ئاوێنەیەك بۆ ئەوەی بتوانین کاتی بوومەلەرزە لەسەرزەوی دەست نیشان بکەین ، بیروڕایەکی تر دژی ئەمە ئەوەستێ ئەویش ئەوەیە کەوەك لەوەوپێش باسمان کرد ، هۆیەکی گرنگی روودانی بوومەلە رزەی سەرزەوی مانگە . لەم دوو ڕایەکامیان ڕاستە ؟ ..... بەتەواوی نازانرێ ... هەرچۆنێك بێت ، ئاواتی مرۆڤایەتی لەم بارەیە وە ئەوەیە کە زانیاری بگاتە رادەیەکی وا هەموو کەسێك بزانێ کەی بوومەلەرزە روو ئەدات‌و ڕێگای خۆپاراستی بۆ دانێ . هەتا ئەگەینە ئەو رۆژە زانایان هەوڵی ئەوە ئەدەن کەخانوو بەرەو دامەزراوی وادروست بکەن بەرگەی «لەرزین»ی زەوی بگرێ‌و لە ژێر هێزی رووخێنەری ناخی‌زەویدا بوەستێ‌و نەڕووخێ بەسەر دانیشتوانیدا .... بەداخەوە لای ئێمە هێشتا بیر لەمە نەکراوەتەوە ! ...

### سەرچاوەکان


1 - کیسین : بوومەلەرزەو ئاوی ژێر زەوی موسکۆ - 1982 [بەڕوسی]

2 - تازییف : بوومەلەرزە - موسکۆ 1968 [بەڕوسی]

3 - فلۆرینتسۆڤاو سۆلۆنینکۆ : بوومەلەرزەکەی هۆبی - ئاڵتای . موسکۆ - 1963 [بەڕوسی]

4 - کولینوڤ‌و سیدۆرینکۆ : پلانێتی زەوی موسکۆ - 1977 [بەڕوسی]



صدیق شیخ محمود بەرزنجی


# بۆمبای نیوترۆنی

ئەگەر دانیشتوانی سەر ئەرز بیانزانیبایە کە چەکە ناووکی‌و ئەتۆمی‌یەکان چ هەڕەشەیەکی ترسناك لە سڕینەوەی ڕەگەزی مرۆڤایەتی‌و تێکرای هەموو زیندەوەرانی سەر زەوی دەکەن بەپیسترین شێوەی بەکۆمەڵ لە ناو بردن : دڵنیام کە لە ماڵەکانیاندا نەدەنوستن‌و بەخۆپیشاندان‌و مان گرتن شەقامەکانی هەموو شارەکانی جیهانیان سیخناخ دەکردو بەدەنگی نارەزایی‌یان ملیان بەشەڕخوازە ئیمپریالیستە ئاگر خۆشکەرەکانی ئەو جەنگە ناووکی‌یە شۆڕ دەکردو پەیمانی قەدەغەکردن‌و لەناوبردن‌و دروست نەکردنی ئەو جۆرە چەکانەیان پێ مۆر دەکردن .

لەڕاستی‌دا بۆمبای نیوترۆنی بریتی‌یە لەبۆمبایەکی هایدرۆجینی‌ی بچووك‌و بە بۆمبایەکی ئەتۆمی‌ی بچووك دادەگیرسێت‌و دەتەقێنرێت ، بەڵام جیاوازی ئەم چەکە لەگەڵ بۆمبای ئەتۆمی‌و هایدرۆجینیدا ئەوەیە کە ماددەی تەقەمەنی‌یە هایدرۆجینی‌یەکە لە بۆمبای نیوترۆنیدا پێکهاتنێکی شێوە جیاوازی هەیەو پێویستیشی بەپلەیەکی گەرمی‌ی کەمتر هەیە وەك لەوپلە گەرمی‌یە بەرزەی کە بۆمبا هایدرۆجینی‌یە گەورەکان لەتەقینەوەکەیاندا دەیانەوێت ، لەبەر ئەوە تەقاندنەوەکەی بۆمبایەکی ئەتۆمی‌ی بچووکتری دەوێت . ئەو کارەی کە بۆمبایەکی هایدرۆجینی دەیکات بەپێی تواناکەی دروست کردنی شەپۆلە پەستانێکی زۆر توندو پلەیەکی گەرمی‌ی زۆر بەرزە : کەنزیکە هاوتای گەرمی ڕۆژەو هەرچی‌یەکیش بکەوێتە چوارچێوەی سنووری تەقینەکەیەوە لەئانێکدا هەپرون بە هەپرونی دەکات‌و دەیسووتێنێت‌و دەیتوێنێتەوە . بەڵام بۆمبای نیوترۆنی ئەو ئەنجامەی کە لێ‌یەوە چاوەڕوان دەکرێت دەبێ بە پێچەوانەوەی ئەوەوە بێت ، ئەویش مانەوەی کەرەستەو شتە ماددی‌یەکانە بەپێی توانای بۆمباکە بەسەلامەتی بێ ئەوەی لەکاریان بخات‌و لەناو بردنی « تەنها ! » هەموو گیان لەبەرێکەو پێش هەموو شیان لەناو



بردنی مرۆڤە بەهۆی نیوترۆنەکانەوە کە تەزووی تیشکدەرن : لەناوبردنەکەش کتوپڕ نی یە ، بەڵکو بەمردنێکی لەسەرخۆی پڕ ئازاریان دەسپێرێت کە چەند ڕۆژێك یاچەند هەفتەیەك یا چەند مانگێك یان چەند ساڵێك دەخایەنێت بەپێی دوورو نزیکی ی ئەو کەسە لەشوێنی تەقینەوەی بۆمباکەوە . نیوترۆنە تاودراوەکان کاتێ کە بورجێکی پۆڵایی تانکێك یان زرێ پۆشێك دەسمن وەك هیچ شتێکیان نەهاتبێتە ڕێ : تەنها بڕێکی زۆر کەمی ووزەکەیان لێ کەم دەبێتەوە : ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە لە توخمی ناووکە ئەتۆم قورسەکان پێکهاتوون : وەئەوکەسەش کە لەناو ئەو تانکە یا زرێپۆشەکەدا دانیشتووە : هەروەك هەموو زیندەوەرەکانی تر لەبنچینەی پێکهاتنەکەیدا توخمە سووکەکانی وەك کاربۆنو هایدرۆجینی تێدایە : کە نیوترۆنەکانیش خۆیان بە مرۆڤەکانی ناو تانكو زرێ پۆشەکاندا دەماڵن بەشێکی زۆری ووزەکەیان دەدەن بەو ماددە توخم سووکانەو (هەرچەندە خۆیشیان زۆریان پێ دەمێنێتەوە) ئەوەش دەبێتە هۆی زیان پێ گەیاندنێکی زۆر یان کوشتنی سەربازەکانی ناو تانكو زرێ پۆشەکە کە دەبوایە پێشتر بەکاری تیشکە نیوترۆنی لەناو تانكو زرێ پۆشەکەدا بمردنایە بێ ئەوەی زیان بەتانكو زرێ پۆشەکە یا چەکەکانیان بگات .

هەر هەمان کاریش بەسەر ئەو کەسانەی تریشدا دێت کە لە سەنگەرو خەنەکەکاندا خۆیان دەشارنەوە ئەگەر بێتو لەژێر چینەگڵێکی 3 – 4 مەتری ی تەڕدا نەپارێزرێن . هەر ئەو نیوترۆنانە لەمەودای کاری وێرانکردنی تەقینەوەکە زیاتر دەڕۆنو بڵاو دەبنەوە (هەرچەندە هەندێکیش دەڵێن تەقینەوەیەکی بێ هێزی هەیە) : چونکە تەقینەوەی بۆمبای نیوترۆنی لەوانەیە هەورو گەردە لوولو تەپو تۆزێکی گەورە نەخاتەوە وەك لەوەی کە بۆمبای ئەتۆمی دروستی دەکات ، لەبەر ئەوە چەکی نیوترۆنی بەگوێرەی دڵی شەڕخوازان چاکترین چەکی ئەتۆمی ی بێوێنەیە کە بتوانن (وەك خۆیان دەڵێن) لەسنوورێکی دیاری کراودا بەکاری بهێنن بێ ئەوەی ببێتە هۆی هەڵگیرساندنی جەنگێکی ناووکە ـ ئەتۆ می ی جیهانی !!

### دروست کردنی بۆمبای نیوترۆنی

لە دروست کردنی بۆمبای نیوترۆنیدا پێویستە ئەم سیفەتانەی خوارەوە ڕەچاو بکرێت : ـ

1 – هێزی تەقینەوەیەکی بچووك .

2 – بارستێکی بچووكو قەبارەیەکی بچووك بۆ بۆمباکەو کەرەستەکەی .

3 – ڕێژەی کارە تیشکاوەری یەکەی لەچاو کاوول کردنە میکانیکی یەکەیدا گەورەو فراوان بێت .

4 – بەشی گەورەی تیشکە بەئایۆن کراوەکان تیشکە ناووکی یە کتوپڕەکان بێتو بەپلەیەکی کەمیش لەنیوترۆنەکان پێکهاتبێت . وەبەسێ سیفەتیش لەبۆمبا ناووکی یە ئاسایی یەکانی تر جیا دەکرێتەوە کە ئەمانەن : ـ

1 – بۆمبای نیوترۆنی لە بۆمبا هایدرۆجینی‌یە بچووکەکانەو هێزەکەشی نزیکەی یەك کیلۆ تەنە ؛ واتە هەزار کەرەت لەو بۆمبا ناووکی‌یانە بچوکترە کە عەیاری یەك میگا تەنە (یەك ملیۆن تەن) لەبەر ئەوە هەموو ساروخێك وەك نووکێکی تەقینەر دەتوانێ هەڵی بگرێت و هەموو فرۆکەیەکیش وەك بۆمبایەك دەتوانێت بەری بداتەوە .

2 – ئەو شەپۆلە پەستان و گەرمایی‌یەی کەلەتەقینەوەی بۆمبا نیوترۆنی‌یەکەوە پەیدا دەبێت هێزێکی توندی ئەو تۆی هەیە کە 10/1 ی هێزی بۆمبا ئەتۆمی‌یە ئاسایی‌یەکانی هاوجۆری خۆی دەبێت لەهەمان هێز ؛ زیان و کاوول کردنەکەشی بەهۆی پەستانە بەرزەکەی و تیشکە گەرمایی‌یەکەیەوە ڕوو دەدات و لەسنووری بازنەیەکی نیو تیرە (400 — 500) مەتری‌دا دەبێت .

3 – بەتەقینەوەی بۆمبایەکی نیوترۆنی‌ی یەك کیلۆتەنی لە 90٪ ی ووزەکەی بە شێوەی تیشکدانەوە دەردەچێت ؛ چونکە دروست بوونی نیوترۆنەکان 14 کەرەت دووجا زیاد دەکات ، وەبەکەمترین خەملاندنیش لەبازنەیەکی نیو تیرە 2500 مەتریدا هیچ جۆرە ژیانێك ناهێڵێت ؛ بەلام پاش ڕۆژێك یان چەند ڕۆژێکی کەم ڕێ‌ی چون بۆ ناوچەی تەقینەوەکە دەدرێت بەپێچەوانەی بۆمبا ناووکی‌یە ئاسایی‌یەکانەوە کە لەئەنجامی تەقینەوەکەیدا تیشکە ناووکی‌یەکەی ناوچەیەکی نیو تیرە 7500 مەتری پیس دەکات و ڕێ‌ی چوونیش بۆ ناوچەی تەقینەوەکە نادرێت بۆ ماوەی زۆر دوور .

دوای ڕەچاو کردنی ئەو خالانە ؛ ڕێگای سەرەتایی بۆ دروست کردنی بۆمبایەکی نیوترۆنی « واتە بۆمبایەکی ناووکە یەکبونی بچووك » کە توندی تەقەکەی یەکسانی کیلۆتەنێك یا کەمتربێت پێویستە داگیرسێنەرێکی ناووکە کەرت بوونی بچووك لەگەل قەبارەیەکی بچووکی ماددەکانی یەکبونە کەدا دروست بکرێت .

لە بۆمبا گەورە دوو قۆناغی‌یەکاندا ئەو تریشیۆمەی کە بۆ دروست کردنی نیوترۆنەکان پێویستە بەشێوەیەکی سەرەکی هەر لە بۆمباکەدا بە هۆی کارلێکە یەکبوونە پێشەکی‌یەکەی نێوان دیوتیرۆنەکانەوە دروست دەبێت ، بەلام بارگەی تەقینەوەی بۆمبا نیوترۆنی‌یەکە هەر بەلای دیوتیریۆمەکەشەوە بڕێك تریشیۆمیشی تێدایە ، لەبەر ئەوە لەتوانادا هەیە کارلێکردنە کە کتوپڕ بێت و لەئەنجامی ئەوەشدا ئەو نیوترۆنانە دەر دەپەڕن کە ووزەکەیان 14 ملیۆن ئەلەکترۆن ڤۆلت بێت ؛ بەوەش ووزەو هاوسەنگی‌ی بارستەکەی نزیك ئەبێت لەو سیفەتەی کە ویستومانە . وە دەشتوانرێت زڕ توخمێکی (ئایزۆتۆپ) بریلیۆم 9 بخرێتە سەر مادە کەرتەوەری‌یەکەی تەقەمەنی‌یەکە ؛ چونکە بەوە ژمارەی نیوترۆنەکان دەبێتە دوو ئەوەندە . تریشیۆم زڕتوخمێکی تیشکدەری هێدرۆجینە ؛ کاتێك کە لە فڕنە ناووکی‌یەکاندا نیوترۆنە گەرمایی‌یەکان دەگیرێنە لیثیۆم ئەو تریشیۆمە دروست دەبێت ، وە لەبەر ئەوەی تریشیۆم لەتەمەنە نیوەکەیدا کە 12/3 ساڵە تێکدەچێت ؛ کەواتە بۆمبای نیوترۆنی چاك نی‌یە بۆ ماوەی دوورو درێژ بەو چۆنی‌یەتە هەڵبگیرێت و بڕی ئەو ماددانەش کە لە دروست کردنی بۆمبایەکی نیوترۆنی یەك کیلۆتەنیدا بەکار دەهێنرێت بەم جۆرەیە :

- (دیۆتیریۆم - تریشیۆمی) پوخت لەباری کارلێکە یەکبووندا بن : 4/7 گرام دیۆتیریۆم ؛ وە 7/1 گرام تریشیۆم .

بێ‌گومان بەهۆی تێکچوونی تیشکاوەریشەوە بڕێکی زیاتر تریشیۆم بۆ ئەو مەبەستە دادەنرێت ، لەوانەشە بارستی مادە یەکبوونەکە (دیۆتیریۆم - تریشیۆم) بگاتە 20 گرام ؛ هەرچەندە لەوانەشە چەند جارێك زیاتر لەو بڕەش بەکار بهێنرێت و بگاتە 100 گرام ، بەلام لەم بارەیاندا هەموو ماددە ئامادەکراوەکە لەکاتی تەقینەوەکەدا قەت توانای کارلێك کردنیان نی‌یە ، جا لێرەدا بۆ وەدی هێنانی مەرجی قەوارە بچووکی پێویستە دیۆتیریۆم و تریشیۆمی خاوێن بەکار بهێنرێت بەڕێژەی 25 گرام دیۆتیریۆم و 75 گرام تریشیۆم بە پەستاوتنێك کە بگاتە نزیکەی 200 پلەی پەستانی جەوی . هەروەها داگیرسێنەری ناووکە کەرت بوونەکەش پێویستە تا لەتوانادا هەبێت بارستەکەی بچووك بێت ، وە بۆ ڕوودانی کارلێکە یەکبوونەکەش بەتەواوی پێویستە هەموو ناووکە کەرەکان ووزەیەکی ئەوتۆیان هەبێت بگاتە نزیکە (100 ك . ئە . ف) ، وە بۆ گەرم کردن و داگیرساندنی ئەو

تێکەڵەیەش پێویستە نزیکەی 4 گرام یۆرانیۆم 235 بەکار بهێنرێت ؛ ئەو برە کەمەش بە پەستاوتنێکی بەرزی ئەوتۆ لە لەحزەی داگیرساندنەکەدا دەپەسترێتەوە دەیگەیەنێتە بارستە مۆلەقەو تەقینەوە ناووکی یەکە دەست پێ دەکات ..

## تیشکە ناووکی یەکانی بۆمبای نیوترۆنی

تیشکە ناووکی یە کتوپری یەکان لەبۆمبای نیوترۆنیدا بەتایبەتی تیشکە نیوترۆنی یەکە هۆی ئەو زیانە سەرەکی یەیە کە دەیخاتەوە ؛ بەلام کاوول کردنە میکانیکی یەکەی و ئەو زیانانەی کە بەکاری شەپۆلە پەستان و رووناکی یە گەرمایی کەیەوە روو دەدەن تارادەیەك رێژەیان کەمە ، تیشکە ناووکی یە جێ ماوەکانیش لە بۆمبای نیوترۆنیدا گرنگی یەکی گەورەیان نیە هەرچەندە دەرکەوتنی ماددە تیشکاوەرەکان لەمیشدا وەك باری بۆمبا ناووکی یە ئاسایی یەکانی تر وایە ، بەلام ئەو هۆیانەی کەپەیوەندی یان بەچالاکی تیشکاوەری یەوە هەیەو لەئەنجامی بۆمبای نیوترۆنی یەوە دەردەچن ئەمانەی خوارەوەن :

1 – بەرێژەیەکی کەم نەبێت داگیرسێنەری ناووکە کەرتەوەری یە کە لەچالاکی تیشکەوەریدا هاوکاری ناکات .

2 – ئەو تریشیۆمەی کە لەکارلێکی ناووکە یەکبوونەکانەوە پەیدا دەبێت چالاکی یەکی تیشکاوەری بەرزی هەیە ؛ بەلام لەجێگەی تەقینەوەکەدا هیچ شوێنکارێکی نی یە چونکە بەسەر هەموو گۆی زەوی دا بلاو دەبێتەوە .

3 – چالاکی تیشکاوەری ی وەرگیراو لەئەنجامی تەقینەوەی بۆمباکەوە لەسەر رووی زەوی بەرەو کەمی دەچێت و بەخێرایی نامێنێت ؛ بە زۆریش لە نیوکلیرە تیشکاوەرە تەمەن کورتەکان بەو لاوە هیچی کە دروست نابن . جا مەترسی بۆمبای نیوترۆنی وەك چەکێکی تیشکاوەری لەو راستی یەوە دێت کە ئەو تیشکە لەنیوترۆ نەکانەوە پێك دێت ؛ ئەم نیوترۆنانەش لەناووکە یەکبوونەکانەوە دروست دەبن و وزەیەکی بەرزی ئەو تۆیان هەیە دەگاتە 14 ملیۆن ئەلەکترۆن ڤۆلت و بەکارلێککردنی لەگەڵ هەوادا کۆسپێکی زۆر رێبازەکەی دەگرێت ؛ بەلام لە گەڵ ئەوەشدا رێژەی نیوترۆنە خێراکان کەووزەکەیان لە 1 م . ئە . ڤ زیاترە بە گەورەیی وەك خۆی چەند سەد مەترێك دوور لە چەقی تەقینەکەوە دەمێنێتەوە .

## زیانە تیشکاوەری یەکانی بۆمبای نیوترۆنی

شوێنکاری تیشکە بەئایۆن کراوەکان لە رووی زیانە بایۆلۆجی (زیندەوەری) یە کانەوە تارادەیەك لەیەك دەچن ، جا ئیتر ئەو تیشکە گاما بێت یان تیشکی نیوترۆنی ، وەئەو دووری یە کەژمە تیشکیکی کوشندەی تێدا دروست دەبێت لەتیشکە نیوترۆنی یە دەرپەریوەکەی بۆمبایەکی ئەتۆمی یەوە بە (750 مەترە) خەملێنراوە ، بەلام لەبۆمبای نیوترۆنیدا ئەو دووری یە وەك تاقی کراوەتەوە زۆرترە ، چونکە ئەو نیوترۆنانەی کە لێ یەوە دروست دەبن ووزەکەیان زۆر ترە ؛ واتە خێراترن و ماوەیەکی زیاتریش دەبڕن لەوانەیە بگاتە (1 – 1٫5 کیلۆمەتر) .

زیانە تیشکاوەری یەکانی بۆمبای نیوترۆنی لەئەنجامی کارلێکە فیزیاوی یەکانی نێوان نیوترۆنەکان و ئەتۆمەکانی تەنە زیندووەکانەوە دروست دەبن ، هەر وەك چۆن لەجۆرەکانی تری تیشکە بەئایۆن کراوەکاندا روو دەدەن بەو جۆرەش جوولە ووزەی نیوترۆنەکان بۆ ئەتۆمەکانی زیندە تەنەکان دەگوێزرێتەوە ، وەگرنگترین ئەو کارلێکە نیوترۆنی یانەی لێرەدا روو دەدەن ئەمانەن : –

1 – بەیەکا مالینی نیوترۆنە جیرەکان لەگەڵ ناووکە سووکەکاندا بەتایبەتی ناووکی هایدرۆجین ؛ ئینجا پەرش و بلاو بوونەوەی ئەو ناووکانەی بەکارەبا بارگاوی کراوون بۆ ئاراستە جیاوازەکان وەك لەگەردە بەئایۆن کراوەکاندا روو دەدەن .

2 – دروست کردنی ناووکە ئاوێتەکان بەگرتنی نیوترۆنەکان ، جا لێرەدا ناووکە سرەوتەکان دەچنە بارێکی نەسرەوتی وورووژاوەوەو دەست دەکەن بەهاویشتنی نیوترۆنەکان یا پرۆتۆنەکان یاگەردە ئەلفا وەیان تیشکە بێتاو تیشکە گاما .

جۆرە جیاوازەکانی تیشکە بەئایۆن کراوەکان بەشێوەیەکی راستەو خۆ دەتوانن ئەتۆمی ماددە زیندەوەری یەکان و گەردیلەکانیشی بەئایۆن بکەن ، لە کۆتایی ئەوەشدا ئەو ئایۆنانە دروست دەبن کە هۆی زیانە زیندەوەری (بایۆلۆجی) یەکانەو تەنە زیندووە بەر تیشکە

نیوترۆن کەوتووەکانی پێوە گرفتار دەبن ، وە لە سەرەتای ئەم قۆناغەیشەوە کارە بایۆلۆجی یەکەی نیوترۆنەکان و کاری تیشکە بەئایۆن کراوەکانی تریش بۆ سەرخانەو سایتۆپلازم و ناووك و پێکهاتووە زیندەکانی خانە هیچ جیاوازی یەکیان لەنێواندا نی یە جگە لەرێژە کار لێکەری یە بایۆلۆجی یە گەورەکەی نیوترۆنەکان ، چونکە لەتیشکە بەرکەوتنی خانەکەدا بە تایبەتی کاتی دابەش بوونەکەی ئەگەر ژەمێکی 25 رادی ی نیوترۆنە خێراکانی بەرکەوێت بەسە بۆ ئەوەی زیانێکی گەورە لەبنچینەی دروست کردنی کرۆمۆسۆمەکان بدات و لەوانەشە ئەو زیانە چەند ساڵێك درژە خایەن بێت .

هەستەوەری خانەکانی لەشیش لەنێوان خۆیاندا بەرامبەر تیشکە نیوترۆنی یەکان جیاوازی یەکی گەورەیان هەیەو ئەم هەستەوەری یەش تارادەیەکی گەورە متمانە دەکاتە سەر خێرایی دابەش بوونی خانەکەو ئەو رەوگەیەی کە کرداری دابەش بوونی خانەکەی پێدا دەروات لەکاتی تیشك بەرکەوتنی خانەکەدا ، جا هەتا خێرایی دابەش بوونی خانەکە زۆر بێت هەستەوەری یەکەشی زۆرتر دەبێت . بۆ زانینی ئەوەش بڕوانە ئەم جەدوەلەی خوارەوە کە هەستەوەری ی هەندێك جۆری خانەکانی لەش بەرامبەر تیشکە نیوترۆنی یەکان روون دەکاتەوە :

**هەستەوەری خانەکانی لەش بەرامبەر تیشکە نیوترۆنی یەکان**

| پلەی هەستەوەری | جۆری خانەکان |
| --- | --- |
| بەرز | لیمفە خانە ، خرۆکە سووورە تازە پێگەیشتووە ناووك دارەکان ، مۆخی ئێسقان ، خانەکانی ناو پەردەی رەگەزە گلاندە کان ، خانەکانی پەردە لینجەکەی ریخۆڵە باریکە . |
| مام ناوەندی | خانەکانی پەردە لینجەکەی دەم و لووت و قورگ ، خانەکانی گەردبینەکەی چاو ، خانەکانی دەرە پەردەی دەمارەکان ، خانەکانی ناو پەردەی موو لوولە ووردەکان ، خانە کرکراگەیی یەکان . |
| نزم | خانەکانی سی و گورچیلەو جگەرو پەنکریاس ، خانەی ئەتەمەکانی ئێسقان و ئەتەمە بەستەرەکان ، خانەکانی لێواری مێشکۆکە . |

وە لەبەر ئەوەی هەستەوەری خانەکانی لەش بەرامبەر تیشکە بەئایۆن کراوەکان جیاوازە ؛ ئەو تیشکە بەئایۆن کراوەکانیش بەپلەی جیا جیا زیان بەجۆرە جیاوازەکانی ئەتەم و ئەندامەکانی لەش دەگەیەنن ، لەم خاڵانەی خوارەوەشدا کورتەی ئەو زیانە پزیشکی یانە دەخەینە روو کە لە ئەنجامی کارە دەرەکی یەکەی تیشکە نیوترۆنی یەکانەوە دروست دەبن بەپێی بڕی ژەمەکە لە لەشی ئادەمیزاددا :ـ

1 — ئەو کەسانەی دووری یان لەشوێنی تەقینەکەوە لە (0 — 500 مەترە) بێت و بۆ ماوەی (5) دەقیقە بەر ژەمە تیشکێکی یەکجار زۆر بەرزی تیشکە نیوترۆنی یە کان دەکەوون کە (20000 — 15000) راد بێت دووچاری شەلەلێکی کتوپڕی هەمیشەیی دەبن و عەقڵ و لەشیان لەکار دەکەوێت و توانای هیچ جوولەیەکیشیان نامێنێت ؛ بەو شێوەیە دەمێننەوە تا لەماوەی 24 کاژمێردا دەمرن ، واتە مردن لەو بارەدا رێژەکەی لە 100٪ و هیچ چارە کردنێکی پزیشکانەو یارمەتی یەك لەچنگی مردن رزگاریان ناکات .

2 — ژەمێکی بەرزی (15000 — 8000) رادی لە دووری (500 — 1000) مەترەوە ئەگەر بۆ ماوەی (5) دەقیقە هەر کەسێکی بەر بکەوێت لە کاری دەخات و هیچ جوولەیەکی بۆ ناکرێت و بەو شێوەیە بێ سوود وەرگرتن لەهیچ جۆرە چارەکردنێك رۆژێك یا دوو رۆژ دەمێنێتەوەو پاشان دەمرێت ؛ واتە رێژەی مردنی ئەم بارەشیان هەر لە 100٪ ە .

3 — ژەمێکی مام ناوەندی ی (8000 — 2500) رادی لە دووری (1000 — 1500) مەترەوە دەبێتە هۆی شەلەلێکی کتوپڕی تیژپەڕ (کاتی) بۆ ئەو کەسانەی کە (5) دەقیقە بەر تیشکەکە دەکەوون ، ئەو شەلەلەش (35 — 60) دەقیقە دەخایەنێت ، پاش ئەو ماوەیە زوربەی ئەو کەسانەی بەر کەوتوون هێزیان دێتەوە بەر ؛ بەلام هەست و جوولەیان شێواو دەبێت

تا لەماوەی 4( تـا 6) ڕۆژدا دەمرن ، وە ئـەو کەسـانـەی ئـەندامـەکانی لەشیـان دووچاری شێـواویی فەرمـانـە گەورەکان دەبێت بێهێزی لەشیان بەردەوام دەبێت تا ئەو کاتەی دەمرن ؛ دیسانەوە لێرەشدا ڕێژەی مـردن هەر لە 100٪ ە .

4 — ئەو کەسانەی لە دووری (1500 — 2000) مەترەوە بەر ژەمە تیشکێکی (2500 تـا 500) ڕادی دەکەوون بـۆ مـاوەی دوو کاژمێر دووچاری فەرمان شێواویی ئـەندامـەکانی لەش دەبن ، ئـەو بەسـەر هاتـەشیـان بـە پێی بـڕی ژەمـە وەرگیراوەکەو توندی ئەو نەخۆشییەی کە تووشی دەبن بۆ ماوەی جیاواز درێژە دەکێشێت ، چارەکردنی ئەم بارەشیان لەسـوودێکی کەم بـەولاوە زیاتـر نابـەخشێت و زوربـەی تـووشبووەکـانیش لەمـاوەی چـەنـد ڕۆژێـك یـا چـەنـد هەفتەیەکی کەمدا دەمرن ، لەم بارەشیاندا مردن لە 100٪ بۆ لە 50٪ یە .

5 — ئەو کەسانەی لە دووری (2000 تا 3000) مەترەوە بەر ژەمە تیشکێکی خوار سنووری مردن دەکەوون واتە (500 تا 100) ڕاد ؛ بێ توانایی لەبەجێهێنانی فـرمانی ئـەندامـەکانی لەشیاندا لە چەند بارێکدا نەبێت دەر ناکـەوێت ، ئەوەش دوو یا سێ هەفتە دوای تەقینەوەی بۆمباکە ؛ ئـەو دیاردە یەش چەند ڕۆژێك دەخـایەنێت و مـەترسی ی نـەخۆشی یـە تیشکـاوەرییەکـەش بەشێـوەیەکی مـام ناوەنـدییانـە دەگۆڕێت و زوربەی تـووشبووەکـانیش بەچـارە کردنێکی ڕێك و گونجاو چاك دەبنـەوە ، بەلام ڕوو دانی مـردن لەم بارەدا دەکەوێتە سەر : ژەمی تیشکەکەو باری تەندروستی کەسە تووشبووەکەو هەستە وەری ئەو کـەسە بـەرامبەر تیشکە بەئایۆن کراوە ووزە بەرزەکەو جۆری چارە کردنە پزیشکییەکەی ، ڕێژەی مردن لەم بارەشیاندا لە 50٪ تا لە 5٪ ە .

بەلام هەستەوەری بێچوولەی سکی دایك بەرامبەر ئەو تیشکانەی ووزەکانیان بەرزە تا تەمەنی سێ مانگی لەو پەڕی پلەی بەرزیدایـەو لەگەڵ گـەورە بوونیشـدا لە سکی دایکیدا ووردە ووردە هەستەوەرییـەکەشی کـەم دەبێتەوە ، ژەمێکی کاریگەری تیشکی نیوترۆنی لە دوو مانگی یەکەمی سك پڕیدا گـەشەی هێلکـە پیتراوەکـە دەوەستێنێت و پێـوە نـووسـان و گەشەکردنی هێلکەکەش بە وێلداشەکەوە دەشێـوێنێت و تێکی دەدات ؛ لەوانەشە ببێتە هۆی لەبارچوونی ، وە لەدوا قۆناغی گۆڕانی بێچوولەکەشدا کۆئەندامە تایبەتمەندەکـانی دروست کردنی ئەندامەکان و چوار پەل تووشی زیان دەبن ، بەلام چەقە کۆ ئەندامی دەماری و دەمارە چێوەیی یەکان بەرامبەر تیشکی نیوترۆنی زۆر هەستەوەرن ، زۆر جاریش ئاوسان و تێکچوونی مێشك ڕووی داوەو لەجیاتی مێشکە لەناو چووەکە شلەیەکی نائاسایی دروست بووەو زەرەبینی چاو پووکاوەتەوەو بڕبڕەی پشت تێکچـووەو قەبـارەی کەللە سـەریش بچووك بـۆتـەوەو ئەندامەکانی تریشی تێکداوە ، وەك دڵ و دەمارە خوێنینەکان و گلاندی دەرەقی و پەنجەکان و کۆئەندامی میزاو - زێ و جوگەی هەرس و پەیکەری ئێسکی .

خۆ ئەگەر بێچوولەکە لەنزیـك لەدایك بـوونیدا تیشکی بەرکەوت ؛ ئەوا بەزۆری تێچکـوون لەگۆڕانی عـەقلی شیـرە خـۆرەکەو ئـەو ئەنـدامانـەیدا ڕوو ئـەدات کـەپێش تیشـك بەرکەوتنەکە بەشێوەیەکی ئاسایی گەشەیان کردووە ، بە تاقی کـردنەوەش دەرکـەوتووە کـە ژەمـە تیشکێکی (5 — 10) ڕادی لەسێیەکی یەکەمی ماوەی سك پڕیدا بەسە بۆ تێکچوونی منالە لەدایك بووەکە ، بەلام لەسێیەکی سێیەمی سك پڕیدا دەبێتە هۆی دەرکەوتنی لووە پیس و ناپیسەکان لەو مندالەدا ؛ تەنانەت ئەگەر ئەو ژەمە تیشکە زۆر بچووکیش بێت و لە 1ر5 — 3) ڕادیش تێپەڕ نەبێت . بەلام ژەمێکی 20 ڕادی هەمیشە دەبێتە هـۆی گۆڕانە کتوپڕییەکان لە خانە ڕەگەزییەکانداو لەوانەشە بـە کاری ئەو تیشکە نیوترۆنییە کوڕو کورەزاکانیش دووچاری ئەو جۆرە نەخۆشی یانە ببن کەبێچوولەکان لەسکی دایکیاندا تووشی بوون . لەوەش ترسنـاکتر ژەمـە ڕاددەیەکی ڕەچـەلەکییەو ئـەوەش لەکەسێکـەوە بـۆ کـەسێکیـتـر جیـاوازی هـەیـەو بەئاسانیش سنووری بۆ دیاری ناکرێت .

## شێوەی مردن بەتیشکی نیوترۆنی

وەسفی شێوەی ئازارو ئەشکەنجەی ئەو کـەسانـەی کە بـە نیـوترۆن دەمـرن وەك لەڕاپۆرتـە ڕسمییە کـەی وەزارەتی بـەرگری ی ئـەمریکـادا نووسـراوە ساڵی 1945 بـەناونیشـانی « شـوێنکارەکـانی چەکـە ئـەتـۆمییـەکـان » بـەم جـۆرەی خوارەوەیە : ئەو کەسانەی تووشی تیشکەبەر کەوتنەکە بوون

پلەی ئازارو ئەشکەنجەیان لە چەند کاژمێریکدا جیاواز دەبێت ؛ هەر لەگەڵ ئەو ئازارەدا یـان دوا بە دوای ئـەوە سەرسـووڕ خواردن و رشانەوە دەست پێ دەکات ، ئـەنجا سـك چوون لە ڕۆژی یەکەم و دووەمدا لەگەڵ بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی ، ئەو سك چوونەش بەر دەوام دەبێت و شێوەیەکی توندو تیژترو ئـازاراوی دەگرێت و لەپێشـەوە وەك ئاو وایـەو دوای ئەوەش خوێناوی دەبێت . نەخۆشەکان لەڕۆژانی یەکەمدا تووشی کار ئەندام شێواوی و کۆکەو ماندو بوون و بێ هێزی و لەش داهێزران دەبن . لەوانـەشـە دوای قـۆنـاغی یـەکـەمی نـەخـۆشی یـە تیشکاوەری یە تێژەکە ماوەیەکی شاراوەش هەبێت و دوو یان سێ ڕۆژ بخایەنێت و هیچ نیشانەیەکی سەرەکی لە نەخۆشەکەدا دەر نـەکـەوێت ؛ لەو مـاوەیـەشـدا گـۆڕانێکی بنـەڕەتی لەلەشی نەخۆشەکەوا ڕوو دەدات ، دوای ئەوە هەمـان نیشانـەکانـە پێشوو دووبارە دەردەکەوێتەوەو لە جاران بەهێزتریش دەبێت و پلەیەکی گەرمی زۆر بەرزی دەبێت بەووڕێنەو بوورانەوەوە ؛ زۆر جاریش لەماوەی دوو هەفتەدا بەمردن کۆتایی دێت .

جگە لەوانە هەندێ نیشای تریش ڕەچاو کراوە وەك : ـ

خوێن بەربوونی ناوەوە لەکۆتایی هەفتەی یـەکـەمـدا ، ئاوسانی ناو دەم و هەو کردنی قورگ و قورقوراکەو تووك هەڵ وەرین لەکـۆتایی هـەفتەی دووەمـدا ، پووکـانـەوەی گـوێ و هێلکەدان و ڕەش بوونەوەی لەوزەتین و پەردە لینجەکەی ڕیخۆڵە ئـەستـوورە . جیـا لەوانـەش لووت پـژان و ڕەنـگ زەردی و بێ هێزی و کەم بوونەوەیەکی زۆری ژمارەی خڕۆکە سپی یەکان لە ئەنجامی لەناو چوونی مۆخی ئێسقان و لەهەندێ باریشدا بۆ نیشتوویەکی جەلاتینی ی دەگۆڕێت ، وە کەم بوونەوەی خڕۆکە سپی یـەکانیش مـانای تـوانای بـەرگری کـردنی لەشە دژی میکرۆبی نەخۆشی ؛ بەشێوەیەکی ئەوتۆ کە ئەو بەکتریایانەی لەجۆگەی هەرس و سەرپێستدا دەژین و ئاسایی لەسروشتـدا زیان بەخش نین ؛ لەوانەیە ببەنە سووری خوێن و خوێن ژاراوی بکەن . جا ئەو کەسانەی بەختەوەربن !! لەماوەی دوو تا چوار هەفتەدا لەو ئازارە سەخت و پڕ ئەشکەنجەیە ڕزگاریان دەبێت و دەمـرن ، بـەڵام ئـەوانـەی (1 ــ 2) کیلۆمـەتـرە لە جێگـەی تەقینەوەی بۆمباکەوە دوورن کتوپڕ نامرن و مردنێکی ئاسانیان دەست ناکەوێت و بەئازارو ئەشکەنجەوە ماوەی چەند ساڵێك پێوەی دەتلێنەوە ئەنجا دەمرن .

**خۆپاراستن و چارەکردن**

لەبارە ئاسایی یەکاندا چەند داوو دەرمـانێك بـۆ خۆپـاراستن لەتیشکەکان بەکار دەهێنرێت ، چونکە هەستەوەری بەرامبەر تیشکەکە کەم دەکاتەوەو تا پلەیەکی دیاری کراویش لەکاری تیشکە سینی و تیشکە گاما پارێزگاری یان دەکـات ئەگـەر ئەو دەرمانانە پێش بەرکەوتنی تیشکەکە بەکار هێنران . بەڵام ئەو داوو دەرمـانـە بـەرامبەر تیشکی نیـوترۆنی هیـچ سـوودێـك نابەخشن ، وەئەو هۆ پارێزگاری یانەش کە لەڕووی هـونەری پیشـەسـازی یـەوە لەسـەری ڕا هـاتـوون وەك ؛ پـەنـاگـە ئاسایی یەکان (ملاجئ) دووبارە بەرامبەر بۆمبای نیوترۆنی هیچ سوودێکی نی یەو بەر بەستی ناکات ؛ چونکە نیوترۆنەکان بـە ئاسانی ئەو ماددانە دەسمن (کون دەکەن) کە ئەتۆمەکانیـان قـورسن ؛ ئەو مـاددانەش بـەپلەیەکی زۆر کـەم نەبێت ڕێ لەنیـوترۆنـەکان نـاگرن ، بـەڵام ماددە ئـەتۆم سـووکەکـان نیوترۆنەکان بەربەست دەکەن و دەیان وەستێنن ، لەبەر ئەوە چاکترین هۆی خۆ پارێزی ئەو پەناگانەن کە دیوارەکانیـان لە ناوەوە بەچینە ماددەیەك داپۆشرێت کە برێکی زۆر هایدرۆجینی تێدا بێت ؛ وەك ئاو یا مۆمی پـارافین بـەئەستـووری چەنـد سانتیمەتـرێك و بـەو لەوحە کـانزایی یـانەش داپـۆشرێت کـە نیوترۆنە سستەکان بەچاکی دەمژن وەك کادمیۆم یان ئەلبۆر .

ئەم چارەو خۆپاراستنەش بۆ ئەو کەسانە دەبێت کە 2000 تـا 3000 مەتـرە لەجێی تەقینـەکـەوە دووربن ؛ بـەڵام ئـەو کەسانەی کە 2000 مەترە کەمتر دوور بن لەتیشکەکەوە ئەو هیچ داوو دەرمانێك یا هۆیەکی پزیشکانەی ناسراو ژیانیان لەمردن ڕزگار ناکات ، پزیشکایەتی ئێستاش هیچ هۆیەکی تایبەتی نی یە بۆ چاك کردنەوەی نەخۆشی یە تیشکاوەری یەکان ، لەبەر ئەوە چارەکردنی ئەو نەخۆشی یانە هەر بەو هۆ ئاسایی یانە دەکرێت کە لەسەری ڕاهاتوون .

---

تێبینی : ئـەو سەرچـاوانەی بـۆ ئەم کـورتە بـاسە سـوودی لێ وەرگیراوە :

1 — الاسلحة الحديثة اندريه بوفر ـ اندرو ستراتون هارق هوبلر ـ م . هـ . ترينغ
2 — الوقود النووی د . نعمان النعيمی
3 — القنبلة النيوترونية د . محمد عبداللطيف مطلب .
4 — مصادر الاشعاع في الطب محمد عاكف جمال

# خوێن و کۆمەڵەکانی

دکتۆر فیصل عارب بلباس

سەرنجدان و تێبینی سەرمایەی هەرەگەورەی مرۆڤن ، هەر لە سایەی ئەوانیش پێشکەوتن گەیشتۆتە ئەم ئەنجامەی ئێستای ، مرۆڤ هەر دیاردەیێکی سروشتی بەرچاو کەوتبێ سەرنجی راکێشاوەر کەم و زۆرێك بەدوای بنچینەیێکدا گەراوە ئەو دیاردانەی پێ لێك بداتەوە ، دیارە شتێکی نائاساییش کە پەیوەندی بە لەشی (مرۆڤ) خۆیەوە هەبێ ئەوپەری توانای تێدا خەرج کردووە . لەوانەی هەر لەزووەوە سەرنجی ئادەمییان راکێشاوە (خوێن) ە ، ئەوەش رەنگە لەبەر زۆری بریندار بوون و ئاسانی خوێن بەربوونی لەش بووبێ . ئاساییە کە تاکە ریش تاشینێك بەبێ خوێن رژان کەم جار ئەنجامدراوە .

لەگەڵ ئەمەشدا زانستی خوێن « خوێن ناسی Haematology » تا کۆتاییەکانی نیوەی یەکەمی ئەم سەدەیە بەجۆرێك پەرەی نەسەندبوو جێگەی متمانە بێت ، هەرچەندە لە سەردەمی گریکەکانەوە پەیوەندی خوێن بەگیان و نەخۆشی و رەگەزەوە بەستراوەو زۆر بیروباوەری سەیرو سەمەرەی لەبارە دروست کراوەو (هیپۆکرات)[1] یش خوێنی بەیەکێك لەو چوار شلەیە دانابوو کە لەش پێك دێنێت بە بیروباوەری ئەوکات ، بەلام تا دەهات شتی نوێتر روون دەبووەو هەندێ زانای تەجریبی پەیدا بوون و کەوتنە تاقیکردنەوەو بەراورد کردنی ئەنجامەکانی ، لەوانە دکتۆر جین دینیسی پزیشکی لویسی چوارەم لەفەرنسا ساڵی 1667 ز . یەکەم خوێن گواستنەوەی « Blood Transfusion » بەرێوەبرد ، هەر لەهەمان ساڵ دکتۆر ریچارد لۆیەری ئینگلیزی خوێنی گیانداریکی کردە لەشی خەلەفاویك و ئەنجامی هاندەری دەست خست .

ئەمانە زۆر بیروباوەری ئەفسوناویان خستە مێشکی خەلکەوەو هەر لە خەیالی ئەوەدابوون کە ئەگەر خوێنی لێهاتوویك یان بەهێزێك بدرێتە کرێتێك یان لەرولاوازێك دەبێ هێزو جوانی ئەوی پێ ببەخشێ ؟ .. خوێن گواستنەوە لەکاتی زۆر پێویست تادەهات پەرەی دەسەند بەلام ئەنجامی ترسناکی هەبوو ، جاری وا دەبوو خوێن پێدراو « Recepient » دوای ماوەیێکی کورت یان چەند رۆژێك دەمرد بێ ئەوەی بزانرێت بۆچی وەهۆی چیە کە خوێنی هەندێك بۆ هەندێکی تر دەست دەدا « Compatible » و بۆ هەندێکی تر ناگونجێ « Incompatible » تا لەسەرەتاکانی ئەم سەدەیە زانای ئەمریکی لاندشتاینەرو هاوەڵەکانی دوای تاقیکردنەوەی زۆر توانیان ئەنجامێك بێننە دەست .

## کۆمەڵەکانی خوێن : Blood Groups

خوێنی لەشی مرۆڤێکی ئاسایی و ساغ لە نێوان 5 — 6 لیترە کە پێك هاتووە لە شلەیێکی زەردباو پلازما « Plasma » ی پێ دەووتری و خرۆکەکانی تێدا دەسوورێنەوە ... خرۆکەکانی خوێن بریتین لە خرۆکەی سوور کە ژمارەیان لە هەر ملی لیترێك[2] لە خوێنی پیاوان [ 5٫5 ] ملیۆن خانەو لە ئافرەتان [4] تا [5] ملیۆن دەبێت ، ئەمە جگە لە خرۆکە سپیە هەمە جۆرەکان کە ژمارەیان دەگاتە [4] تا [10] هەزار خانە لە ملی لیترێك خوێن .

لاندشتاینەر روونی کردەوە کە رووی دەرەوەی خرۆکە سوورەکان مادەیێکی کاربۆهایدراتی بەسەرەوەیە کە بە ئەنتی جین « Antigen » ناو دەبرێ ، ئەویش دوو جۆرە یەکیان پێتی « A » و ئەوی دی « B » ی بۆ دانا ، هەر لەسەر ئەم بنچینەیەش خوێنی مرۆڤی بە گشتی کردە چوار کۆمەڵ چونکە خوێنی هەرکەسێك یان « A » واتە مادەی « A » ی تێدا دەبێت یان « B » یان هەردووکیان پێکەوە « AB » وەیان هیچێکیانی تێدا نابێت کەپێتی « O »[3] ی بۆ دانا . هەر یەکێك لەم ئەنتی جینانە دژە تەنێکی « Antibody » تایبەتی خۆی هەیە ، ئەگەر

دژەتەن لەگەڵ ئـەنتی‌جینەکـە پێکەوە لەخـوێندا هـەبن ئەوا دژەتەنەکـە دەبێتە هـۆی تێك شکـاندنی خـڕۆکە سـوورەکە لەئەنجامی کار لێك کردنیان ، بۆیە دژەتەنی A لەگەڵ ئـەنتی جینی A نابێت بەڵکو لەگەڵ B دەبێت واتـە ئەوەی کـۆمەڵەی خوێنی « A » یە دژەتەنی « B » ی هەیەو ئەوەش کـۆمەڵەی « B » یە دژە تەنی « A » ی هەیە[4] .

ئەم دۆزینەوەیە شۆڕشێکی گەورە بوو لە مەیدانی رزگار کردنی گیانی نەخۆشانی ئەم جیهانە ، ئەنجامی ئەم دۆزینەوەیە ئێستا بەشێوەیێکی یەکجار بڵاو لەهەموو سووچێکی سەر ڕووی ئەم زەمینە بەکار دەهێنرێ بۆ چارەکردنی ئەو کەسانەی خوێنیان کەمەو لەشیـان توانـای ئەوەی نیـە بە پێ‌ی پێـویست خوێن دروست بکـات ، یان ئـەوانەی بـریندار دەبن لەکـارەسـاتی ئـوتومبیـل‌و جەنـگ‌و بگـرە لەژووری بـرینپێچیتیش « غـرفـة العمليات » دا جاری واهەیە خوێن بەجـارێك لەبـەر دەڕوات ئەگەر نەخۆش خوێنی‌تری نەدرێتێ گیانی دەکەوێتە موڵەکە . هەر لەبەر ئەم هۆیانەشە پێویستە هەر کەسێك کۆمەڵی خوێنی دیاری بکرێت‌و هەمیشە لەلای بێت بۆ کاتی تـەنگانـە ، پێش هەموو برینپێچیتیەکیش بەچەند ڕۆژێك یـان چەنـد کاژمێـرێك گرووپی خوێنی نەخۆش دیار دەکرێت بەرێگەیێکی ئاسان کـە تەنها چەند خولەکێك دەخایەنێ . ئەم خشتەیەی خوارەوەش ڕوونی دەکاتەوە کە چ جۆرە خوێنێك دەدرێت بە جۆرەکەی ترو کامیان بۆی نابێت .

خوێن پێدراو

| | A | B | AB | O |
|---|---|---|---|---|
| A | + | − | + | − |
| B | − | + | + | − |
| AB | − | − | + | − |
| O | + | + | + | + |

خوێن بەخش

نیشانەی [ + ] واتە بۆ یەك دەبن‌و [ − ] بۆ یەك نابن . جگە لەو کـۆمەڵانـەی سەرەوە تـا ئێستـا زۆر کـۆمـەڵی تـری خـوێن دۆزراونەتەوە بەلام بۆ مەبەستی خوێن گواستنەوە گرنگیـان ناگاتە ڕادەی ئەمانە بۆیە باسمان نەکردن[5] .

**- کارکەری ڕیسەس Rhesus factor [6]:**

دۆزینەوەکەی لاندشتاینەر هەنگاوێکی پیرۆز بوو بەلام هەموو گرێ کوێرەییکی نەکردەوە ، تێبینی دەکرا لەگەڵ ئەوەی کۆمەڵی خوێنی نەخۆش دیاری دەکرێت « بەچوار کۆمەڵەکە دەووترێ ABO system » هەندێ جار نەخۆشەکە دوای خوێن پێدان خراپتر دەبوو دەکەوتە گیانەلا . ئەم ئەنجامە زانایـانی خستەکـارو کەوتنە گـەڕان بەدوای چـارەیێك تـا لەدواییدا هەمـان زانا (لاندشتاینەر) دەری‌خست کە کـۆمەڵەکـانی خوێن بـەگشتی دەکـرێنـە دوو بـەشی سـەرەکیـەوە[7] یـەکێکیـانی نـاونـا (پـۆزەتیف + ) و ئـەوی تـر (نێگـەتیف −) لەسـەر ئـەو بنچینەیەی خڕۆکە سوورەکان ئەنتی جینێکی تریان لەسەرە کە ناوی نا « D » و بەبوونی لە خوێندا نیشانەی ( + ) و نەبوونی نیشانەی ( − ) ی بۆ دانرا ، بەلام جیاوازی ئەمەیان لەگەڵ گـرووپەکـانی‌تر ئـەوەیە کـە ئـەنتی جینی « D » دژەتـەنی سروشتی نیە بۆیە « Rh + » دەتـوانێت خوێنی « Rh − » وەربگرێت بەلام ئەوکەسەی خوێنەکەی « Rh − » بێت نابێ خوێنی « Rh + » ی بدرێتێ چونکە لەشی ئەوکەسە توانـای دروست کردنی دژەتەنی هەیە بۆ خڕۆکە سوورەکـانی « Rh + » . سەرە ژمێری کراوە کە ڕێژەی ئەوکەسانەی خوێنیـان « Rh − » لە جیهاندا تەنها [15٪] سەدا پازدەن‌و [85٪] سەدا هەشتاو پێنجی خەڵکی ئەم جیهانە خـوێنیان « Rh + » ە . بەلام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە پشکنینی کۆمەڵی خوێن پشت گوێ بخرێ بەڵکو کارێکی پێویستە .

**- تێك شکانی خڕۆکەکانی کۆرپە : Erythroblastosis Foetalis**

بەدەگمەن ڕێك دەکەوێت ئافرەتێکی خوێن نێگەتیف « Rh − » شوو بەپیاوێکی خوێن پۆزەتیف « Rh + » بکات . بەلام ئەگەر ڕێکەوێت ئەوا خـوێنی کۆرپـەی ئەو دایکـە بەزۆری جـۆری پۆزەتیف دەبێت چونکە ئەو جینـانەی[8] « gene » دەبنـە هۆی گواستنەوەی ئەم کارکەرە زاڵن « Dominant » بەسەر جینەکانی جۆری نێگەتیف .

لەکاتی بوونی کۆرپە لەمنداڵدانی دایك‌داو چەند ڕۆژێك پێش بوونی یان هەر لەکاتی لەدایك بووندا وارێك دەکەوێت هەندێ لەخوێن کۆرپە بچێتە خوێنی دایکەوە[9] لەرێگەی بریندار بوونی

ئەو بەرگرانەی لە هاوەل [مشیمة Placenta » دانو دەبنە هۆی قـارس [تحسس] کردنی لەشی دایـكو دژە تـەن بـۆ خـوێنی کۆرپەکە دروست دەبێت لەناو خوێنی دایكداو ئەم دژە تەنانە توانای دەرباز بوونیان هەیە بۆ ناو خوێنی کۆرپەو شالاو دەبەنە سەر خڕۆکە سوورەکـانیو تێکیان دەشکێنن ، نیشـانەکـانی لەکاتی لەدایك بووندا دەردەکەوێت کە بریتیـە لە بێ‌هێزیو لاوازی کۆرپەو سپیلکی چاوو پێستی زەرد هەڵدەگەڕێنو ئەگەر خوێنی بێ نەدرێ دەمرێت .

## ئامۆژگاری بۆ هاوسەران :[10]

لەگەڵ ئەوەی منداڵی یەکەم لەم جۆرە هاوسەریە تووش نابێت چونکە دروست بوونی دژە تەن ماوەیێکی دەوێتو کەم تا زۆرێك ڕۆڵی خۆیان دەبینن ، بەلام [خۆپاراستن لەچارە کردن باشترە] و دەست نیشان کردنی جۆری خوێن بەتایبەتی دایك شتێکی پێـویستە . ئـەگەر لەکـاتی سك پـڕیا دۆزرایـەوە کە دایکەکە خوێنی نێگەتیفەو باوکەکەش پۆزەتیف ئەوا پێویستە پزیشکی پسپۆڕی ئافرەتو منداڵان ببیننو دژە تەنی تایبەتی بدرێتێ بە ماوەی دوو هەفتە پێش زگ دانان .

(1) بە باوکی پزیشکێتی ناسراوە .

(2) واتە یەك سی‌سی .

(3) هەندێك پیتی [ئۆ] ی ئنگلیزی بەکاردێنن ، هەندێکیش بە [زیرۆ] ی ئنگلیزی دەخوێننەوە .

(4) کۆمەڵەی [AB] هیچ دژە تەنی نیە بۆیە هەموو جۆرە خوێنێك بۆی دەبێتو کۆمەڵەی [O] هەر دوو دژە تەنی [A و B] ی تێدایە بۆ هیچ خوێنێك بـۆی نابێت جگە لە کۆمەڵەی [O] -بڕوانە خشتەکە- .

(5) گرووپەکانی خوێن ئەوەندە زۆرن کە ڕەنگە لە دوا ڕۆژێکی نزیكدا جێگـەی پەنجە گرتن [طبع الاصابع] بگرنەوە لەدیاری کردنی تاوانباران .

(6) بۆ یەکەم جار ئەم کارکـەرە لە جۆرێـك مەیمـون دۆزرایەوە نـاوی ڕیسەس [Rhesus] بۆیە وا ناونراو بەکورتی پیتی [Rh] ی بۆ دادەنرێ .

(7) واتە ئەم دابەش کردنە هەموو کۆمەڵەکان دەگرێتەوە بۆ نموونە کۆمەڵی [A] لەوانەیە پۆزەتیف بێت یان نێگەتیف ، هەروەها کۆمەڵەکانی تریش .

(8) جین بریتیە لەبەردی بناغەی کرۆمۆسۆم کە هەر جووتێك لەجین جۆرە ئاکارێك (صفة) دەگوێزنەوە لەدایكو باوکەوە بۆ ڕۆڵەو نەوەکانیان .

(9) چونکە خوێنی کۆرپە سەربەخۆیەو بەهیچ جۆرێك تێکەڵی خوێنی دایك نابێت .

(10) ئێستا بۆ مارەکردنی هەر کچێك پێویستە کۆمەڵی خوێنی بووكو زاوا دیاری کرابێت جگە لە چەند پشکنینێکی تریش .




گیروگرفتێکی مـەزن هەیـە لە ژیانی گـەنجەکـانماندا بەشێکی زۆری بیرکـردنەوەیـان بو خـوی رادەکێشێ ئەو ژی عازەبەیە پرسکی گەنجی واتە حب الشباب ئەم مەسەلەیە ژی هەر وەك گوتمان توشی مرۆڤی گەنج دەبێت چ کچ یـا کوڕ لە ئەنجامی کارکردنی زیـادی غوددەکـانی چەوری دەردەکـەن لەتەك موەکاندا و 85٪ لەم توشبوانە بەبێ ئەوەی پێویستیان بە ئامۆژگاری پزیشکی بێت تیـدەپەڕنو دەرون بـەلام 15٪ ئەم حالەتانە گەلەك زیادن کە پێویستی بە چارەسەرکردنی پزیشکی یان هەیە .

کچەکان لە تەمەنی 16 — 17 سالو کورەکان 17 — 19 ساڵی توشدەبن زۆر بەکەمی لە دوای ئەم تەمەنـەدا توشی مـرۆڤ دەبێ بەلام غەریب نی‌یە ئەگـەر لە تەمـەنی 30 یان 40 یـا تا شەست سالیش ئەم پرسکانە ببینین ئەم نەخوشی‌یە گەلێك هوی هەیەو زانایان لەناو خویاندا رای جیاوازیان هەیە بۆ نیشاندنی هۆیەکانی ئەم نەخوشی‌یە بەلام ئـەو هویـانەی تـا رادەیەك

ڕوونکراونەتەوە ئەوانەن :-

1 - هۆیەکانی کنێتی واتە ویراسی نیسبەتی هەبوونی ئەم نەخۆشی یە لەلای ئەو منالانەی باوك و داکیان ئەم پرسکەیان هەبوە 45٪ زیاترە بەلام لەو منالانەی باوك و داکیان ئەم نەخۆشی یە یان نەبوە لە 6,7٪ کەمترن .

2 - هۆی دووەم پێستی چەورە : عازەبە لەو پێستەدا و لەو جێگایانەی پێستدا پەیدا دەبێ کە چەوری زیاد بێ و غوددەکانی چەوری زۆر بن وەك ڕوومەت و سینگ و پشت هەروەها ئاشکرایە کە ئەوانەی پرسکی گەنجی دەردەکەن ئەوانەن کە پێستیان چەورە .

3 - هۆی هورمونی :- هورمونی نێرنیە دەستیکی بالاو بناغەیی هەیە لە پەیدابوونی ئەم نەخۆشی یەو هەر کەسی توشی ببێ ئاستی ئەم هورمونە لەناو لەشی مرۆڤەکەدا چ کوڕ یا کچ زیاترە لە سنوری ئاسای وتەبیعی دیسان چەند گۆڕانەك لە ئاستی هورمونەکانی تەبیعی پەیدادەبێ بە تایبەتی ئەو هورمونانەی لە غوددەی ژێر مێشکدا دەردەچن .

4 - هۆی بەکتریا :- هیندەك بەکتریای تایبەتی هەن کە لەسەر پێستی مرۆڤدا دەژین بەلام نەخۆشی پەیدا ناکەن هەروەها لەناو غوددەکانی چەوری دا پەیدان و ژیان لەوێ دەبەنەسەر .. ئەم بەکتریانە هیندەك دەرکراوی تایبەتی دەردەکەن کە بەناوی «ئەنزیم» لە قەلەم دەدرێن کە ئەم ئەنزیماتە دەرچون غوددەکانی چەوری زیاتر کاردەکەن و چەوری زیاتر دەردەکەن کە وەك پرسك دینە بەرچاو ئەوەش عازەبەیە .

## خۆراك و عازەبە :-

ئەو تیوری و تێروانانەی پێشان هەبوون کە دەیان گوت پەیوەندیەکی پتەو هەیە لەنێوان خۆراك و عازەبەدا واتە هیندەك خواردن یارمەتی پەیدابوونی عازەبە دەدەن هەروەك هیندەك لەبرا پزیشکەکان سورن لەسەرئەوەی کە ئەو کەسەی عازەبەی دەردەکا نابێ پەنیرو شیرینی و چەوری بخوات ئەگەر وابن کەسەکە نابێ ئەم شتانە بخوات و لە دوایدا توشی نەخۆشی تر دەبێت نەویش کەم خوراکی یە کەچی باس و پشکنینی نهوی پزیشکی و دیاردەکا کە ئەم مەسەلە تا ئەو راددەیە نی یەو پەیوەندی یەکە ژی تا ئەو ئاستە نی یەو بە چاکی زانایەکان نەیانتوانی وە ئەم پەیوەندی یە بچەسپێنن وبیلێن هەیە هەر لەبەرئەوەش ئێمە دەلێین کە ئەو خوشك و برایانەی توشی ئەم مەسەلەیە بووینە هەموو جورە خواردنێك بخون دا ئاگادار بن و چاودێری لە خواردنەکەیان راگرن کەچێ خواردنێك نەخۆشی یەکەیان خەرابتر دەکات لە ژیانی ڕۆژانەی خۆیدا ئەو جورە خواردنە نەیخون .

## نیشانەکانی عازەبە :-

زۆر کەم کەس هەیە چ ژن یان پیاو توشی ئەم نەخۆشی یە ئەبێت چ کەم یا زیاد و هەروەك گوتمان لە دەم و چاو وپشت و سینگ پەیدا دەبێ و دوور نی یە لە یەك جێگادا تەرکیزی هەبوونی زیاتر بێ : هەروەك لە پشت تەرکیزی زیاتر بێ :

لەسەرەتادا وەك پرسکەکی بچوك سەرەکەی سەرەوە ڕەشە یان سپی یە هیندەك جار و دەوروبەری سورە ئەوە بەناوی «زوان» لە قەلەم دەدرێت و پاشان مەزنتر دەبێت و ڕەنگی سورتر دەبێت و بە قەوارەی جیاواز بچوك و مەزن لەو جێگایەدا دیار دەبن.

پاشان مەزنتر دەبن و چەوری زیاتر تێدا پەیدا دەبێ و نەرم دەبن وەك کێم وا دیار دەبن بەلام کێم نی یەو چەوری یە .

هەروەها ئەوەش لە بیر نەچێ کە عازەبە واتە حب الشباب هیچ نیشانەیەکی نەخۆشی گشتیی یەکیان و لەشی مرۆڤ نابەخشن و هەر لەو جێگایەدایە کە پێستەکەی توشی دەبێ جگە لە هیندەك جار کە مرۆڤی توشبو شکایەت لە خرودشت دەکا ئەوەش هۆیەکەی عازەبە خوی نی یە بەلکو هۆی دەروونی و سایکولوژی یە و تا چەند سال ئەم پرسکانە دەمێنن و پاشان بەرزدەبن و دوور ژی نی یە لەلای هیندەك مرۆڤ زیاتر بژین .

هیندەك جاریش ئەم عازەبەیە پەرە پێدەورێت و مەزنتر دەبێت و بەکتریا کار لێدەکا وتوشی هەوبوون دەبێت و وەك ڤونێر دەردەکرێت یان پێستەکە تەلەیوف دەکات و گرێ گرێ دەبێت و جێگای وەك پاشماوەی ئاوڵە و خوریکە دیاردەبێ .

## گیرو گرفتی دەروونی و عازەبە :-

باس و پشکنینی تایبەتی وا دیاردەکەن کە تورەیی و شەپرزەی و گیروگرفتەکانی سوزی و دەروونی دەوریکی بچوکی هەیە لە دروستکرون و پەیداکرودنی ئەم نەخوشی یە بەلام ئەگەر مروڤیك عازەبەی هەز دەردو گیروگرفتی سوزو دەرونی بیت عازەبە زیاتر دەبی هەروەك بو نمونە لە کاتی تاقی کردنەوەی قوتابخانەکان شەپرزەی قەلەق زورەو عازەبە لەم کاتانەدا زیاتر دەردەچی .

هیندەك لەو گەنجانەی ئەم نەخوشی یەیان هەیەو بە تایبەتی ئەوانەی وەسواسن . کاتیکی زور بەرامبەر ئاوینەدا دەبەنە سەر و گەلەك دەست لەم پرسکانە دەدەن و دەیانگوشن و کەمە لەگەل دەکەن و ئەم کارانە ژی چارەسەرکردن و چاکبونەوەی عازەبە دواودیخن و گری ی پیستی دروست دەکەن .

عازەبەو ئەو گری ی پیستی یانەی پەیدا دەبن هیندەك گیروگرفتی دەرونی و کومەلایەتی پەیدا دەکەن هەر لەبەرئەوەشە کە نەخوشی یەکە دیارەو لەبەرچاوە .. بەتایبەتی کە لە رووەمەت بیت ئەم مروڤە توشی بوە وا هەستدەکا کە خەلکەکە بە چاویکی کەم تەشای دەکات و بەناراحەتی لەگەل خەلك وەجولیشەوە هەر بەدوای ئەوە خوی لە خەلك دەجوولیتە لەگەل چالاکی دەوروبەری خوی هاوبەشی ناکاو دوور دەکەوی لە کومەلگای خوی تا توشی تەنهایی کومەلایەتی دەبی و بیرەکانی خوی کاویژدەکاو توشی گەلی گیروگرفتی دەروونی دەبی وەك شەپرزەیی و قەلەق و خەموکی و پاشان کارەکەی شەلەل دەبیت چ لە قوتانجانە یان لە کارگەدا . هەر لەبەرئەوە وا دیارە کە عازەبە هوی ئەم نەخوشی یانەی دەروونی یە .

## چەند ئاموژگاریەك بو چارەسەرکرنی عازەبە :-

1 - یەکەم شت هەر کەسی تووشی عازەبە دەبی ئەبی چاك بزانچت کە ئەم نەخوشی یە بو ماوەیەکی زیاددەمینیت و تا چەند سال دەخاینی و پاشان دەروات لەخوی یەوەو هیچ ریشەیەکی پیس و گواستنەوەو بەکتریایی نی یە .

هەروەها تووشی بووە کە هەدەفی چارەسەرکردن بزانی .

هەدەفی یەکەم لابردنی پرسکەکان لەو جیگایانەی تیدا وەرچوینە ئەوەش ئارامی یەکی دەرونی چاکی دەداتە توشبووەکە .

هەدەفی دووەم ئەوە کە هەول بدریت گری ی پیستی و پرسکی نوی لە پیستیدا پەیدا نەبن لەبەرئەوە چارەسەرکردنەکە وەك پاراستن یشە . لەدوایی دا چارەسەرکردن بو ئەوەیە کە موزاعەفاتی نەخوشی یەکە دوورکاتەوە چ دەروونی بن یان گری پەیدابوونی پیست بی هەر لەبەرئەوە ژی ئەبن بەنەخوشی بگوتریت یێنی چارەسەرکردنی بو چەند مانگ تا چەند سال دەخاینی تا ئەو پلەی ئامادەبوونی لەشی مروڤی توشبوی عازەبە بو پەیداکردنی ئەم نەخوشی یە کەم دەبی .

هویەکانی سەرنەکەوتنی چارەسەرکردن :

1 - هوی هەرە گرینگی سەرنەکوتنی عیلاج ئەوەیە کە بە ریکخستن و بەردەوامی و بو ماوەیەکی دوورو دریژ دەرمانەکان وەرناگرن .

2 - هوی دووەم ئەوە کە نەخوش دەرمان وەردەگری بەلام گوی ناداتە ئاموژگاریەکانی پزیشکی بو نمونە ئەبی تتراسایکلین پیش نان بخوریت کەچی نەخوشەکە دەرمانەکەی پاش نان دەخوات و هەلزتنی دەرمانەکە کەمەو بەهانای ئەوە ناهیت پرسکەکان نەهیلیت .

3 - ترسانی نەخوشی لە ئەنجامی بەکارهینانی دوورو دریژی دەرمانەکان .

لەم مەسەلانەدا دەوری پزیشك دیتە گوری و چون دەتوانی نەخوشەکەی تیبگەینی کە ئەو دەرمانانەی بو ئەم نەخوشی یە بەگار دین هیچ کاریکی لابەلای نی یەو موزاعەفاتی نەخوشی یەکە و ئەو دەرمانانەی بوی بەکاردین چنەو چون لادەبرین .

هەروەها چون و بەچی ریباز چارەسەرو عیلاج دەکریت ئەوە پزیشکی نەخوشی یەکانی پیست دەلیت و لیرەدا وابزانم تا رادەیەك هەول دا دەربارەی عازەبە شتیك بلیم و بە ئومیدی ئەوەم کە بەدلی ئیوە بەریزبیت .

بهجت محمد هروری

# ژنا کورد ... سەربەستی

دوزا ژنێ و بزاڤا سەربەستی یا وێ گەلەکا هاتی یە نڤیسین و پوتیە پێکرن ژلایێ زاناو نووسەرو تورەڤانێن بسپورو نەبسپورڤە دجیهانا ژنێ دا ، بئارمانجا یەکسان بوونا وێ دگەل زەلامی دهەمی ماف و کارادا .

سەربەستی یا ژنێ نەك هەر ئەوە بتنێ بهێت و بچیت و سەربەردای بیت ، لێ دڤێ سەربەست بیت ژهەمی لایێن ژیانێ ڤە ، لایێن ئابووری و رامیاری و کومەلاتی و روشنبیری و ... تد . ئەڤجا سەربەستی یا ژنێ ژلایێ ئابووری ڤە (بو نمونە) نەك هەر ئەوە ژن پشکداری یا زەلامی بکەت دبەرهەم هێنانێ داو بەس بەلکو دڤێ پارێزی یا ئابووری یێ بکەت دگەل پشکداری یا وێ دبەرهەم هێنانێ دا ، بئاوایەکێ بساناهی تر ، سەربەستی یا ژنێ ژلایێ ئابووری ڤە گرێدایە ب پشکداری یا وێ د شورشا چینا بن دەست و رێنجبەردا « برولتیاریا » و بزاڤا وێ بو سەربەستی یێ و رزگاربونێ ژبن دەستی و سەرمایەداری یێ .

یا ژهەژی گوتنێ ئەوە کو سەربەستی یا ژنێ مەرجەکێ سەرەکی یە بو سەرخوبونا گەلاو سەربەستی یا وان . ئەڤجا ئەم دشێین بێژین هەتا ژن نەهێتە سەربەست کرن ، یانژی پشکداری یێ دگەل زەلامی نەکەت ، گەلەك زەحمەتە گەل بهێنە رزگار کرن ژبن دەستی و تەپەسەری یێ .

دوزا ژنا کورد نەیا جودایە ژ دوزا ژنێن جیهانێ ، بەلێ جهێ داخێ یە برەنگەکی راست و دروست یانژی .. هەتا وەك ژنێن جیهانێ ، پوتیە ب مافێن وێ نەهاتی یە کرن ، لەوما ئەم دبینین یا پاشڤە مایە ژکاروانێ ژنێن جیهانێ و نەگەهەشتی یە رێزا وا ، لێ بزاڤ و خەبات بەردەوام یا دهێتە کرن دپێخەمەتا ڤێ چەندێ دا ژنا کوردژی پارێزی یێ ژهەبوونا خو بکەت و بزاڤێ بکەت دئاڤاکرنا وەلاتی داو دویر خستنا وی ژبن دەستی و ... ی یی .

ژنا کورد هەروەکی زاناو تورەڤانێن روژهەلات ناس دبێژن پتر یا سەربەخویە ژ ژنێن جیرانێن خو . بەلێ ئەڤە رامانێ نادەت کو ژنا کورد نەیا بن دەست و گرێدایە .. یانژی یا سەربەستە و هەمی مافێن خو هەنە ، چونکی گەلێ مە ژگەلەك چینا پێکهاتی یە و هەر چینەکێ هەست و بیرێن خو یێن جودا هەنە بەرامبەری ژنێ ، ئەڤجا ستەمە ژن برەنگەکی تڤایی سەربەست یت و هەمی مافێن خو هەبن .

هەکە بێین و بەرێ خو بدەینە ژنا کورد دگونداداو بەراورد بکەین دگەل ژنا کورد دباژێرادا دێ بینین سەربەستی یا ژنا کورد دگوندادا پترە ژ یا ژێرا ، بتنێ دێ چیتە ناڤ ئاقاری گیای ئینیت و پارزنیکێ خو هەلگریت و بتنێ چیتە دارا یانژی دوو سێ پێکڤە ، پشکداری یا زەلامی دکەت دچاندن و ئاڤدان و چنین و هەمی کارێن دی ، حەیوانا بخودان دکەت و پێشوازی یا مێڤانا دکەت .

روژهەلات ناسێ روسی « مینورسکی » دەمێ بەحسێ ژنا کورد دکەت دگوندادا دبێژیت « ژنا کورد گەلەك یا شارەزایە ، نەیا راپێچایە (محجبة) ، دروینیتە دیوانا بێ ی ترس و لەرزو پشکداری دکەت دئاخفتن و گەرگەشادا » . بەلێ ژنیا کوردا لناڤ چیاو دگونداد لسەر ژنا کورد پێڤی کری یە بن دەستا مالا خو بیت و گەلەك کار بکەڤیتە سەر ملی . بو نمونە ، ئاقارو زەڤی و ڤێقی باهرا پتر ناکەڤنە دناڤ گوندی دا ، دیسان کانیکا گوندی باهرا پتر ژمالا دویرە ، ئەڤجا ژن هەست بوەستیان و نەخوشی یێ دکەت دەمێ دچیتە ئاڤێ یانژی چنینا ڤێقی یانژی ئینانا گیای یان هەر کارەکێ بیت .

هەلبشکێنەر « ئەدموندز » گەلەك جان بەحسێ ژنا کورد دگوندادا دکەت دپەرتوکا خو « کرد و ترك و عرب » دا دبێژیت « بارێ (وضع) ژنا کورد دگوندادا نەخوشترە ژبارێ ژنێن هەمی جیرانێن خو ژ روژ هەلاتا ناڤی . بن دەستا مالا خویە . ژکارێن وێ یێن روژانە دێ بینین دێ تەنەکەی دانیتە سەر ملێ خوو تژی ئاڤا تەزی کەت ژکانیکا گوندی سپێدەو نیڤروو ئێڤارا ، ئەڤە ژوان کارایە ئەوێ زەلام ژێ ی بێ باهرو ژێ ی دویر ، بەلێ بو رێبەری یێ دمالێدا یا هاتی یە نیاسین بژیری و

زیرەکی‌و شارەزاییێ » . بەلێ ئەڤە نابیتە ئەگەرا هندێ کو بارێ ژنا کورد یێ نەخوشتر بیت ژبارێ ژنێن جیرانێن خو ، چونکی ئەڤ چەندە کانیکا ئاڤێ‌و چونا ئاڤێ ژوان دیمەنێن جوانێن سروشتی‌یە کو لکێم جها هەیە .

بەلێ سەربەستی‌یا کچا کورد دهندەک تشتادا دهێتە بەرزەکرن‌و دەنگێ خو نینە پترین جارا ، ئەوژی دژێ گرتنا هەڤالێ ژیناوێ دایە . ئەم دبینین کو کچ پترین جارا شوی بکەسێ ناکەت گەر ئێکی لدویف داخازا بابێ وێ نەبیت ، بابێ کچێ بەرێ خو نادەتە کچێ‌و ڤیانێت وێ ، بەلکو بەرێ وی یێ لبەرژەوەندی‌یا وی بتنێ . دێ کچا خو بزوری دەتە ئێکی کو ئەو حەز ژێ بکەت ، نەک کچ حەز ژێ بکەت . لێ گەلەک کێم جارا دێ بینین کچ دێ شوی بئێکی لدویف دلێ خو کەت پشتی ئێک دوو ڤیانا چەند سالا . ئەڤ کارە گەلەک کار دسەربەستی‌یا ژنێ‌دا دکەت دهەمی کارێن وێ‌دا ، چونکی سەربەستی دل خوشی‌یە .. ما هەکە دل یێ نەخوش بیت دێ چەوا سەربەستی‌یا خو هەبیت . دیسان گەر بەرێ خو بدەینە لایێ روشنبیری دێ بینین دەورو سەربەستی‌یا ژنا کورد لگوندا تێدا کیمە . ئەوژی ژبەر چەند ئەگەرەکا ، وەکی دویراتی‌یا گوندا ژ سەرچاوێن روژنامەگەری‌یێ ژ روژنامەو گوڤارو پەرتوکا ، ژ لایەکی دیڤە کو ئەگەرا سەرەکی‌یە ئەوژی زوی ڤەنەبوونا قوتابخانایە لگوندێن کوردستانێ ، ئەڤنە هەمی بوونە ئەگەرا هندێ کو ژنا کورد نەیا پێشکەفتی بیت ژلایێ روشنبیری‌ڤە ل گوندا .

بەلێ ژناکورد برەنگەی تڤایی سەربەستی‌یا خونینە ژلایێ رامیاری‌یێ‌ڤە هەرچەندە حەز ژێ دکەت‌و ڤیایا هندێ‌یە چونکی کاودانێن کوردا لسەر ژن‌و مێرو بچویک‌و پیرا پێتڤی کری‌یە حەز ژڤێ چەندێ بکەنە . ژلایێ رامیاریڤە ژنا کورد دوو جارا یا بن دەستە ، دسەر بن دەستی‌یا مالا خورا بن دەستا وێ رژێم‌و دەستەلاتی‌یێ‌یە ئەوا لبن سیبەرا وێ دژیت . لێ دسەر ڤێ چەندێرا پشکداری‌یێ دکەت دهندەک کارێن رامیاری یێن سڤک‌دا و هاریکاری‌یا زەلامی دکەت دگوندو باژێرادا . بەلێ ئەم دشێن بێژین ژنا کورد لگوندا پتر یا سەربەستە دڤێ چەندێدا ژ یا باژێرا .

سەیدایێ نەمر « أنور مایی » د پەرتوکا خو « الأکراد في بادینان » دا دبێژیت : سەیدا « عەرەبی شەمو » د پەرتوکا خو « شڤانێ کورد » دا خویا دکەت کو وی بچاڤێ خو دیتی‌یە ژنێن کورد شەر دکر دژی روسێ سالا « 1336 ی مشەختی ، 1916 ی زایینی . دیسان گەلەک ژنێن کورد دەستەلاتی‌و سەرکردایەتی هەبوویە . وەکی « مریم خانا بێدوهی » کو هەشت سالا موختاری‌یا گوندێ بێدوهێ کری‌یە لناڤ بەرواری بالا . دیسان « صەفیە خاتون‌و عادلە خاتون‌و خانزادو فاتما رەش‌و گەلەکێن دی . هەروەکی نە گوتی ماڤێ ژنا کورد پوتیە یا پێ دهێتە کرن‌و پێنگاڤێن مەزن یێن دهێنە هاڤێتن بو چارەسەرکرنا ڤێ چەندێ .

« حەپسەخانی نەقیب » ئێکەمین ژنا کوردا زیرەک‌و تێگەهەشتی‌یە داخازا ماڤێ ژنا کورد کری‌و داخازا سەربەستی‌یا وێ کری کو یەکسان بیت دگەل زەلامی دهەمی ماف‌و کارادا . دیسان ئێکەمین ژنا کوردە چەند نامە « مذکرة » داینە بارەکا وەلاتێن ئێککرتی بناڤێ ژنێن کوردستانێ ل سالا « 1930 » تێدا داخازا سەربەستی‌یا ژنێ دکرو داخازا راوەستاندنا زوری‌یا لسەر کوردا دکرو خوشی جهێ وێ بگریت .

بەلێ گەر بێین‌و بچاڤەکی بلەز بەرێ خو بدەینە ژنا کورد دباژێرادا . دێ بینین ژلایێ روشنبیریڤە یا سەربەست ترە ژیا گوندا . پتر پشکداری‌یا زەلامی دکەت دشانویاو میهرەجانادا دیسانە پتر تێکەلی‌یا تورەی دکەت ژ نڤیسین‌و خاندنێ خاندنا پەرتوک‌و روژنامەو گوڤارا . ئەڤەژی ژبەر چەند ئەگەرەکا ، وەکی مشەیی‌یا روژنامەو گوڤارو پەرتوکا ، زوی مشەبونا قوتابخانا کو ئەگەرەکا سەرەکی‌یە ، دتینا میهرەجان‌و شانویا کو پتر هەست‌و بیرێن وان موکم‌و بەرفرەهـ دکەن . ئەڤنە هەمی بوونە ئەگەرا هندێ ژنا کورد لباژێرا پتر یا سەربەست بیت‌و پتر پشکداری‌یێ بکەت ژلایێ روشنبیری‌ڤە .

لێ ژلایێ ئابووری‌ڤە ژنا کورد لباژێرا وەکی یا گوندا سەربەستی‌یا دەرکەفتن‌و هاتن‌و چونێ نینە . بەلێ ژلایێ ئەڤینداری‌یێ‌ڤە پتر یا سەربەستە ژیا گوندا کێم جار نەبن هەگەر کچ یا سەربەستە بو ژێ گرتنا پشکداریێ ژینا خوو . هەر کەسێ بڤێت دێ شوی پێ‌کەت‌و باب رێ لێ ناگریت .

یا ژهەژی گوتنێ ئەوە کو ژنا کورد هێشتا سەربەستی‌یا خو نەدیتی‌یە برەنگەکی تڤایی .. لێ گەلەک بزاڤا دهێتە کرن‌و سەربەستی‌یا وێ هێدی هێدی یا گەش دبیت‌و بەلاڤ دبیت .

ئەڤروکە ژنا کوردو مێرێ کورد مل بەمل بەرێ خو یێ دایە ژیانێ‌و بو بلندی‌یێ دخەبتن‌و داخازا ژینەکا تەنا دکەن ، پشکدارن دخوشی‌و نەخوشی‌یادا ، بتەڤرو قەلەم‌و تڤەنگێ . مە هیڤی‌یە ژنا کورد بگەهیتە رێزا ژنێن پێشکەفتی ل جیهانێ‌و ببیتە ستوینەکا موکم لبن بانێ سەربەستی‌یا گەلێ مە .

عبدالله بابه علی بەرزنجي



دوێنێ و ئەمڕۆی

# چاپ و چاپەمەنی کوردی لە تای تەرازودا

هەڵبەتە دەرکردنی گۆڤارو رۆژنامەو چاپەمەنی کوردی کارێکی هاسان نەبوەو هاسانیش نی یە وەك هەندێ لە خوێنەران بیری لێدەکەنەوە . کە ئەمەش بە زۆری لە بەر هەندێ هۆی سەرەکی یە وەك ئامێری چاپی تازەبابەت دەگمەن بووەو کادیری شارەزاو لێهاتووش هەر بە هەمان شێوە بووە جگە لەوەی کە ناوچەی کوردستانیش زۆر کەم لەم رووەوە گرینگی پێدراوەو ، گەر چاپخانەیەك یا دووانیش بووبێ ئەوە لەو جۆرە ئامێرانە نەبوون کە بە تەواوی پشتی پێ ببەسترێ و کێشەی چاپەمەنی کوردیشیان سەد دەر سەد چارەسەرکردبێ ..

هەر نەبوونی ئامێری چاکی چاپیش بۆتە هۆی ئەوەی کە کریکاری شارەزاو لێهاتووی کورد لە بواری چاپخانەدا هەڵنەکەوێ ، وە ئەگەر چەند کرێکاریکیش هەبووبن ئەوە لە هەموو حاڵەتێکدا لە ژمارەی پەنجەکانی دەست رەتیان نەکردووە .. هەربۆیەش دەتوانین بڵێین کورد لە هەردوو .. لاوە بێبەش بووە ، چ لە لایەنی ئامێری چاك و پێشکەوتووی چاپ ، وە چ لە لایەنی کادیرو کرێکاری شارەزاو لێهاتوو ..

لەگەڵ ئەو بارە ناڵەبارەی چاپ و چاپەمەنی کوردیشدا دەبینین رۆژنامە نووسینی کوردی هەر لە زووەوە هەنگاوی خێرای بۆ نراوەو رۆشنبیرانی کوردستان هەمیشە لەم بوارەدا کۆششیان کردووەو تائێستایش بەردەوام بەرەو پیری ئەم پیشەیە دەچن و هەوڵی بێ پسانەوەی بۆ دەدەن ..

راستی یەکی تر ماوە بیڵێین ئەویش پیشەی رۆژنامەنووسینی کوردی و پیشەی چاپ و چاپەمەنی یە کە هەردووکیان وەك دوو تای تەرازوون ، گەر هاتوو لایەکیان هاوسەنگی لایەکەی تری نەبوو ئەوە بێ سێو دوو لاسەنگ دەبێت ، وە ئەوەی مایەی داخیشە ئەوەیە کە تائێستا چاپ و چاپەمەنی ئێمەی کورد لە کوردستاندا هەر سەنگەلایەو





نەتواندراوە پارسەنگی بۆ دابندرێ‌و شان بەشانی یەکتری ڕێ
بکەن‌و نووسەرو ڕۆژنامەنووسانی کوردیش لە ئێش‌و ئازاری
چاپخانە رزگاریان ببێت ، کە ئـەمانـەیش هەر دیسـان هۆی
سەرەکی هەیە بواری چارەسەرکردنی نەداوە وەك ، هـەر لە
کۆنەوە کەسانێکی پارەدارو دەولەمەندی کوردی وا نەبووین کە
هەولی ئەوە بدەن چاپخـانە بکـرن‌و لە شارە خنجیـلانەکـانی
کوردستانـدا دای بمەزرێنن‌و کـرێکاری شـارەزای بۆ پـەیدا
بکەن‌و باری ڕۆشنبیری میللەتەکەیان چاکتربکەن ، وە ئەگەر
بووشبن ئەوە وایان زانیووە چاپخانە کارێکی وانی‌یە قازانجێکی
چـاکیان پێ ببـەخشێ ، بەلکـو زیاتـر خۆیـان بە ئیشـوکاری
بازرگانی‌یەوە خەریـك کردووەو هـەولی ئەوەیـان داوە زووتر
دەولەمەندبن‌و پارەو سامانی زیاتر کۆبکەنەوە .

هەروەها کاربەدەستانی پێشووش ئەوە هەر ئارەزوویان
نەبووەو خۆیان لە قەرەی ئەوە نەداوە کە پیشەیەکی وا پیرۆزو
بـەنرخ لە کـوردستانـدا سەر هـەلبدات ، بـۆ ئەوەی بـاری
ڕۆشنبیری‌ی لەو ناوچەیەدا هەر بە دواکەوتوویی بمێنێتەوە ،
لەگەل ئەوەشدا هەر چۆنێ بووبێت ڕۆژنامەنـووسیی کوردی
ڕۆلی خۆی پەرە پێداوەو بێ‌پشوو کۆلنەدان هەنگاوی خێرای
خۆی ناوەو لەگەل کاروانی خەبات‌و تێکۆشانی پڕ لە شەرەف
مەندی‌و بـاوەڕەوە بە دلێکی پـڕ لە هیواوە بـەرەو مەنـزلگای
بەختەوەری ڕۆییوەو دەروا ناوەستێ ...

## گیرو گرفتی چاپ

وەك لە پێشەوە باسمان کرد لەبەر نەبوونی کرێکاری کورد لە
چاپخانەداو تا ئیستـاش هەر بـە زۆری برا عـەرەبەکـان لەو
پیشەیە شارەزان‌و کاری تێدا دەکەن هەلبەتـە ئەوانیش کـە
نووسینێکی کوردی دێتە بەردەستیان نازانن بیخوێننەوەو لێ ی
تێ‌بگەن دەبێت وەك رەسم (نەخش) نوسینەکە بکەن جا بۆیە
کارەکەی ئەوانیش وەك هی ئێمە قورس‌و دژوارە .
بۆیە ڕۆژنامەنووسانی کورد پەنایان بردۆتە بەر هەندی
کاری زێدە وەك لە خوارەوە باسی لێ دەکەین :

● ڕۆژنامەو گۆڤاری کوردی چۆن دەردەچێ‌و چۆن لە گەل دەزگاو کرێکارانی چاپخانەدا کارەکانیان ڕێك دەخەن ؟!

دەستەی نووسەر یا ئەو کادیرە ڕۆژنامە گەریانەی کە کار
دەکەن هەر یەکەیان ئیشیان جیایەو بە هاری کاری لە گەل
یەکتریدا کارەکانیان ڕێك دەخەن‌و کاری هەر یـەکێکیان
جیاکراوەتەوە ئەمە لە لایەك ... ئـەو نووسینـانەی کـە
بەکەلکەو جێ ئەوەیە بلاو بکـرێنەوە پێش هـەموو شتێ
دەبێت خەتەکەی خۆش‌بێت‌و جوان نووسرابێتەوەو خەت
جێ هێلدرابێت‌و لەسەر یەك ڕووی کاغزە کە بێتو هـەر
ووشەیەك لە گەل ووشەکەی تردا هەندێ ماوە هەبێت .
خۆ ئەگەر وانەبوو دەبێت بنووسرێتەوە خۆ نووسینەوەی
ئەو هەمـووە کارێکی وا ئـاسان نییـە کەواتـە ئەو بـرا
نووسەرانەی کە نووسینێك دەنێرن ئەگەر خۆی خـەتی
جوان نەبێت باشتر وایە بیدا بە یەکێکی خەت خۆش‌و بە
قەلەمی پاندان بینووسێتەوە هەموو نوختەو پیتەکانی لە
جێگای خۆی بنووسێت‌و ئەوسا بینێرێ تا ئەو کرێکارەی
کە لە چاپخانەدا کار دەکات نەخشەکـە وەك خۆی دەر
بهێنێ ...

● کە نووسراوێك هەلدەسەنگێندرێ لە لایەن ئەو کەسانەی بەر پرسیارن دوای ئەوەی کە خەتەکەی جـوان‌و ڕێکەو نووسینەکە کەلکی بلاوکردنەوەی هەیە یەکێك بە قەلەمی سوور یا قەلەمێکی ڕەش هەلدەستێ بە جیاکـردنەوەی





هەر ووشەیەك لە ووشەكانی نووسینەكەو تا تێكەڵاو نەبێت بۆ نموونە (كاروان /گۆڤارێكی /كوردیو /عەرەبی /باشە) بەم شێوەیە هەر ووشەیەك لە ووشەكەی تر جیا دەكاتەوە تا كرێكاری چاپخانەش بەم شێوەیە نەخشەكە دەربهێنێ خۆ ئەگەر هاتو بە قەڵەمێكی سوور یا هەر رەنگێكی تر ووشەكان جیا نەكرێتەوە نەخشەكەش بە هەڵە دەردەچێو ئەوساكەش نووسینەكە ناتواندری بخوێندرێتەوە بۆ نموونە (كار /وانگۆ /ڤار /ێكیكو /رد /یو /عەرەبیبا /شە) رەنگە خراپتریش واتە رستە كەرت دەبێتو تێك دەچێتو زۆر بە زەحمەت پێمان لێك دەدرێو ووشە هەر یەكە بۆلایەك دەروات نووسینەكە بە هەڵە دەردێو خوێنەر سەری لێ دەشێوێ ..

- دوای ئەوەی نووسراوەكە لە چاپخانە چاپكرا دیسان دەهێندرێتەوە بۆ لای یەكێكی بەرپرسیار كە پێ دەڵێن (مصحح) راستكەرەوە نووسینەكە لە سەر تا خوارەوە دەخوێنێتەوە هەر ووشەیەك بە هەڵە نوسرابێ دەیخاتە ناو دوو كەوانە یا خەتێكی بەدەورا دەهێنێو خەتەكە درێژ دەكاتەوە لە جێگایەكی سپی راستییەكەی دەنوسێتەوە دوو بارەو سێ بارە نوسینەكە دەگەرێتەوە بۆ چاپخانە تا هەڵەی لێ دەبردرێو ئەوساكە هەموو نووسینەكان كۆ دەكرێنەوە لە بارەگای گۆڤار یا رۆژنامەكە .. و واتە نووسینەكان ئامادەن بۆ سەر لاپەرەكان ..

لێرەدا دەمانەوێ تێك هەڵكێشێكی چۆنیەتی چاپو چاپخانەو چاپەمەنی كۆنو تازە باس بكەینو لە هەردوو بابەتەكە بدوێین . با لە سەرەتاوە بە درێژی هەندێ باسی چاپخانەی كۆنو نوێ بكەین . بە پێی هەندێ شارەزایی ، خۆ لە پاشە رۆژدا ئەگەر باسی باشتریش لەسەر نوسرا ئەوا هەموو لایەكمان چاتر لە رووی چاپو چاپەمەنی شارەزای پەیدا دەكەین :

چەشنی كۆن : پێش چەند ساڵێك لە وولاتی ئێمەدا چاپو چاپەمەنی كارێكی زۆر دژوارتربوو لە ئێستاكە .. لە چاپخانەكەماندا چەند كرێكارێك بە دەست پیتەكانیان كۆ دەكردەوە كە پێیان دەووترا پیت رێكخەر هەر پیت رێكخەرێك لە بەردەمیا دەسگایەك بەرانبەری تەختەیەكی خانە خانە لە داریا ئاسن دروست كرابوو ، هەر خانەیەكی هی جۆرە پیتێك بوو ، واتە چەند چەشنە (ئەلف هەیە هەر چەشنەی لە ناو یەكێ لەو خانانەبوو یا چەند چەشنە ب .. هتد) واتە ئەو خانانە لە هەموو جیهاندا وەك یەك وایەو هەڵەی تێدا ناكرێ . كە ئەهاتن ووشەیەك یا رستەیەكیان كۆ دەكردە وە لە هەر خانەیەك لەو خانانە پیتەكانیان دەردەهێنا ، بەكورتی بڵێن هەر نووسینێك یا گۆڤار یا رۆژنامە هەمووی دەبوایە كۆ بكرێتەوەو پاش چاپكردنی دوو بارە دابەش بكرێتەوە ، بۆ خانەی خۆی بۆ جارێكی تری كاركردن جا ئەو پیتانە پاش كاركردنێكی زۆر هەڵبەتە دەسواو لە كار دەكەوت بەلام لەبەر نەبوونیو گرانی چاپخانەكان هەر كاریان پێ دەكرد تاوای لێ دەهات تەواو بێ كەڵك دەبوو ، ئەوسا كاركەناریان دەكردن ... هتد نووسینی خەتی گەورەی (مانشیت) لە سەر پارچەیەك قایش بە (قەڵەم) دەنووسراو دوایی بە چەقۆیەك دەبردراو ، بە چرێش دەیان نووساندە سەر پارچەیەك ئاسنی بەقەد نووسینەكە پانو درێژ . دوای ئەوەی لاپەرەكە یا بابڵێن مەلزەمەكە دەبەستراو توند دەكرا ئەوساكە دەخرایە ژێر مەكینەی چاپەوە بەزم لەمەكینەی چاپ دەستی پێ دەكرد ، جار وا دەبوو ، پیتێك یا ئاسنێك شل دەبوەوە مەترسی ئەوە دەكرا كە هەموو لاپەرەیەكە یا (مەلزەمەكە) لە گەڵیا شل بێتەوەو پیتەكان بڕژێن خۆ ئەگەر هاتو رژاش ئەوا بەئەركێكی زۆر كۆ دەبنەوە . یا پەڵەی رەشی لەسەر رووی لاپەرەكە دروست دەكردو ناشیرینی دەكرد ، بۆیە كرێكاری سەر مەكینەی چاپەكە بە چەكوشێكی بچووكەوە چاودێری لاپەرەكانی دەكرد هەر هەستی بكردایە پەڵەیەكی رەش پەیدابوو ئەوا مەكینەكەی رادەگرتوو تەماشای دەكرد لە كوێ ئاسنە كوت پیتە شكاو سەری راستكردۆتەوە چەكوشێكی پیا دەماڵیو هەوڵی توند كردنەوەی لاپەرەكەی دەدا تاكۆ تای بە چاپكردنەكەی دەهات ...

- هەر دوا بەدوای كاری سەرەوە چەشنێكی تر لە مەكینەی چاپكردن داكەوت كە بایەخێكی زۆری هەبووە كاری

رۆژنامه نووسان و نووسه ران و دانه رانی کتێبی ئاسان کرد ئه ویش (ئه نته ر تایپ و لاینۆتایپ) بۆ هه ر به په یدابوونی ئه وان کاری کۆ کردنه وه ی پیت به ده ست ره زیل بوو بایه خێکی ئه وتۆی نه ما که له پێشدا هه یبوو ، وه هه روه هاش رۆژنامه گه ری و چاپه مه نی هه نگاوێکی زلی هاویشت بۆ پێشه وه و که وتنه حه سانه وه و .... هتد .

چونکی ئه و مه کینانه قالبی پیتیان له پێشدا بۆ داڕێژراوه و به (قورقوشم) کار ده که ن له ته نیشت مه کینه که کوره یه ی قورقوشمی هه یه و له کاتی کارکردنی ده بێ قورقوشمه که گه رم بکرێ تا ته واو ده بێته ئاو (شله) له کاتێکا که پیتێك لێ ده ده ن به په نجه ئه و قورقوشمه ده چێته ناو قالبی پیته که و ده ی به ستێ (ده مه یێ) تا دێرێك ته واو ده بێ و .. ئه وسا ده چێته سه ر سکه یه ك و به هۆی چه ند به کره یه ك ده سووڕێ و دێته خواری که ته ماشا ده که ی دێرێك یا پیتێکی ته واو له به ر ده متایه ئه نته ر تایپ و لاینۆ تایپ کاریان ئاسانه و دێره کانی دروستی ده که ن جوانن و ده توا ندرێش خۆت ده ست نیشانی درێژی ی دێره کان بکه یت که چه ند (سم) ی ده وێ ته نیا ئه گه ر هات و کرێکارێکی نه شاره زاش کاری له سه ر بکات و ئه و درێژی یه ی که بۆت ده ست نیشان کردووه به گوێره ی ئه وه دێره که ته واو نه کات یا به سپی پری نه کاته وه بیه وێ دێره که ده ربهێنێ چه ند شلی له ناو ئه و دێره یا هه بێ (کون) ئه وا به گوێره ی ئه وه قورقوشم بۆسنگو ده م و چاوی کرێکاری سه ر مه کینه که دێ و ده ی سوتێنێ که واته ده بێت کرێکاره که زۆر شاره زاو لێ هات و بێت ... له گه ل په یدابوونی ئه نته رو لاینۆ ره نگه هه ندێکیش پێش ئه وان ره نگ په یدابوو ره نگیش ده سته خوشکی یه که می چاپ و چاپه مه نی بۆ ئه رکی ره نگ ئه وه یه که له نووسینی گه وره و (مانشێت) وو ێنه ی که پێویست بێ بۆ گۆڤارو رۆژنامه و .. هتد بۆی ده که ن و واته کارگه یه کی سه ربه خۆیه و کادیری تایبه تی خۆی هه یه و لێره دا ئێمه ئه وه نده ی لێ نازانین تا باسی لێوه بکه ین ..

- چه شنی تازه تر که ئێستا له وولاتی ئێمه یا باوه و له م چه شنه باشتر نه هاتووه ئه ویش پێ ی ده ڵێن (تنضید الکترونی) ئه مه باشترین چه شنی چاپ و چاپه مه نی یه له رووی دارشتنی پیشه وه ، هه روه ها کرێکاره کانی که کار له سه ر ئه م جۆره مه کینانه ده که ن جێگاو رێگاکانیشی پاك و خاوێنن :



- ته نضیدی ئه لیکترۆنی چۆنه ؟ ژووری ئه و کرێکارانه ی که کاری لێ ده که ن چه ند کرێکارێکی زانا هه ریه که یان له سه ر کورسی و مێزی خۆیان دانیشتوون له به ر ده میاندا چه ند پیتی که هه یه له نووسیندا جا چ کوردی یا عه ره بی یا ئینگلیزی .. هتد .

هه ر پیت له سه ر ئامێرێك نووسراوه له ته نیشتی ئاوێنه یه کی ته له فزیۆنی هه یه هه ر پیتێ که په نجه ی له سه ر داده نی له سه ر ئاوێنه ته له فزیۆنی یه که ده رده که وێت و تاووشه یه ك دێرێك ته واو ده کات . ئه گه ر هات و کرێکاره که هه ستی کرد پیتێکی هه له کردووه چونکه له به ر چاوی نووسراوه ئه وا په نجه ی ده خاته سه ر ئامێرێکی تر وه ك سه هم ده روا تا ده گاته سه ر ئه و پیته ی که هه ڵه یه ، سه همه که راده گرێ راستییه که ده نووسێته وه ئه وسا سه همه که بزر ده کاته وه یا ئه وه شمان له یاد نه چێت ئه و نووسینانه ی له سه ر ئاوێنه ته له فزیۆنی یه که ده ردێ له ته نیشته وه له سه ر شریتێکی کاسێت ده نووسرێ و له سه ر ئه و شریته تاهه موو نووسراوه که ده نووسرێته وه چاپ ده بێت هه ڵده گیرێ که شریته کاسیته که ته واو ده بێت یا نووسینه که ته واو ده بێت ئه وسا شریته کاسیته که ده خرێته ناو مه کینه یه کی تر بۆ خۆی ده سووڕێ و وێنه ی نووسینی سه ر شریتی کاسێته که له سه ر کاغزێکی درێژی وه ك ئه ژو ده رده چێ وورده وورده ئه گه ر خێرایی درایه کاسیته که کاغه زه که ش خێرا ده بێت به لام نووسینه که هه ندێ کال ده ردێ و لێره دا ئێمه هه قمان به وه ی دانی یه به چ جۆره ده رمان و پله و گه رمی و ساردی و روناکی یه کدا ئه م کاسێت و کاغزه .. ده روات .

دیسانه وه به و نووسینانه دا ده چنه وه هه ر ووشه یه کی هه له بێت راست ده کرێته وه ئه و کرێکاره ی له سه ر ئاوێنه ته له فزیۆنییه که کار ده کات راستی ده کاته وه و ده یباته وه بۆ ئه و شوێنه ی که کاسێته که ووشه راسته که ده نووسێ و هه له که ش ره ش

دەبێتـەوە .. (تنضيد الكتـرونی) چاپی زۆر جـوانو نـایـاب دەردەچێو هەر گۆڤاری رۆژنامەو كتێبێك بەم ئامێـرە دەربێ نموونەی جوانی نووسینە .

## چۆنیەتی دەرچـوونی رۆژنامـەو گـۆڤـارو ... هتـد بـە (تەنضیدی ئەلكترونی)

زۆر جار ووشەی تەنضیدی ئـەلكترۆنی دەبیسـینو یا هـەندێ گـۆڤارو روژنـامە ... دەخـوێنینەوە دەزانـین كە بـە تەنضیدی ئەلكترۆنی چـاپكراوە ... بـالیرەدا هـەندێ بـاسی چۆنیەتی تەنضیدی ئەلكترۆنی بكـەینو لە جۆری كـارەكانی بدوێین ... لە سەرەوە هەندێ باسی تەنضیدی ئەلكترۆنیمـان كردو بالێرەشدا هەندێ لەسەر چۆنیەتی بەشەكانی تری بدوێین پاش چاپكردنی هەموو نووسراوەكان جا چ گۆڤار یا رۆژنامە بێت لێرەدا باسی چـاپكردنی گـۆڤار بكـەین چونكـە نموونـەی بۆ رۆژنامەو كتێبیش تارادەیەك دەبێت ... هەموو نووسراوەكان دەدرێت بـە یەكێكی بـەرپـرسیـار پێی دەووتـرێ (مصمم) نـەخشەكێش ئـەو مصممە هـەڵدەستێ بـە بـرینی هـەمـوو نووسراوەكانی كە تەرخان كراوە بۆ گۆڤارەكەو بە جیاكردنەوەی بابەتی نووسراوەكان چیرۆك فۆلكلۆر رۆشنبیری .. هتد .
هەموو ئەو نووسـراوانەش بـەراستەیـەك دەپیورێو دەست نیشانیان دەكا چونكە تا بزانێت هەر نووسراوێك چەند (سم) درێژیەتی تا بزانێت چەند لاپەڕە دەگرێتەوە دوای ئەوەی كە هەمووی بۆ روون بۆوە دەزانێت چی دەكا ..
ئـەوسـا لاپـەرەی ئـامـادەكـراوی لایـە كـە لە چـاپخـانـە نووسراوەتەوەو پێی دەڵێن لاپەرەی (تصمیم) و ئەو لاپەڕەیە بە گوێرەی ئەستوونی خۆی چوار گۆشەكەی دیاری كراوە بە هێڵی باریكو چوار گۆشەی وورد زۆر جار كاری (مصممو منفذ) نەخشەكێشو نەخشەساز یەك كەس جێبەجێی دەكات ، لە یـەكەم لاپـەرەی گـۆڤـارەكە دەست نـاكـرێ بـە (تـەنفیـذی نەخشەكێشانی) نووسـراوەكان دەبێت لە لاپـەرەی كۆتـایی گـۆڤارەكـە دەست بكری بـە (تەنفیـذی) نـەخشـەكێشـانی نووسراوەكان ... وە هەروەها لە سەرەتای نووسـراوەكانیش دەست ناكرێ بەدانانی ... دەبێت لە كۆتایی نووسراوەكـەوە دەست بكرێ بە برینی نووسراوەكەو جێگاش بۆ ناونیشانی هەر نووسراوێك دابندرێ تا جێگای بۆ تەرخان بكرێ بەو شێوەیە هەموو لاپەرەكانی گۆڤارەكـە بە چـرێش دەلكێندرێ بـەسەر لاپـەرەكانی كـاغـەزی (تـەنضیـد) وە هـەروەهـا ژمـارەی لاپەرەكانیش دەلكێندرێ بە لاپەرەكەوە تا هەڵە نەبێ زنجیرەی خۆی وەربگرێ .
دوای ئەوەی هەموو لاپەرەكـان دەبەنـە جێگایـەكو رەسمی وێنەی ئەو لاپەرانە دەگرن بە كامیرایەكی باشو تایبەتی وەك چۆن وێنەی خۆمان دەگرین ئاوا پاشان (عەكسی) لاپەرەكـان (رتوش) دەكرێ واتە ئەو جێگایانەی كە سپی دەبێت بە فلچەو دەرمـانێكی سووری تـایبەتی پـردەكەنـەوە ئەوسـا دووبارە دەیبەنەوە بۆ ژووری رەسم گرتنو رەسمی لاپەرەكان دەگرنەوە لەسەر فلیمو بە باشی دەخوێندرێتەوە ئـەگەر هـاتو یەكی لە لاپـەرەكـان بـاش دەرنـەچـووبـوو ئـەوا دوو بـارە رەسمی دەگیرێتەوە واتە گۆڤارەكە ئامادەیە بۆ ئەوەی بنێردرێ بۆ بەشی (مۆنتاج) تا بكرێت بە مەلزەمەو رووی مەلزەمەی گۆڤاریش (8) لاپـەرەیەو واتـە هەردوو دیـوی دەكاتـە (16) لاپەرە ئـەگـەر قەوارەكەی گەورەبێت ... مۆنتاج كارێكی گرنگەو زۆر ووردە ئەگەر كرێكارێكی شارەزا نەبێت ناتوانێت مۆنتاج بكاتو سەری لێ دەشێوێ مۆنتـاج كردن لە كـاری (ئوفسێت) و تـەنضیدو ووردەكاری زۆر تێدایە پاش ئەوەی كە هەموو (مەلزەمەكان) مۆنتاجو تەنضیدكرا ئەوسـا دەنێردرێ بـۆ بەشێكی تـر پێی دەڵێن (مۆنتێر) لەوێش مەلزەمە بە مەلزەمە دەخرێتە ژێر جۆرە تیشكێكی تری لە سەر لاپەرەیەكی تری گەورە چەند چركەیەك تیشكی لێ دەدرێو دەهێندرێتەوە بۆبەشی مۆنتاجو لەوێش ئەو لاپەرەیە بە هەندێ دەرمانی كیمیاوی تایبـەتی تەر دەكـرێو نووسینەكان هەمووی دەردێو دەخوێندرێتەوە ، دووبـارە بۆ ئەوەی نەوەكا هەڵەیەك پاشو پێشێكی تێدابیت .. خۆ ئەگەر هاتو پاشو پیشو هەڵەی تێدا نەبوو ئەوا یەكسەر دەنێردرێ بۆ ئەوەی بكرێ بە پلیتو تـا بنێردرێ بـۆ چاپ كـردن ، بەم شێوەیە ئیمرۆكە چاپو چاپەمەنی هەنگاوی ناوەو .. جیهانی رۆژنامەگەرێو چاپەمەنی تـەرازووەكەیـان راگرتـووە تەنیـا كوردستانـەكەی ئێمـە نەبێت بـەشی تێدانییـەو وەك پێویست سەرمان لێی دەرناچێتو خۆ زۆر سوپاسی ئـەو شارەزایـانە دەكـەین ئەگـەر هەنـدێكی ترمـان بۆ روون بكـەنـەوەو پتـر ئـاگادارمـان بكەن بـە نووسینێكی رەنگـین لەسـەر پیشـەی رۆژنامەو چاپەنیمان بۆ بنووسن جێگای رێزمانن .

# بەیتی كتك

● عەلی پەژارە ●

هەی هەی لەبە كتكێ سوور
لیل و عەباس و عەدوور
حاجی برایم و سورمەسوور
كتكی لێكردنە پێكۆر
كەس نەوێرا بچیتە ژوور

● * ● * ●

كتك دەرێ چاوشینم
درانات لێ بگرسینم
نۆ باتمانات دەرینم

● * ● * ●

هەی لەبە كتكی چاوشین
سوورە مسی دم بە خوین
كەس نەوێرا لوی بچین
.........
.........
.........
.........

خەبەرێ بدەنە ماوانێ
تێ بگەینن كابانێ
وەسەرێ كا خم خانێ
با بەرنەدا گارانێ
كتك دینی قرانێ

● * ● * ●

لەولای راهات خدرەجو
بەخوو بە سولێ بە ...
بە كوڕانان دادەچو
دەستی كرد بە هەیوهو
ئەیگوت كتك كێوە چو

● * ● * ●

لەولای راهات باسوكە
بە تفەنگی قامیشوكە
گولەی تفەنگێی پەڕوكە
ئەوی كتكێ بكوژی

ئەو زوور مێرەكی كوكە

● * ● * ●

لەولای راهات مام حاقی
كوتكەكی دا لە تاقی
گوتی ئەلحەمدو لیللا
كتكێ گوێچكە دووفاقی
پری نەدامە لاقی

● * ● * ●

لەولای راهات مام حوزێرە
نۆ گای لوخو كردنە خێرە
هاوارە كتك نێتێرە

● * ● * ●

لەولای راهات مارە قیر
كورو كاریان دەست بە شیر
ئەوا كتك كرد یەقسیر

● فەرهەنگۆك ●

لەبە : لەبەر
پێكۆر : پێكۆل ـ واتە بەپێ خال هەلدەكولێ ، نیشانەی شەڕخوازی یە لەگیاندارادا .
دەرێ : دەلێ
درانات : ددانات
بگرسینم : كردارە ـ لە تورەیی ددانەكانی لەسەریەكتر بەهێز دەكات .
باتمان : لە كوردەواریدا یەكەی كێشە .
دەرینم : پیسایت پێ دەكەم
سورەمس : سورێكی مەیلەو زەرد ، لەوانەیە لە ڕەنگی مسی سوور وەرگیرابێ .
دم : دەو ، زار
لوی : بوی

مۆوان : کوندیکە لە دۆڵی ڕۆست ناوچەی باڵەکایەتی .
کلبان : ئەو ئافرەتەی لەناو ماڵ کار دەکات ، یا کارگێڕی ماڵەوەیە .
خم : هەش
کاران : ڕانە گاو مانگاو کوێلك (چاوری)
قران : کۆتایی
سوّل : جۆرە پێڵاوێکی کوردەواری‌یە .
کۆران : کۆڵان
ئەیکوت : دەی‌گوت ... دەی‌ووت .
کێوەچوو : بۆ کوێ چوو ، چووە کوێ .

باسوکە : ناوێکی کوردی بچوکراوەیە لە جیاتی عەباس
مێرەکی کۆکە : پیاوێکی ئازاو بە جەرگە یا چوست‌و چالاك‌و لێوەشاوەیە .
کوتك : چەکوشی دار
تاق : دیوار
لاق : مەبەست لەپێ هەتا ڕانە
لۆ خۆ : بۆ خۆ
کوڕوکار : کوڕو کاڵ ، تۆلاز ، مەبەست لە گەنجانە .
بەقسیر : دیل ، گرتوو ، گرتی .

# بیمارم

مغدید احمد

ئەی وەی وەی بیمارم !
نەخۆش‌و دەردە دارم
عارەقەی سینگ‌و مەمکی
بەسمێرم ڕای دەمارم

ئەی وەی وەی بیمارم !
چەن بێکەس‌و هەژارم ؟
بۆ من خێرە ماچی تۆ
بەتیرت بریندارم

شای‌و چۆپیە لێرانە
ڕەشبەلەك ، ژن هێنانە
مادام بەتاڵن دەستم
بێ دەنگ بم زۆر جوانە

سوخمەی زەردی چەند جوانە
ئەمنی کردە دێوانە
تاقانەی باوك‌و دایکی
چەن ڕێك‌و پێك‌و جوانە ؟

هاتم لەلای هەورامانێ
بۆت مردم کراس کەتانێ
چەن جوان چۆپی ئەکێشی ؟
بەلەنجەی شانەو شانێ

هەی دەلەنگێ دەلەنگێ
چەن جوان‌و ڕێك دەلەنگێ ؟
عالەم گشت بوونە دۆست
شایی من‌و تۆ کەنگێ ؟

هاتم لەلای ئەو ژێرە
بەژنت شەتڵە شەلێرە
مادام حەزم لێ‌دەکەی
زوو زوو نامەم بۆ بنێرە

دەنگم نووسا چەن تێنیم
بەشەرم خۆ نەسێنیم
قومێ ئاوم بۆ بێتن
هێشتازۆر بەگۆرانیم

ئەی وەی وەی بیمارم !
نەخۆش‌و دەردە دارم
عارەقەی چاڵی مەمان
بەڕیشم ڕای دەمارم .

چیرۆکی فۆلکلۆری

# هەقایەتی لاس و خەزاڵ

ئەسعەد عەدۆ
کۆی کردۆتەوە

دەگێرنەوە.گوایە ڕاووشکاری ئەحمەد بەگی باڵەکی[1] هەر جارەی چل ڕۆژی دەخایەند ، ڕۆژێکیان لە کاتی گەڕانەوەی لە ڕاولە ڕێگادا دەچێتە سەر کانیەئاوێکی خاتوونان داوای جامێك ئاو دەکا .

لەو کاتەدا کچە عارەبێکی[2] نێو (خەدیجە)[3] کووندەی پڕ دەکرد ، ئەویش جامێك ئاوی پاشەوپێش بۆ ڕادەگرێ ، ئەحمەد بەگ سەرسام دەبێ و لە دڵی خۆیدا بڕیار دەدا کە داخوازی بکات و نزیکی نەکەوێ تا خۆی دۆخینی نەکاتەوە !

ئەحمەد بەگ دەچێتە خوازبێنی خەدیجە و پێشکەشی دەکرێ ، بەڵام کەس‌وکاری باوکی ئافرەتەکە نارەزایی خۆیان بەرامبەر برا گەورەیان دەردەبڕن کە گوایە چۆن کچی ئەداتە بێگانە . بەهەر جۆرێك دەبێت ئەحمەد بەگ ئەیگوازێتەوە بەڵام نزیکی ناکەوێ !

ماوەیێك بەسەر بووکایەتیان تێدەپەڕێ .. ڕۆژێکیان دایکی بووك دێتە سەردانی کچی ، بۆی دەردەکەوێ کە زاوا تا ئێستا دەستی لێنەداوە بۆیە بە ئەحمەد بەگ دەڵێ : «دەبێ کچەکەم بەرمەوە بۆ باوەخوونی»

دایك و کچ گەڕانەوە ماڵ و هەواڵەکەش لە نێو کەسوکاریان بڵاودەبێتەوە و بڕیار دەدەن کە ئەحمەد بەگ نێرەمووکە و مارەیی لە کچەکە نەهاتوە ! ئینجا کچەکە ئەدەنە ئامۆزای .. لە ڕۆژی گواستنەوەی خەدیجە بۆئامۆزای ئەحمەد بەگ دێتە ماڵی خەزووری بۆ ئەوەی خێزانەکەی بباتەوە .

کاتی گەیشتنی ئەحمەد بەگ بۆ ماڵی خەزووری دەشڵەژێن چونکە ئەحمەد بەگ لە پاڵەوانیەتی بێ هاوتابوو ، باوکی خەدیجە دەیەوێ پیلانێکی بۆ ڕێك بخات بۆیە بە قاوەچی دەڵێ : «قاوە دابەش بکە و هەرکەسێك یەکەم فنجانی قاوەی دەستت وەربگرێ دەبێ بچێتە ئەو چۆمە شێرێکی تیایە بیکوژێ !!

ئەحمەد بەگ بانگی قاوەچی دەکا و فنجانی قاوەی لێ وەردەگرێ‌و فڕی دەکا و بەرەو چۆمەکە دەکەوێتە ڕێگا ، پاش ماندووبوونێکی زۆر ئەحمەد بەگ شێرەکە دەکوژێ و سەری دەبڕێ و کەوڵی دەکات و لەسەر پێستەکەی لە ژێر دارلاسێك لێی ڕادەکشێ !

خاتوو خەدیجە لە پەردەی بووکایەتی بەرەو چۆمەکە ڕادەکا ! کاتێ دەگاتە ئەو شوێنەی کە ئەحمەد بەگی لێ ڕاکشابوو سەری سووڕما و لە دڵی خۆیدا گووتی : «دەبێ ئەوە پیاو بێ ! بەخوا دەبێ تاقی بکەمەوە !»

ئینجا دەستی بۆ دۆخینەکەی درێژ دەکا و ئەحمەد بەگ هوشیار دەبێتەوە و گوراوی خۆی دەباتەوە ، بۆیە هەر لەسەر پێستەی شێرەکە و لە ژێر دار لاسەکە لێی بە زاوا دەبێ ! ئینجا دەگەڕێنەوە ماڵی خۆیان لە دوای نۆ مانگ کوڕێکیان دەبێ و نێوی دەنێن لاس .

هەروەك ئەحمەد بەگ چۆن لە سوارچاکیی و ڕم بازی و ئازایەتی بێ هاوتابوو ، لاسی کوڕیشی هەروەك خۆی ، کورد گوتەنی : «ماڵیش بە ماخۆی نەچێ حەرامە» .

لاس گەیشتە هەرەتی ژن هێنان باوکی زۆر هەوڵی لەگەڵ ئەدا بۆ ئەوەی ژن بێنێ ، بەڵام دڵی لاس تا ئەوکات کەسی پەسند نەکردبوو !

شەوێکیان لەو کاتەی کە کەلەشێری خەوتنان[4] بانگی دەدا و خەو لە چاوی لاس هەڵمابوو ، لە ژوورەکەی هاتە دەرەوە و بەرەو دیوەخان خزی و هاتە لای مام دەروێشی مێوان ، دەروێشی مێوانیش لەبەر ئازاری قاچ و مل حەسانەوەی نەبوو ، پیر و لاو کەوتنە بەرامبەر یەکتر و گرێی دڵی خۆیان بۆ یەکتر دەکردەوە !

لاس بە دەروێشی ووت : «مامە گیان باوکم پەلەم لێ دەکا کە ژن بێنم ، منیش تا ئێستا چ ئافرەتێکم نەکەوتۆتە بەر دڵ ، تۆیش جگە لەوەی بە تەمەنی بەڵام گەریدەی کوێستان و گەرمیان دەکەیت چ ئافرەتت بەرچاو نەکەوتوە کە شیاوی من بێ ؟»

دەروێشیش پێی گووت : «کوڕم ئەوەی من بزانم چوار خاتوون هەیە کە شیاوی تۆ بن ... یەکیان خانزادی هەریری و یەکیان خەزاڵە شۆڕی مەلا نەبی کە لە جیاتی نۆ خوێن مارەبڕی (وەیسی وسو کاسکیان)[5]ە ، ئەوی تریان خەزیمە شۆڕی دەسگیرانی ئاغا ماڵ ماڵی و ئەوی تریان ئایشە گووڵ»[6] دووبارە لاس پێی دەڵێ : «بە ڕای تۆ کامەیان خاتوون ترن ؟» دەروێش دەڵێ : «بە من دەکەیت بە دوای خەزاڵە شۆڕی مەلا نەبیان دەکەوی» . ئینجا لاس پێی دەڵێ : «بەیانی لە گەڵ کازیوەی

ئەو نامەیەم بگەینە خەزاڵە شۆڕی»
بۆ سپێدەی زوو دەروێش بەرەو هەواری ماڵی خەزاڵ دەکەوێتە ڕێ تا لە چیای بەنیهەریر ئاودیو دەبێتەوە ، لەو کاتەی دەروێش دەگاتە بەر ڕەشماڵی خەزاڵ دەنگ دەدا و خەزاڵیش دەڵێ : «فەرمو وەرە ژوورەوە مام دەروێش وا لە (کوولینم)» .
مام دەروێش دەچێتە ژوورەوە و نامەکە دەداتە دەست خەزاڵ ، لە گەڵ خوێندنەوەی نامە و بە سەر هەڵگوتنی مام دەروێشی بەسەر لاسی ئەحمەد بەگ یەکسەر عیشقی دەبێ ! ئەویش ئەنگوستیلەیکی خۆی بە دیاری بۆی ڕەوانە دەکا ! ئینجا لاس بە جلی دەروێشی لە گەڵ مام دەروێش بەرەو ماڵی خەزاڵ دەکەوێتە ڕێ ...

«وەکی کاکە لاسی ئەحمەد بەگی بارەکییە
دەچتەوە ناو گەورە ماران ماریّ داود و مەلا نەبییان هەر بە بەرگەکی دەروێشییە»
«دەگەڕا لە ناو گەورە ماران ماریّ داود و مەلا نەبییە
بەدووی دەکەتن کیژۆرەکانی چاردە سارییە
دەیانگۆت دایەکە دایەکە ئەوە دەروێشە دەروێشەکی چەند ڕووح گەورەیە نەلەمە وەردەگری مراکە مراکی دەڕوونییە
نەچەنکە چەنگی ساواریێ بنەکەچییە»
«دەرێ پیرێژنەکی حەکاکی زەمانی دەوری بەرایی هاتییە
دەیگۆت کیژم بەو خودایکەم لە ژووری سەرییە
ئەوە دەروێشە دەروێشی مراکە ڕوونی و چەنگە ساواری نییە
ئەوە دەروێشە دەروێشی عەشقییە»
«ئەنگۆ دیقەتی خۆتان بدەنە بارایێ بابە دەروێشم دەرێی دارەکانی شەنگەبییە
دیقەتی خۆتان بدەنە چاوێ بابە دەروێشم دەرێی سێوەکانی لاسۆرە باغەوان لەسەر لقی داری لەبیر کردییە
لایەکی ئەنگافتییە»
«ئەوجە دەچتەوە کن گەورە ماران ماریێ داود و مەلا نەبییە
وەکی دیتی خەزارە شۆڕ لەبەر دەرکەی مەشکۆرەی دەژینی هەر بە عەینییە
سەلامەکی دەکردەوە لە کارەکەران دوایش لە ناسکە بیرییە»

«خەزارە شۆر گازی دەکردەوە (ستی) و (رابی) و (خووبی) سەرتان هەرینم لە بارەکی دەشینییە
ئەمن دونیێ ئێواریێ مەنجەرەکی زنجیردارم ڕوون گەرم کردییە
لەگەر باتمانەکی کەرەی سپییە
ئەنگۆ بینن لەبۆ بابە دەروێشی نورانییە
ئەرێ بابە دەروێش بەو خودایکەم لە ژووری سەرییە
ئەمن چیدیکە ڕوونی بەر دەستیم نییە
نەکو پێشکێشی تووم ئەوەندە نییە»

«ئەوجە کاکە لاسی ئەحمەد بەگی بارەکییە
گازی دەکردەوە خەزارە شۆڕێ مەلا نەبییە
دەستەنگای توو هەر ئەوەندەیە ئەوەندە لە کنە من چ وجودی نییە ئەتوو وەرەوە کنە من شەرتبی بدەمێ هەر بە جۆکەیێ دەڕوونییە»

«ئەرێ خەزارە شۆڕێ مەلا نەبییە
ڕەبی خودا سەبەب کاریێ من و توو بگری وەکی ئەمنی دەناردەوە کوێستانی فەراشی هەر بە سایەلییە»

«ئەگەر ئەمن دەمزانی سوار دەبوومەوە لە شینکەی شێخ غەزالی عارەبییە
دەستم دەداوە ڕمەکی سەر بە تۆپراکەی بن گورگەییە
لەبەرە خۆم دەکردەوە زرێیەکانی لەوانی ئارقە هووردییە
لەبەر پشتی خۆم ڕادەکرد خەنجەرەکی دەبانی نیرۆبەکییە
لە شانی چۆپەم بڕۆیشتابایە سەدوپێنجە سواری کورە کورەی دەجاقییە
لە شانی ڕاستەم بڕۆیشتابایە سەدوپێنجە سواری کورە عارەبییە

**ئەوجە خەزارە شوڕ هەنگێ دەمهینا یان بە مارەکی زۆر یان هەر بە زۆردایی‌یە»**

کاتێ خەزاڵ ئەو بەندەی دوایی گوێی لێ بوو گووتی : «کورە مارت وێران بی دەروێش دەنا ژوانی من و توو بن تاورەی ماری مەلا نەبی‌یە» . ڕەشماڵی مەلا نەبیش لەسەر دوازدە ئەستونەگە بووە لایکی ماڵ بووە و لایکی دیوەخان ، ئەو شەو لاس بە مێوانی لە دیوەخانی مەلا نەبی لێی ڕاکشا ! کاتێ ئێوارە داهات جوامێرەکانی هەموویان لە دیوەخان کۆبوونەوە و دەستیان کردە یاری گەرەلاوژە .

هەر یەکە لە دانیشتوانەکانی دیوەخان بەندی خۆیان چڕی و نۆبەت گەیشتە سەر مێوانی و گووتیان : «فەرموو بەندەکمان بۆ بڵێ» . ئەویش ووتی : «بەخوا هیچ نازانم» . پێیان ووت : «ئەگەر بەندی خۆت نالێیت دەبێ بقوڕی !»

ئینجا ووتی : «چ بڵێم بەخۆم هیچ نازانم بەلام دوێنێ لەو کاتەی نزیك هەواری ئێوە بووم شوانێکتان لە کاتی دان‌وئاوێر ئەو بەندەی دەچڕی ، بەلام نابێ لێم سڵ بن ! ئەوانیش سەریان بۆ هەژاندەوە ..

**«خەزارە شوڕێ مەلا نەبی‌یە**

**خۆزی بە خۆزی داران ئەمن شترەکی بامایە لەوان ،شترەکانی دەسێوی‌یە شین بیامایەوە لە سەروچاوەی کانی‌یە**

**ئەمنیان ببڕی‌بایە ، ئەمنیان ببردابوایە کن وەستان و وەستاکاران ئەمنیان بکردابوایەوە تەشیەکانی لەوانی خۆش دەستی‌یە بە دیاری ئەمنیان بناردابوایە لەبۆ خەزارە شوڕێ مەلا نەبی‌یە بەمنی بڕێستابایە ڕانکی شوانی و بارزوونگێ ئەوان ناسکە بیری‌یە»**

جوامێرەکان هێرشیان بردە سەری و جوێنیان پێدا ، بەلام خەزاڵ لە ژوورەوە بە دەنگ هات و گووتی : «ئێوە پێتان ووت سڵ نابین ، ئەوەتان لە چی ؟»

خەڵکەکە بلاوەی لێ کرد و دیوەخان چۆل بوو جگە لە (کارکانە کەچەڵ)ی شوان و چاودێری خەزاڵ لە لایەن ماڵی (وەیس) ، ئەویش ـ واتە کەچەڵ جێگاکەی خۆی لە پشت چیغی ڕەشماڵ ڕاخست !

لە دوای ماڵ نووستنان خەزاڵ بانگی کارە کەرەکانی خۆی کرد و پێیان ووت : «هەی سەرو لە هەشێنیم بای چەپەشین و شارەشین دەبزێوێ لە بنی دەبروسکێنی باوبارانەکی گەلە گەورەی هینا(1) ، بابم پیرە خۆی ڕاناگری ! هەستن کەمەندی باوێنە ڕەشماڕێ ، هەستن سینگ و بەرچیغان توندکەنەوە هەنووکە دەبیتە باوباران» .

شوێنێکیان بۆ باوکی لە ژوورەوە ڕاخست و چەند کەل‌وپەلیان هەبوو بەسەریان دادا و خەزاڵیش بەخۆیشی ئەو شەوی لە گەل لاسی بەسەر برد ! لە بەرەبەیانیان لاس بە خەزاڵی ووت : «من دەگەڕێمەوە ماڵ و خۆم ئامادە دەکەم بۆ خوازبێنیت» .

خواحافیزیان لە یەکتر کردو پێش ئەوەی لاس پێی باوێتە ڕکێفی بیست و چوار ماچی لە گەردەنی خەزاڵ کردو کارکانە کەچەلیش زەقەی چاوی دەهات ! کارکانە کەچەڵ لە دوای خەزاڵ هاتەماڵەوە بۆ ئەوەی بیانوی پێبگرێ ، بۆیە پێی ووت : «ئیستاکە نانی خۆم و هەردوازدە سەگ و هەرچواردە شوانم دەوێ !» خەزالیش پێی گووت : «کارکانە ئەمرۆ نانمان نەماوە ، بەلام کەمێك ڕاوەستە ئیستاکە (ستی) و (ڕابی) بانگ دەکەم و نانت بۆ ئامادە بکەن ، بەلام گرناگەی کەچەلی ئەوە بوو کە لەلایان بڕوات و هەوالی لاسی ئەحمەد بەگی بە وەیس بگەینێ !

کاتێ کارکانە کەچەڵ گەیشتە دیوەخانی ماڵی وسوی کاسکیان وەیس پێی ووت : «ها .. کارکان خێرە ؟» ئەویش گووتی : «شەوی ڕابووردوو لاسی ئەحمەد بەگ لە باخەلی خەزالی نوستبوو و بەرەبەیانیش بیست و چوار ماچی لە گەردەنی کرد !

وەیس بەو هەواڵە دین بوو ، هەڵسایە سەرپێ ، بەلام مامی کە ئێوی (چرکن) بوو هێمنی کردەوە و پێی ووت : «ڕۆڵە شوورەیی‌یە ، وانابێ ! من لەوبڕوایە دا نیم کە خەزال ئەوکارە نارەوایانە بکات و بەیانیش پێکەوە ئەچینە مالیان ، ئەگەر پێشوازیمانی کرد ئەوا کەچەڵ درۆی کردو ئەگەریش پێشوازی نەکردین ئەوا ڕاستە و دۆستی هەیە :

لەوکاتەی وەیس و مامی گەیشتنە ماڵی مەلا نەبی ، خەزاڵ چەند زێروزیوی هەبوو خۆی پێ‌ڕازاندەوە و بە پیریانەوە چوو بەخێرهاتنێکی گەرمی کردن و جەڵەوی وولاخی مام چرکنەی گرتوو ماینی لە وەیس وەرگرت . زۆری ڕیز گرتن ئینجا

چرکن لە ژێرەوە بە وەیسی گووت : «باشە ، هەی بێ هۆش ویستت بەقسەی کارکانە کەچەڵی بکەی - بڕوانە چۆن خزمەتمان دەکات !» . وەیسیش سەری بۆ لەقاند .

چرکن بە مەلا نەبی ووت : «ئێمە هاتووین کە ڕێگامان بدەیت خەزاڵی بگوازینەوە» . مەلا نەبیش گووتی : «کاکە گیان من کچم داوەتە ئێوە ، جا کەیفی خۆتانە» .

چرکن و برازای گەڕانەوە بۆ ماڵ ، حەوت شەو و حەوت ڕۆژ دۆل و زوورنایان گێڕاو داوەت ڕانەوەستا !

خەزاڵ هیچ فرسەتێکی نەما جگە لە ڕاکردن بەرەوماڵی خانزادی هەزیری ! ڕۆژێکیان خەزاڵ دەچوە سەرکانی لە ڕێگادا پیاوێکی بینی بەپەلە ڕا دەکا و لێی پرسی : «خاڵۆ ئەوە چیت لێ قەوماوە ؟ » . کابراکەش دەڵێ : « جوانەماینێکم وون بوە ، دەڵێن لەگەڵ دەواری لاسی ئەحمەد بەگی یە » خەزاڵ خۆی دەخیل دەکا و نامەیەکی لەگەلا ڕەوانە دەکا ؛ نامەهەڵگر گەیشتە لاسی و نامەکەی دایە دەستی .. ئەویش ماینێک و جوانێکی پێشکەش دەکا و یەکسەر دەگەڕێتەوە ماڵ .. بە ایکی ووت : « دایە گیان ئەوە نامەی خەزاڵە ، ئیستاکە لەلای خانزادی سۆرانە و چاوەڕوانی چوونمە ، جا چ دەفەرمووی بەتاکە سواری بڕۆم یان لەشکری ببەم ؟ »

دایکی پێی دەڵێ : « گەردەنت ئازا ناکەم ئەگەر بێتوو بە تاکە سواری نەچیت ! ئەگینا باوکت پێم دەڵێ ئەوە لەمن نیە ! » لاس لەگەڵ ئەو قسەیەی دایکی مەست بوو .. بەرەو هەریر کەوتە ڕێ ...

**« ئەوجە کاکە لاسی ئەحمەد بەگی بارەکی یە**
**سوار دەبۆوە لە شینکەی شێخ غەزالی عارەبی یە**
**دەستی دەداوە ڕمەکەی سەر بەتۆپڕاگەی بن گورگەیی یە**
**سێشەو و سێ ڕۆژی هاژووشتی یە**
**دیتی چکی ئارەقەی لەبن کێێ شینکەی شێخ غەزالی بەدیار کەتی یە**
**دەیگۆت بەو خودایکەم لە زووری سەری یە**
**مەعلوومە نەکبەتە شانی منی گرتی یە ،**

**« ئەرێ شینکەی شێخ غەزالی عارەبی یە**
**ئەمن شەڕی حەفت شەو و حەفت ڕۆژم بەتوو کردی یە**
**چ جاران چکی ئارەقەت لەبن کێێ بەدیار نەکەتی یە**
**ئەوڕۆ سەری سێ ڕۆژە ئەتو چکی ئارەقەت لەبن کێێ بەدیار کەتی یە**
**مەعلوومە نەکبەتە شانی منی گرتی یە ،**

لاس سەری سوور دەبێ لە ئارەقەکردنی ماینەکەی ، کاتێ دەبینێ دوو ناڵی فڕێ داوە !

**« بای دەداوە دەیگۆت هەتا وەکو کوێم» لێ بەدوور نەکەتی یە دەستەوە کن وەستان و وەستاکاران دەیگۆت ئەتوو لەبۆ من بینە جۆتە نارەکی لەبۆ شینکەی شێخ غەزالی عارەبی یە**
**هەرنارەکی لەبۆیان دەهینا هەروەکی نان دووکەرتکی کردی یە**
**دەیگۆت کەلکی شینکەی شێخ عەزالی نی یە**
**لەبۆی دەینا جۆتە نارەکی پۆڕایی حەوێزی یە**
**دەیداوە لەبن پێی شینکەی شێخ غەزالی عارەبی یە**
**دەیگۆت ئەوجە بزانم پێشکێشی ئاغای گرانم چی یە**
**ئەویش دەیدایێ چەنکەك لیرە ئەگەر تومەن بوو ئەگەر مەجیدی یە»**

**«ئەوجە دەچتەوە کن خاتوون خانزادی دەشتی هەریر و هەریر بەگی یە**
**ئەوجە کاکە لاسی ئەحمەد بەگی بارەکی یە**
**دەیگۆت ئەرێ خاتوون خانزادی دەشتی هەریر و هەریر بەگی یە**
**پێم بڕێ بزانم ئەو ئامانەتیەکەی لێرانە بوو بەخۆی ڕۆیشت یان ماری وسوی کاسکیان بەزۆردای بردی یە»**

لەوکاتەی خانزاد لاسی دەبینی ئاوردەگرێ و لە دڵی خۆیدا دەڵێ : «ئەمن دەبێ کارێکی وا بکەم کە خەزاڵی لەپێش چاو ڕەش بێ !»
بۆیە دەڵێ :

**«ئەوجە خاتوون خانزاد دەیگۆت کورە مارت وێران بی لاسی**

**ئەحمەد بەگی بارەکی‌یە**
**بەوخودای‌کەم لە ژووری سەری‌یە**
**ئەتوو بە شەوت دیتیە بە رۆژت قەد نەدیتی‌یە**
**هەتا وەکو دونێکە لێرانە بوو چەند مندارو شوان و گاوان**
**و بەرخەوان بەقوونیان دا هەر بردی‌یە**
**ئەوشۆکە نازانم کێهان شوان و گاوان لە بۆخۆیان ڕەواندی‌یە»**

لاس وەلامی دەداتەوە :

**«کاکە لاسی ئەحمەد بەگی بارەکی‌یە**
**دەیگوت ئەرێ خاتوون خانزادی دەشتی هەریر و هەریر بەگی‌یە**
**بەوخودای‌کەم لە ژووری سەری‌یە**
**ئەمن لەپاش خەزارە شۆڕێ مەلا نەبی‌یە**
**ژینی دونیاییم هەموو لەخۆم حەرام کردی‌یە»**

کەخانزاد زانی بەندەکەی کاری نەکرد گوتی :

**«کورە مارت وێران بی کاکە لاس خەزارە شۆڕی بینە**
**ئەمنیش هەر بەکارەکەری‌یە»**

لەوکاتەی خەزاڵ ڕای‌کرد باوکی تەتەرێکی ناردە ماڵی وەیسی هەواڵەکەیان پێ‌بگەینێ ! وەیسی زاوا بەتەتەری دەڵێ : «بە ماڵی مەلا نەبی بڵێ بەیانی بێنە مەیدان شەڕە !»
باوکی خەزاڵیش دەچێتە لای خانزادی سۆران بە مەرجی ئەوە خەزاڵ دەگەڕێنتەوە تاکو پیاوێکیان مابێ ـ نابێ بدرێتە ماڵی وسوی کاسکیان !
لاس هەریر بەجێ دەهێڵێ ...

**«ئەوجە وەکی کاکە لاسی ئەحمەد بەگی بارەکی‌یە**
**دەچتەوە کن خەزارە شۆڕێ مەلا نەبی‌یە**
**دەچتەوە کن مارێ داود و مەلا نەبی‌یە**
**دیتی خەزارە شۆڕ لەبەر بێریێ مەڕی‌یە**
**سەلامەکی دەکردەوە لەکارەکەران دوایش لە ناسکە بێری‌یە**
**گازی دەکردەوە ئەری خەزارە شۆڕێ مەلا نەبی‌یە**
**لۆچی لەبەرتوو بەرگەکی خاوشینی عارەبی‌یە**
**تووخوا پێم برێ بزانم ئەوە تازیەی (حمەد) ی برایە یانەکو**
**تازیەی مەلا نەبی‌یە»**
**«خەزارە شۆڕێ مەلا نەبی‌یە**
**گازی دەکردەوە کاکە لاسی ئەحمەد بەگی بارەکی‌یە**
**دەیگوت کورە مارت وێران بی ئەتوو قەولی حەفت شەو و حەفت**
**ڕۆژت لەگەرە من گرتی‌یە**
**ئەوە سەری سێ مانگە ئەمنت بەجی هێشتی‌یە**
**سبەینێ مارێ وسو کاسکیان لەبۆ خۆیان دەمبەن هەربەزۆرداری‌یە»**

لەوکاتەی لاس ئەو هەواڵەی بیست سواری غەزاڵی بوو بەرەو ماڵی وسوی کاسکیان ڕۆیشت . کاتی گەیشتنی بینی ئەوە وەیس لەسەر جۆنی قاوەی دانیشتوە و مام چرکنەش لە نزیکی ڕاکشاوە ! سەلامی کردو سەلامیان وەرگرتەوە ، دەپرسێ و دەڵێ :
«هۆی چیە کۆتایی بەوشەڕە نامێنن ؟» . وەیسیش دەڵێ : «تۆ مێوانی و نان و قاوەی خۆت بخۆ و هیچ ئیلاقەت بەو شەڕە نەبێ !»
لێیان ناگەڕێت و ئەوانیش بۆی دەگێڕنەوە ئینجا بە وەیس دەڵێ : «کچێك بێ و تۆی بەدڵ نەبێت ، تۆ ئەو کچەت بۆچیە ؟»
وەیس قینی هەڵدەسێ و قسەی پەرت وبڵاو دەکات ، لاسیش خۆی بۆ ئاشکرا دەکا و دەڵێ : «بەیانی دابەزە مەیدان ! هەرکەسێ لە ئێمە کوژرا خەزاڵ بۆ ئەوی تربێ» ئینجا لاس دەگەڕێتەوە لای خەزاڵ .. بۆ بەیانی بە خەزال دەڵێ : «بەرگی بووکینی بەسەر خۆتدا هەڵبکێشە ولە سەری مەیدان بۆم ڕاوەستە چونکە چاوی تۆم لێ دیاربێ بەتینتر دەبم !»

**«ئەوجە کاکە لاسی ئەحمەد بەگی بارەکی‌یە**
**گازی دەکردەوە (وەیس) دەتوو لەبۆ من هەرێوە**

**هەتاوەکو سەری مەیدانێ لەسەرەتوو هەربشەقێنم**
**زمەکەی سەر بەتۆپراکەی بن گورکەیی یە**
**لە پێش چاوی خەزارە شۆڕێ مەلا نەبی یە**
**شەرت بی بددەمێ سەدوپێنجە بەردیلی بەربەرانیە هەر بەعەینی یە،**

**،وەیس دەرێ ناماقولیەکە کەلە گەورە و گرانت کردی یە**
**دەتو لەبۆمن هەرێوە هەتاوەکو سەری مەیدانێ ئەمن لەسەرە**
**توو هەربشەقێنم ڕمەکەی سەر بەتۆپراکەی گورکەیی یە**
**لە پێش چاوی خەزارە شۆڕێ مەلا نەبی یە**
**شەرت بی خەزارە شۆڕت لۆ تەڕاق بدەم هەربەخوڕایی یە،**

هیچیان ناسەلمێنن دەبێتە شەڕیان تا نوێژی نیوەڕۆیێ کەسیان ناکەوێ ! پاشدان هەردووکیان ڕێك دەکەون کە جل و بەرگیان لەبەربکەنەوە و دەستی چەپەیان لێك ببەستن و بە خەنجەر لەیەکتر بدەن ! !

وەیس بیست و دوو خەنجەری سەرتیزی لە لاس دەداو ئەویش هەژدە خەنجەری دەوەسێنی و دەستی لەسەر دەلەقاند !

وەیس دەمرێ و لاسیش بە قوربانی مردن دەبێ ، خەزاڵ بیست و دوو پزیشکی بۆ بانگ دەکاو هەر برینێك دەداتە دەست پزیشکێك و خەلاتیان دەکا !

پاش ماوەیێك لاس چاك دەبێتەوە خوازبینی خەزاڵی لە باوکی دەکاو بەرەو ماڵی خۆیان دەکەونە ڕێگا ...

## پەراوێز

1 ـ چوار دەقم بیستوە دووانیان (باڵەکی) یە و لەوانی تر (شارەزووری)ە هەروەها دەڵێن ئەحمەد بەگ لە کوردەکانن ـ واتە لە هۆزی (کوردە)ی کورد کە ئێستا لە گوندی (چەمرگە) و دەوروپشتی دادەنیشن . ڕای من ئەوەیە کە ئەحمەد بەگ باڵەکی یە و لە ناوچەی شارەزوور دانیشتوە و هیچ پەیوەندی بە خانزادی هەریری نیە چونکە خانزاد خوشکی سولەیمان بەگە و منداڵی میر شاقوولی بەگن ، لە دەقی ئۆسکارمان خانزادی هەریری کچی مەحمود ئاغایە و ئامۆزای لاسە وا بزانم ئەوەش لە ڕاستی دوورە چونکە مێژووی میرانی سۆران تا ڕادەیێك ڕوونە .

2 ـ گوایە سالێکیان نەهات دەبێ و ئەو عێلە ـ واتە عێلی ماڵی خدیجەی خێزانی ئەحمەد بەگ دایکی لاس ـ ڕوو دەکەنە ناوچەی کوردستان بۆ گوزەرانی ، ئەحمەد بەگیش لەسەرکانی چاوی پێ دەکەوێ و دەیخوازێ .

3 ـ لە دەقی ئۆسکارمان نێوی (شەمێ) یە .

4 ـ کاتی نووستنان واتە لە دوای بانگدانی کەلەشێری ژن زیز بوون .

5 ـ وسو کاسکیان تیرەن یان باشتر بلێن بنەماڵەن ئێستاکە لە گوندی (باویە) ی خدر ئاغای وسو کاسکیان نزیك (سپیلك) سەر بە ناوچەی (هەریرە) .

6 ـ وابزانم لەگەڵ ئایشەگوڵی هەکاری یە .

7 ـ گوایە ئەو هێنان و بردنەی خەزاڵ هەموو درۆ بووە چونکە لەوکاتەی کارەکەرەکان هاتوونەتە دەرەوە دیویانە ئاسمان ساماڵە ، بەلام خەزاڵ بۆیە وای کردوە تا باوکی بچێتە بنەبان و لەلای دیوەخان دوور بکەوێتەوە بۆ ڕاموسانی خۆی .

8 ـ لێرەدا زیاتر بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە لاس کوری ئەحمەد بەگی خەڵکی شارەزوورە چونکە بە کوێێ تێ پەڕیوە بۆیە دەڵێ «هەتا وەکو کوێم لێ بەدوور نەکەتی یە» . ئەگەر باڵەکی بێ و لە ناوچەی باڵەکیان بێ بۆ دەگاتە کوێێ و ناوی کوێێ دێتە ناو بەندەکە ؟ .

## فەرهەنگۆك

**ئاودیو** : دەپەڕێتەوە ، لەولایە بۆ ئەولا .
**ئەنگافتی** : گۆواو
**ئەوجە** : ئینجا
**ئەنگۆ** : ئێوە
**ئەوشۆکە** : ئەمشەو ، ئەوشەو
**ئەستونگ** : ئەستونی ڕەشماڵ ، ئەو دارە درێژانەی کە ڕەشماڵی لەسەر ڕادەوەستێ .
**باوەخوون** : کاتێ یەکەم جار بووك دەچێتەوە ماڵە باوکی .
**بارەکی** : باڵەکی
**بەدووی** : بەدوای

بنەکەچی : پووچ ، دانەویلەی ژێر گونیە
بارایێ : بالا
بەقوونیان : تیلك پیٚوە کردن
بقوڕێ : لاسای مانگا واتە دەنگی گوێ .
پۆرا : پۆلا
پارزوونگ : ئەو تیرەکەیە کە ئافرەتی کۆچەری منداڵ وەیان کەل و پەلی تیا ئەخەن .
تاور : ڕەشماڵ ،
چونی : ئاون ، هاون
جاف : هۆزی جافی کورد
چیغ : لە قامیش دروست دەکریٚ و لە دەورو پشتی ڕەشماڵ ڕای دەوەستێنن .
حەکاکی : مەکرباز ، زانا
خزی : بۆ ئەولا خزی ، بۆ ئەولا چوو ، ڕۆیشت
خەزار : خەزاڵ
دەچتەوە : دەچێتەوە ، دەگەڕێتەوە
دەرێ : دەڵێ
دیقەت : تەماشاکردن ، لیٚڕووانین
دیتی : بینی
دەشینی‌یە : وەك بلیٚی لە قورنت نیم وەیان لەخم .
دەنا : ئەگینا
دان و ئاوێر : ئەو کاتەی کە مەڕ هەوێر دەکرێ
دین : شێت
دەوار : ڕەشە وولاخ
دونێکە : دوێنێ
سار : ساڵ
سەرتیز : سەرپێست ، مانای زامێکی قوول نیە
سایەلیە : بە پرسیارکردن لە (سائل)ی عەرەبیەوە هاتوە
غەزالی : ناوی ماینی لاس بوە
قەد : هیچ
کووندە : لە پێستی بزن دروست دەکرێ لە گوندەکان ئاوی تیا دەکەن .
کوولین : شوێنێکی تایبەتیە لە لایێکی ڕەشماڵ بۆ دانانی ئازووقەی ماڵ .
کێهان : کامەیان
کن : لای
کوراو : واتە ئەو نەهێنیەی لە دلیٚدا بوو ،
گاز : بانگ کردن
مراك : کەوچك
مەشکە : لەپێستە مەڕ دروست دەکریٚ و ماستی لە نێو دەکریٚ و دەبێتە دۆ لەدوای ئەوەی کەرەکەی لیٚ دەگرن .
ماران : ماڵ ، ماڵان
وەکی : وەکو
هەڕەت : ئەو تەمەنەیە کاتێ ئامادەیە بۆ ژن هێنان
هەرمابوو : خەو لەچاوی شکابوو ، واتە خەوی نەدەهات .
هەرینم : هەڵێنم
هەنگێ : ئەو کات ، ئەو دەم
هەنووکە : ئێستاکە
هەرێ : خاردان ، بەزین

## ئەم ڕوون کردنەوەیە

هەروەك زانراوە فۆلکلۆر گەنجینەی میللەتە ، ئەو بابەتە فۆلکلۆریانەش بە درێژایی سەدان ساڵ گۆڕانێکیان بەسەردا دێ ، لە ناوچە یەك بۆ ناوچەیەکی‌تر وەیان لە یەکێك بۆ یەکێکی‌تر بەلام ناوەرۆکەکەی هەروەك خۆیەتی . ئێمەش وەك میللەتانی تر هەر لە منالیەوە مێشکمان بە چەندان هەقایەت و گۆرانی فۆلکلۆری ئاو دەدریٚ لەو هەموو بابەتانەش هەقایەتی «لاس و خەزال»ە .

بەش بەحالی بۆ یەکەم ئەو هەقایەتەم بە نووسین لە (تحفە مظفریە)ی ئۆسکارمان بینی ، نەوەك هەر لەسەر زاری خەڵکە سەوادەکەمان بیستوە ، دەمێك بوو حەزم دەکرد بەراووردێکی ئەو هەقایەتە بکەم ئەوی بلاو بۆتەوەو ئەوی خۆیشم هەمە ، بەلام دەردە (گورچیلە) جگە لە کونجی نەخۆشخانەکان زیاتر ڕێگام نادات . بەلام لەو دوایەدا گوێ بیست بووم کە چەند ڕۆشنبیرێکی‌تر دەقی ئەم هەقایەتەیان هەیە ، بۆیە بە راوورد کردنەوەکەم دواخست بۆ هەلێکی تر بەلکو چاوەڕوانی بلاوبوونەوەی ئەو دوو دەقە دەکەم کە لە لای ڕۆشنبیران (طارق جمباز) و (ناظم دلبەند)ە ، ئینجا بەراوورد کردنی خۆش دەبێ ، کورد گوتەنی : «گۆم چەند قوول بێ مەلەی خۆشترە» خۆ ئەگەر ڕۆشنبیرێکی تر بەراووردیان بکات ئەوە باشتر ، پێش ئەوەی گلەییم لیٚ بکەن و بلێن : سەرچاوەکەی دیار نیە ؟ منیش دەلێم ئەمانەتی ئەدەبیم زۆر لە لاگرنگە ، بەلام بڕوا بکەن ئەو کەسانە ، وەیان باشترە بلێم ئەو کەسەی بەندەکانی بۆ چڕیم ئەگەر ناوی بنوسم ، گەردەنم ئازاد ناکا ! هەندێك خەڵکیش ئاگاداریان هەیە .

# سێ سیناریۆی کورت

رفعت عمر پیربال

« 1 »

چاوم لێتە :
سواری ئەسپی ووشە بوویت و
شەورازی پرسیاران دەبڕیت …
ئەی بۆ دەڵێن :
« سەدەی موعجیزە نەماوە » ؟
ئەی ئەوەنیت ،
ڕێگەی نەهات ،
بە تەنیایی ، لەتاریکیی شەوا دەبڕیت
ووشە ، ووشە
هێشووی وەڵامەکان دەڕنیت … ؟

* * *

ئاخۆ ، گەر تۆش
وەك من جارێ ،
کۆستت کەوێ !
کام کیژۆڵە دەگریەنیت ! …
گۆڕی چەند کەس
ـ لە عەشرەتا : ـ دەسووتێنیت …
فەرمان دەرکە ، [illegible]ووتە
پەنجەی تاوانت هەڵدەبڕیت ،
یاخود ، شیعری من سەردەبڕیت … ؟

« 2 »

چاوم لێتە :
ئەمشەو پیادەیت …
ڕێت کەوتۆتە شاری دڵم
ـ شەرم مەکە ، میوانم بە ! ـ
دڵ ماڵتە ، بۆ لانادەیت … ؟
خۆ بێیتەوە ،
گیانی هەڵچووم دادەمرکێ …
پسوولەی لێبوردنی دڵم ،
بۆ تۆ نەبێ ،
بیدەم بە کێ … ؟

* * *

گەر شیعری من
وەك مەدالیا ،
لەبەرۆکی خۆیشت نەدەیت …
خۆ گیانەکەم ،
نامسووتێنیء و
گڕیش لەگیانم بەرنادەیت …

« 3 »

چاوت لێیە ؟
گیانی منەو مەلە دەکا لەعەشقی « خوا »
عەشقی ئەوەو ،
ڕۆژی سەدجار ، سەرم دەخوا …
لەولاتی عەشقی نامۆت ،
لەئێوارە … تا ڕۆژهەلات …
فرمێسکی من
گۆرانی بۆتۆ دەڵێنء و
شیعرەکانم دەبن بەپەرژینی بالآت …
کەچی ، نە تۆ دەمخەوێنی ،
نە مۆتەکەی ئەوینی ئەو
تەنیا ساتێك ،
وازم لێدێنێتء و دەڕوا …

---

# هۆنراوە شێتەکە

سۆران عثمان
سلیمانی

ووشەم نەما سەری نەبڕی
ووتەم نەما نەی خنکێنی
هاوار نەما کپی نەکەی
بەلام جارێ پێت نەکرا
ئازارێکم خامۆش بکەی
تەنها جارێ پێت نەکرا
لە خەونێکما میوانم بیء و
ژانەکانم بۆ سووك بکەی
تۆ پێت دەکرێ لێم تێبگەی
لێم نزیك بیء و سەیرم بکەی
بەلام جارێ بەڕێکەوتیش
ڕێی کاروانم لەگەل ناگری
من شابالی خەمەکانم دەپێچمەوەو
لەم شارە وێرانە هەڵدێم
شارێك کەتۆ تیایا بژیت

من تیا ناژیم
جێیەك کە تۆ تیایا بگریت
من تیا ناگریم
هێچگار سەیرە
دەڵێی دەگریم
بۆچی دەگریت ؟؟
بۆ بێبەختی خۆتە دەگریت
بۆ کلۆڵی خۆتە دەگریت
بڕوا ناکەم .. تەنها جارێ
خەم میوانی شەوانت بێ
بڕوا ناکەم تەنها جارێ
ئازار ئامرازی گیانت بێ
ئەگەر وایە .. ئەگەر وابێ ..!
ئەی بۆ ئازاری من ئەدەی
گەر خۆت هەست بە ئازار بکەی !

# دوو سووتان
# لە بۆتەی ئەشقێکی پیرۆز

○
سەباح ڕەنجدەر
○

هۆ ئافرەتە هەمیشە سەر بڵندەکەی
هاوڕێی شاعیرێکی شێتی هەتاو دزراو
شەو بە ترسە
بەو ناوەختە ناڕەحتم و جێم مەهێڵە
گەر سەرماتە
وەرە مەشخەڵانی ڕۆحم
تا هەڵاوی سەماوەری بوونەکانم
بتپارێزیت
لەباو بۆران وەیشوومەی چلەی زستان

* * * *

ئێ تریفەی ڕووبارێکی
نەبینراوی ژانی ڕاستی ئەم کیشوەرە
تۆ دەزانی ..؟
بۆ ڕێگای گەیشتن بەتۆ
چەندین کێوی
سەخت و دژواری وەڕسیم
داوەتە پشت
چۆڕ ، چۆڕ دەریای
ئارەقەی تاڵ و سوێرم ڕشت

* * *

دەتۆش وەرە
ڕووبەری ڕووی ناو لەپی سوتێنراوم
هێندە بەرین و خاوێنە
ڕەگی تازەی
بنەدارە بڕاوەکانی هەموو تیایە
لەکێڵگەی سینەی ئەنجام
تیشک دەڕوێ
گوڵەگەنم سەما دەکاو
دەزگیرانی برسیەکانە

* * * *

تەمەن کورتەو گۆرانی پڕ لە هەنگوینیت هەر دەڵێم و
دەدەرکەوە .. !؟
ئەی بۆخۆت ڕاتنەهێناوم
لە نهێنی بەستەی گەرووی بەفری نووستووی
زەندوڵە هێمنەکان بکەم
ئێ هەڵکەوتوە هێرۆیە خۆڕاگرەکەی
دامێن کەژی پیرە مەگروون
ئەی بۆخۆت ڕاتنەهێناوم
گەر قاچیشم ببڕنەوە
بۆ ئەو گومەزانە ڕاکەم
کۆترە کیویلکەی من و تۆی تیا ئاشقبوون

* * * *

مەڕۆ ، مەڕۆ ، مەگری هەرگیز
لەم گەشتە مات و تووشەدا
دان بەخۆدا بگرە ئازیز
بناری دوور بانگم دەکات
لەو تەنیاو ئەنگوستە چاوە
ڕێ دەردەبەم
بەسەر دڕکی تیژی پایز
هەنگاو دەنێم
شوێن پێی کاروان هەڵدەگرم
یا دەگەم بەدوا قوژبنی خۆشەویستیت
یا لەم مەڵبەندە تێرەدا
لەپاڵ ژوانێکی نوێ دەمرم !

بەرزان هەستیار / سلێمانی

# ئەمشەو

# تارمایی کۆچەکەت بوو بەشیعر

—1—

کۆچی سوورت ئاگرێ بوو ،
فریشتەی عەشقێکی شەنگی ...
کرد بە کۆڵوو
ماڵ ئاوابیت :
هەواڵی مەرگی سۆزێکی ...
سپی پۆش بوو !
نامەیەك بوو ،
لە نیوەڕۆی بەهارێکدا خوێندتەوە ،
خەزان کراسێکی زەردی ...
کردە بەری دارستان و
کانیاوی حەز هەڵپرووکا !
عەشقی ئەمەن (دوو بەهار) یش ،
لە سینەتا ، کپ بوو ،
سووتا

1983/6/17

—2—

ئەمشەو ویستم دڵ و گیانم ،
بکەمە گۆڕێکی تەنگەو
لاشەی گەرمی ،
سۆز و فرمێسك و ئازاری تیا بنێژم ،
ئەمشەو ویستم ،
باڵای ئاواتە دوورەکان لە گڵ گرم
زۆرم حەز کرد ،
بە هێمنییش لەگەڵ کۆچی تۆدا بمرم
نەمئەزانی لەپاش کۆچی ماڵئاواییش ..
هەموو شەوێ ، تریفەیەك ،
چەپکێ تیشکی بێئارامی ئەو عەشقە دێ ،
وەك چرا دامئەگیرسێنێ

1983/7/8

* * *

ئەمشەو هەر خۆم
بە بارانی فرمێسکی گەش ..
لاشەی ئەم کۆچە ناوەختەت ئەشۆمەوە ..
ئەیشۆمەوەو
زەڕنەقووتەی ئەم ووشانەش ئەجریوێنن
[[شەوە و تەنیا گیانی منە داگیرساوە
دە تۆش وەرە ئەو دەرگایە ئاوەڵاکە ،
کە دوای گۆڕانی کۆچەکەت ،
خڕ لەسەرم داخراوە]]

* * *

# سووتاو

گەر گڕی دەروون ببینرابا
بۆنی سوتانی دەمارەکان هەست پێ کرابا
نهێنییەکانی دڵ بوترابا
زمان لەم کارەدا سەربەخۆبا
ناڵە ناڵی شەوم بزانرابا
فرێسکی چاو بۆ ئەم کاتە نەمابا
قەد پێت نە ئەوتم بۆ بێڕەنگی
لە گێژاوی خەیاڵدا تۆ بێدەنگی

نفیسە حسن فؤاد

(گوڵە) تۆ خۆت ،
فیرە داگیرسانت کردووم
بۆ ئەستیرەی چاوەکانت
لە ئاسمانی هیواکانما کوژانەوە ؟
تازە بارانی گەواڵەی ، چاوانی کێ ..
لە وەرزێکی وا نەهاتا بۆت ئەبارێ ...
تا خواستی گیانت گوڵ بگرێ ؟!
وەرە (بڕیارە قورسەکەت) گۆڕەوشاردە ،
چارشێوی ئەم کۆچە بدڕەو
بچۆ میحرابی دڵەوە ...
نوێژێکی تر دابەستە ،
کچێ ئەمشەو فریشتە بە ،
وەرە خوارێ سەر لە ژوورە تەنیاکەم بە ،
گەر چی تاشەبەردی قورسی ...
« ماڵ ئاوایی » لە ئاخمایە ..
دەست درێژکە ،
تا پێکەوە ڕوحمان دەرچێ .
وەلێ[1] گیانە ،

ئاخیر نوێژە ، سپی پۆش بە ،
بیرت نەچێ ..

— 3 —

ئەمشەو هەناسای ،
مەلی شکستەی ووشەکانتە ،..
دەروونم وەکو تاڵی پەرچەمت ..
دەئاڵۆزێنێ ،
بە تاسەشەوە گوێم بۆ شنەبای ،
یەکەم ئاوازی تۆ هەڵخستووە ،
[[« دەست بەردارت نیم » ،
زامی هەورازو
ئازاری هەڵدێر ،
ئەڵقەی زنجیری هەنگاوەکانمان ناترازێنن ،
دە با بۆ عەشقی دار ئەرخەوان و
پەلکە زێرینەی ئەڤینی مەزن ..
زەماوەند سازکەین ،
ئێمە گوڵزاری دڵی یەك ئەچنین ،
نە شەستە باران ،
نە شەختە و زریان ،
نامان تەزێنن ،
دەست بەردارت نیم ،
نشێوی سەخت و
تووڵە ماری ژان ،
ئەڵقەی زنجیری هەنگاوەکانمان ناترازێنن]]

1983/7/22

— 4 —

ئێستا شەپۆلی چریکەی دەنگت ...
بۆ نامهەژێنێ ؟
ئاسمانی یادت تەم خنکانوێتی ،
یاخود شاباڵی کۆترە سپیکەی گۆرانی‌یەکانت ،
گڕی ئازارو خەم سووتانوێتی ؟

* * *

ئەتبینم ماتی و
وەك گۆرستانێ سیمات تاریکە ،
ناوێرم شەوان بێمە جێژوانت ،
(گوڵەخان) ، ئەمڕۆ عاشقێ دڵ ڕەقم ،
چەندە عەزرەتی ، دیداری ..
چرای چاوەکانتم
هێندەش حەزئەکەم ،
بمریت و کفنی سپیت تێر ماچ کەم
خاکی سەر گڵکۆت پڕ دەمم کەم و
بە کوڵ بۆت بگریم
نە تۆ ئەبیەوە پەری ژوور سەرم ،
نە شیعریش بەرگەی خەمی تۆ ئەگرێ ...
گەر هەزار ساڵیش بۆ عەشقت بژیم ..

1983/7/28

(1) وەلێ : واتە (بەڵام) .

# جیهانی خۆشەویستی

— 1 —

کاتێ خۆر قژی پەخشانی ...
بەسەر سەری بەفریڤی پیرەمەگروندا .
پەخش ئەکات
دارستانێکی چڕی پڕ کەپرو سابات
تۆی هەڵۆی لەکۆش گرتوەو ...
لەهاوڕێیەکی ئەبەدی ،
ئەم سرووشتە ڕەنگینە ئەچی
بەفر کراستە !
ئەستێرەی جوان چاوەکانتەو ..
لەشەوانی تەنیاییمدا دائەگیرسێ ی
لەچاوەکانی شارەکەمدا
تۆ دەبینم
چا نازانم
لەدڵی شارەکەمدا ئەژیت !!
یان شارەکەم لەدڵتایە ؟!

— 2 —

کە دەچمە ناو جیهانی غەریبی یەوە
گۆرانیەکانی « حەسەن زیرەك » و « مامڵێ »
دێنەوە گوڵزاری یادمو ئەگەمەوە
دەرگای شارە بەفرینەکەم
واهەست ئەکەم ....
هەناسەکەم ...
سرووشت وەکو ئافرەتێکی شەنگی ناسك ،
ئەخش ئەکات
تۆی دڵداریش گیانی خۆتی پێشکەش ئەکەیت
لەچاوە هەڵۆییەکانتەوە
تیشکی زێرین و پیرۆزی خۆر ئەبینم !
لە هاوبیریکی وەك تووە ...
تۆ بەجیهانی خۆشەویستی ئەبینم !!

**شیعری : ئاوات کامیل**
**سلێمانی 1982/5/24**




**هیمداد حوسێن**
**کۆلێژی ئەدەبیات ـ بەشی کوردی**

به هێمنی لەنێو پەنجەکانیا هاتیه دەرەوە ، بەنەرمە ڕاکردنێك لێی دوورکەوتیەوە ، بەین بەینەش ئاوڕێکت لێدەدایەوە .

«مەبەست» لەنێوان چوار دیواری ناختا بەندکرابوو ، ئەمجارە (ئەو) بانگی کردیەوە ، ئێستێکت کردو لەجێگاکەی خۆت ڕەق وەك بزمارێکی لە دار کوترای جووڵەت نەکرد ، (ئەو) بە ڕاکردن هاتەوە لات و دەستی لەملی کردیەوەو لێوی لەسەر لێوی دانایەوەو گشت دەم و چاوتی لستەوە ، شەکەت بوون ، هەردووکتان هەناسە بڕ بوون . ڕیزێ دڵۆپی ئەسرین لە وێستگەی چاوەکانیا بەڕێ کەوتن و بەکوڵمە سوورو سپی یەکەیدا شۆڕبوونەوە . لەوکاتە چەند حەزت دەکرد هەر بۆ ساتێ سەرداری جیهان بوایتایەو یاساکانی سروشتت لەژێر دەست بووایەو خۆت و ئەوت لەوکاتەی دەست لەمل بوون ڕەق بکردایەو بەجووتە دوا هەناسەی ژیانتان بدابووایە . کە بۆ جاری دووەم لەنێو پەنجە لەرزۆکەکانی هاتیە دەرەوە ، «ئەو» پەنجە لەرزۆکەکانی بەدەم و چاویەوە نووساندو تۆش هەناسەیەکی دووکەڵاویت لەسینەی گەرمت بەڕێ کرد . ووردە ووردە هەنگاوت ناو لێی دوورکەوتیەوە تاله‌چاوان وون بووی ...

* * *

لەو کاتەوە ڕا تائێستاش (ئەمڕۆ ڕۆژی یەکشەممەیە) چاوت بەچاوی نەکەوتۆتەوە ، تۆ چوویتە سەربازی یەکەت و ئێستا وا ماوەی ساڵێکیشە تەواوت کردووە . ئەوابوو بەچوار ساڵ چاوت پێ نەکەوتۆتەوە ، لێوت تامەزرۆی ماچێکی

گەرمیەتی ، چاوە زیتەکانت لەعەرزەکە دەروانێ وەك بڵێی «دنیا لە ناو جوانی ئەوا توابێتەوە وایە»* . بانگ کردنی بـرا بچکۆلەکەت لە دەریای بیرکردنەوەو خەیاڵی پەرت و بڵاو ڕزگاری کردی .

- کاکە داکم دەڵێ بێ نانەکەی بخوا .

تەکانتدا خۆت هەڵسیەوە ، هەموو لەشت داهێزرابوو ، سەر ئەژنۆکانت ژانی دەکرد ، وەك یەکێکی مەست بەم لاو بەولادا دادەچووی ، چوویتە ژوورەکەی ترتان ، دانیشتی ، دوو سێ لوقمە نانت خواردو هەڵسایت ، دایکت ووتی :

- کوڕم ئەوە لۆ نانەکەت نەخوارد

- خواردم ، بەسە

هاتیەوە ژوورەکەی خۆت . ئەمڕۆ لە بازاڕ (بەختیار)ی هاوڕێت بینی ، دەمێك بوو یەکترتان نەدی بوو ، یەکترتان ماچ کردو بەبینینی یەکتر شاد بوون ، بۆی باس کردی ئەوە دووساڵە ژنی هێناوە ، کوڕێکی نێو (بەڵێن) ی هەیە . تۆش زۆر بەگەرمی پیرۆزباییت لێکردو هیوای ژیانێکی کامەرانیت بۆ خواستن ، ئەمجا (بەختیار) داوای لێکردی ئەوە بۆ جارێك سەرێکیان نادەی و هەر بەجارێ بزر بوویت ، تۆش دوای ئەوەی بەختیار پێی ووتی ماڵەکەیان لەکوێیەو هەمدیسان داوای لێکردی دەبێ هەر بێی ، بڕیارتدا ڕۆژی هەینی دوای نیوەڕۆ بچیتە لایان . .

* * *

(ئەو) دڵپاك بوو ، ڕاستگۆ بوو ، بەڵام ئەوەی ئێوەی لێك جیاکردەوە سەربازی‌یەکەت بوو ، هەر دوای ماوەیەك کە بەئیجازە گەڕایتەوە ماڵی (ئەو) باریان کرد بوو ، نەتزانی بوکوێ چوو بوون .. کۆمەڵێ ئازارو خەفەت و ژانیشی بۆ تۆ بەجێ هێشت بوو ، ئەوەی هەموو جارێك فەرامۆشی بە دڵت دەبەخشی وێنەکانی نێو ئەلبومەکەت بوو ، لەگەڵ سەیر کردنی هەر وێنەیەك بزەسەر لێوانی دەگرتی ، بەڵام لە ناختدا وورده وورده دەتوایەوەو پێکی شادی‌و مەرگت بەسەر گیانتا قلپ دەکردەوە ... سەیرکە ئەوە وێنەی یەکەمە ، خۆت و (ئەو)ن لەباخی (گلکەند)** بە جووتە دانیشتوون ، هەردووکتان شادی لە ڕووتانەوە دەباری ، ئەوە وێنەی دووەم و سێیەم و دەیەم و ...

* * *

ڕۆژی هەینی دوای نیوەڕۆ لەماڵ دەرچوویت و سواری پاسی (خەبات) بوویت ، لەسەر هەمان ناونیشان ڕۆیشتی ، کە هاوڕێکەت (بەختیار) بۆی دەست نیشان کردبووی ، گەیشتیە کۆڵانەکەی ئەوان ، بەڵام لە یادت نەمابوو چەندەمین دەرگا هەوبوو ، منداڵێك یاری دەکرد ، پرسیاری ماڵی (بەختیار)ت لێکرد ، پەنجەی بۆ چوارەمین دەرگا درێژ کرد ، لەبەر دەم دەرگاکەیان ئیستێکت کردو پەنجەت خستە سەر زەنگەکەیان .. (ئەو) دەرگاکەی کردەوە ، چاوەکانت هەڵگلۆفتی ، زۆرت لەلاسەیر بوو ، ئەمە خەیاڵە یا بە ڕاست (ئەو)ە . لێوەکانت ووشك بوو ، تاکە ووشەیەکت لەزار نەهاتە دەرەوە ، دەتووت تۆ لەوەتەی لەدایك بوویت هەر لاڵ بوویت ، (ئەو) یش لەشوێن خۆیەوە وەك بەستبیەتی جووڵەی نەکرد ، لەوکاتە بەختیار بە کراس و بیجامەیەکەوە دەرکەت و ووتی :

- کاکە ئازاد دەفەرموو ..

هەنگاوت بەرەو ژوورەوە نا ، بەڵام چۆن هەنگاو نانێك ، وەك شەل و گێرێك ، ڕەنگت زەرد هەڵگەڕا بوو ، دانیشتی و بەخێر هاتنیان کردی .. دوای ماوەیەکی کەم (ئەو) چای هێناو چایەکت هەڵقوراندو هەڵسایەوە ، بەختیار پێی سەیر بوو ، ئەو هاتنەت لەچی و ئەو پەلەپەلیەت لەچی ؟ ، بۆیە پێی وتی :

- کاکە ئازاد لۆوها بە پەلەی ؟ ، دە دانیشە ئێوارە لای خۆمان بەو باشیوەکی چاکت لۆ بکەین .

- سوپاس ، با لۆ جارەکی دی بی ، ئەورۆ هەندە ئیشم هەیە .

ئەمەت ووت و خواحافیزیت لێکردن .

* * *

کە گەڕایتەوە بەپەلە چوویتەوە ژوورەکەت و وێنەکانت لە ئەلبومەکەت دەرهێناو لەباخچەکەتان ئاگرت تێ بەردا ، وێنەکان تەواو ڕەش بوون و سووتان ، سەرێکت بۆ ئاسمان بەرز کردەوە ، ئاسمانێکی بێ‌گەرد ، ڕەوە باڵندەیەکیش تێ‌پەڕین تا لەبەرچاوت وون بوون ، شەپۆلی دەریای بیرکردنەوەی تۆش هێور بووەوە .

داوای خۆشبەختی و ژیانێکی کامەرانیشت بۆ ئەوان کرد .

* : نیوە دێڕی شیعرێکی مامۆستا (ئەحمەد هەردی) یە .

** : باخی گلکەند لەشاری هەولێرە .

شانۆیی یەکە لەیەك پەردەدا

# لێو بەبارەکان

نووسینی : جەلیل ئەلقەیسی

وەرگێڕانی : نەژاد عزیز سورمێ

ژووریكی بچووكی دانیشتن بەناوماڵیكی ساكارەوە .. ئەو دیوارەی رووی لەجەماوەرە پەنجەرەیكی پان وبەرینی تێدایە ، دەڕوانێتە سەر شەقامێكی لابەلا . كتێبخانەیكی بچووك پاڵی بەپەنجەرەكە داوە ژمارەییكی كەم كتێبی تێدایە . ئاوێنەیەك بەدیوارەكەوەیە ، لەتەنیشت كتێبخانەكەدا مێزێكی بچووك ، تەلەفۆنێكی لەسەرە . لەلای چەپی پەنجەرەكەدا نەخشەیكی قەوارە مام ناوەندی جیهان و چەند وێنەیكي رەنگاورەنگی منداڵان لەباری جیاجیادا . وێنەی ژن و مێردێك لەچوارچێوەیكی جواندا . چەند كورسی یەك .. مێزێك قاپی عارەقی لەسەرە .. پەرداخێك .. چەند ئامانێك ..

**مێرد** : (پیاسەی لەژوورەكەدا دەكرد .. ناوە ناوەیش تەماشایكی سەرمێزەكەی دەكرد كەقاپە عارەقەكەی لەسەرە .. هەناسەیێك هەڵدەكێشێ .. بەدەنگی بەرزەوە ) : بەفرەكە لەبیر نەكەی .

**ژن** (لەدووروە دەنگی دی) راوەستە ! (پاش نەختێ دێتە ژوورەوە ، دەفرێكی پێیە بەفری تێدایە - ژنەكە چل ساڵ دەبێ هەروها مێردەكەیشی)

**مێرد** (بەدڵخۆشی یەوە) ئایا دەزانی عارەق بەچی دەشوبهێنم ؟

**ژن** : تامی یان رەنگی ؟

**مێرد** : (فڕێك لێ دەداو زمانێك بە لێوی دادێنێ) : بێگومان تامەكەی .. بەترشی كبریتیك دەچێ .. تۆهاوكێشەی ترشی كبریتیكت لەبیرماوە ؟

**ژن** : (بیردەكاتەوە) : وابزانم ( H SO) ە

**مێرد** : (دەست لەدەستدەدا) ئافەرین .. تاكە هاوكێشەیكە كەتائێستاش لەمێشكمدایە ..

**ژن** : (بەقێزەوە) سەرم سوڕماوە ، تۆ چۆن ئەو ئاگرەی لەهەناوت دەكەی !!

**مێرد** : (فڕێكی تری بەسەردادەكا) دەمەوێ هشیار ببمەوە .. (هەڵوەستێك .. سەرخۆشێك تێدەپەڕێ ، لەبن لێوانیش گۆرانیەكی بەغدایی خەمناك دەڵێ . )

**ژن** : (بەگاڵتەوە) ئەوا ئەویش هشیار دەبێتەوە !! (هەناسەیێك هەڵدەكێشێ) سەعاتێكی دی ، یالەوانەیەزیاتر ، وەك زەردەواڵە لەشەقامەكاندا بڵاودەبنەوە .. گۆرانی دەڵێن .. دەگرین و ئاخان هەڵدەكێشن .. (هەڵوەستێك) .. من لێت دەپرسم ، تۆ گریانی سەرخۆشەكەی دوێنی شەو ، لەسەر شۆستەكە بەچی لێك دەدەیەوە ؟ دەڕشایەوەو لەمیانی هەردوو هۆقژنیشیدا

هـاواری دەكـردو سـوور بـوو لەسـەرئـەوەی زۆری نەخواردوتەوە ، تەنها ئەوە ئازاری دەدا ، گۆیابرادەرەكـەی قسەیكی ناشیرینی پێ گووتووە ..
**مێرد** : هەرچۆنێ بێ دڵخۆش بوو .
**ژن** : (بەسەرسامی یەوە) دڵخۆش بوو ؟ ئای لەو دڵخۆشی یـە قوربەسەریە !!
**مێـرد** : نیشانـەبەونیشـانەش كـەهەستـایەوە بـڕوا ، تێ ی هـەڵكـردبـوو گـۆرانی دەگـووت .. هشیـار دەبـووەوە .. ئائابڕوابكە ..
**ژن** : ئەم قسانە دادت نادەن .. ئەی تۆ ؟! ئای هەی .. باوەڕت بێ تۆیش كەئەو ئاگرەی دەخۆیەوە تادەمری هشیار نابیەوە ..
**مێرد** : (تەماشایكی دەكاو هەناسەیكی قووڵ هەڵدەكێشێ) باڵە باسێكی تر بدوێین دەفەرموو .. بدوێ ..
**ژن** : ئۆهـ .. كەهیلاكم ..
**مێرد** : تۆعادەتە ..
**ژن** : خۆزگە جارێك كەدەڵێم هیلاكم پێت بڕوادەكردم .
**مێرد** : (گاڵتەی لەگەل دەكا) : چەند سەعاتانت چـاوەڕێ ی پاسەكەكرد ؟
**ژن** : (بەكورتە نارەزاییكەوە) : تۆ بەڕاست ، بڕوام بێ ناكەی كەدەڵێم چاوەڕێ دەكەم .. هەموو ڕۆژێ .. هەندێ جار بەلانی كەمەوە خۆی لەسێ چارەك سەعات دەدا (بەوەرسی یەوە) ئای .. ئەوچاوەڕوانی یە لەعنەتی یە لەكاتی ئیش كردنەكە مانـدووترم دەكا . (بێ دەنگ دەبێ .. هەردووكیان بێ دەنگ دەبن ، تەنیا لەیەكەوە رادەمێنن . )
**مێرد** : بێ دەنگی بێزارم دەكا .. دەمكوژێ .. بەڕاست خۆ ئێمە دوێنی یش باسی پاسەكەمان كرد (بـەپێكەنینـەوە) : بدوێ .. گرینگترین شت ئەوەیە قسـەبكەی .. بێ دەنگی وەنـەوزێكی گرانم بەسەردا دێنێ ..
**ژن** : بـەلام ڕۆحـەكـەم تـۆچـاك دەزانی قسـەكـردن چی لێ دەسەنگرێتەوە ..
**مێرد** : دڵنیابە هیچی لێ ناسەنگرێتەوە .. (بەگاڵتەجارییكەوە) كـاتێ بـەوێنـەی بـەرد بـەرەورووم دادەنیشی و بـەنیگـای .. (دەوەستێ بەدوای وشەیكی لەبار دەگەڕێ ..) بەنیگای وێڵەوە تێمەوەرادەمێنی وەك بڵێ ی (بەپێكەنینـەوە) بۆیـەكەم جـارە دەمبینی ..

**ژن** : (زەردەمسكە دەبێتەوە) چونكە منبـائاشكـرا پێت بڵێم نـامەوێ دانیشتنـەكەت لێ تێـك بدەم .. (بـەنازەوە) دیسـان كـاتێ دەخۆیـەوەو هێدی هێـدی خواردن دەهـارِی زۆرجوانم دێ یە بەرچاو ..
**مێرد** : (فرێكی درێژلێ دەدا) ئەللاهـ .. ئـەللاهـ .. دەئاوا .. باسی شتی خۆش بكە .. تۆیا بێ دەنگ دەبی ، یاكە هاتیتەگـۆ بەشوێنە ناسكەكانمەوە دەدەی .
**ژن** : (بەنازەوە) جابلێ ی ڕاست بێ تۆشوێنی ناسكت هەبێ ..
**مێرد** : بۆنا ؟ بۆنموونە من لەئاست جوانی تۆدا بێ دەسەلاتم .
**ژن** : (چەپەلەیك لێ دەداو بەتـەوسێكی نازئـامێزەوە) : ئـاهـ هاهاها ، شتێكی تربلێ .. رۆحەكەم ، تۆهێشتا پێكی یەكەمت تەواو نەكردووە .
**مێـرد** : (بەدڵنـەوایییەوە) تـەنـانـەت چـەنـەبـازیـەكـەشتم پێ خۆشە .. تۆدەزانی لەباس و خواسی خۆشدا چەنەی ، چاك لێ دەدەی ؟!..
**ژن** : وابزانم وەختی هات بێ دەنـگ بین (ژنـەكە هـەڵدەستێ پیـاسە بـە ژوورەكەدا دەكـا .. دەڕوا تادەگـاتەلای وێنـەی منداڵەكان ، پاشان چاوێك بەنەخشەی جیهانـدا دەخشێنێ ، فیكەیكی درێژ دەكێشێ ..) ئۆۆ .. ئێستاكە لە (بەرشەلۆنەیە) چـەند ڕۆژێكی دی دەگـاتە (مـەدرید) دوایش یـەكسـەر بـۆ (پاریس) .
**مێرد** : بەرێوەبەرەكەتان ، وانی یـە ؟ .. حەفتـەی یەكـەمی مانگی ئایندەیش لەلەندەنە .
**ژن** : چۆنت زانی ؟
**مێرد** : تۆ .. ئاهـ .. گـوێت لێ بێ .. ئەرێ بـۆچی ئافـرەتان ئەوەندە چەنەبازن ؟
**ژن** : باشەباوابێ .. بەلام تۆ دەزانی چەند قسەت كـردوون لەكاتێكدا هێشتا نیوپێكت نـەخواردوتـەوە ؟ (بەگـاڵتەوە) .. گوێگرە ! گـرەوێكی لەسەر نیـوسەعـات بێ دەنگی دەكەی ؟ (بەسنگ دەرپەڕاندنێكەوە) بەلێ تەنها نیو سەعات و بەس .
**مێرد** : گرەوبكەم ؟ لەسەرچی ؟
**ژن** : بەكەیفی خۆت
**مێرد** : (بەپێكەنینەوە) بێ گومان خواردنەوەو جگەرە ناچنە ناو مەرجەكەمانەوە .
**ژن** : هەروها چنینیش .. رێك كەوتین ...

**مێرد** : (بەتووڕەییەوە) ئاخ .. یانی تابەرەبەیان لاڵبین .. گوێت لێبێ خۆشەویستەکەم دەسگەمەی چنین تۆقێنەرە ..!
**ژن** : (بەبێ موبالاتو بەنازەوە) دەمانەوێ راستی چەنەبازی بسەلمێنین .. (هەڵدەستێو کەڵو پەلی چنین دێنێ) باشە .. رێککەوتین .. بادەست پێبکەین . (بەدەست ساردییەکەوە دەچنێ .. مێردەکەی دەخواتەوە .. جگەرەیەك دادەگیرسێنێ .. نیگای خێراخێرا تێك دەگرن .. هەڵسووکەوتی ژنەکە سارده بەلام تەماشای مێردەکە بەتووڕەیی دەشکێتەوە .. خێراخێرا بەردەوام دەخواتەوەو جگەرە بەبا دەدا .. هەڵدەستێ .. دادەنیشێتەوە .. بەتووڕییەوە رەفتار دەکا .. دەڕوا ، لەدوایشدا دەداتە قاقای پێکەنین .. )
**مێرد**: ئەمە گرەوێکی پووچو بێمانایە .. ئانا پووچو بێمانایە !
**ژن** : (بەساردییەوە) داخۆ راستە ژنان چەنەبازن ؟.. (دەنگی موسیقای جاز لەنهۆمی دووەمین دێ ..)
**مێرد** : (تووڕەدەبێ .. بەئەژنۆی رادێ) : دیسان ئەو بێعارە گەڕایەوە سەرخووە پووچەکەی شەوانەی (نەختێ زمانی لەنگ دەکا) کە دەنگی ریکۆردەرەکە بەم موسیقایەوە بەرزدەکاتەوە مێشکی سەرم تێك دەدا ، بۆچی بەم گێرە شوێنیە ، بۆ ؟ بۆ ... (روو لەژنەکەی دەکا) : بەدایکت وت بەم کسوکە کەرە بڵێت کەئەم موسیقایە بەوهەموو هەرایەوە ، مێشکم دەڕوشێنێ دەشلەژێم تەنانەت عارەقەکەیشم لە کەللەدا دەفرێنێ ..
**ژن** : پێموت ، قەولیدامێ کەچیتربواری نادا دەنگی ریکۆردەرەکە بەرزبکاتەوە ... ئێیهێی .. ئای لەو هەرزەکارە .. (وەستان) رێکەوتی نەکردووە بتدیبێ ؟
**مێرد** : نامەوێ تولازێکی نارەحەتی وەك ئەوە ببینم !
**ژن** : (بەساردییەکی سوز ئامێزەوە) : مناڵە .. ناسکۆکەیە .. قژێکی سپیسیهەیە .. دەمو چاوی لەپشیلە دەکا .. ئەوەندەی دڵمەشکێنە ، نادیە لەوی زیاترنییە .
**مێرد** : (بەتووڕییەوە) : قژی سپیسە .. ناسکۆکەیە .. دەموچاوی لەپشیلەدەکا .. بەلام ئەمقژسیسە ئەگەر هەروابمێنێتەوە هەموو ئێوارەیێ پێنج شەش جارانم ئەو موسیقایە بۆلێبدا ، حەیاتم لەبەردەبڕێ .. هەموو ئێواران دانیشتنەکەم لێتێك دەدا .. (موسیقا بەردەوام دەبێ .. پیاوەکە دەچێتە بەر پەنجەرەکە .. دەیکاتەوە هاواردەکا) : کوڕە ئەو دەنگەکەم کەرەوە !.. کوڕە کەرە ! ئەو دەنگە کەم کەرەوە ! (ئاورێك لەژنەکەی دەداتەوە) : هەستە برۆ بەنادیە بڵێ ، ئەگەر ئەوئاژاوەچی یە کەرِوسیسە ، وازلەو خووە پووچە نەهێنێ دێم بەخۆم تەمێی دەکەم !! (ژنەکە کەڵو پەلی چنین دادەنێو هەڵدەستێ دەچێتە بەرپەنجەرەکە .. لەوکاتەدا دەنگی موسیقانزم دەبێتەوەو هێدی هێدی نامێنێ ..)
**ژن** : (پێدەکەنێ) ئووهـ ! روحەکەم ، دوای ئەمانەش هەرژنان چەنەبازن .. ئێوە کەمێرمندالن ، تێکەڵو پێکەڵو رژدن .. لەهەرزەکاریدا سەوداسەرێو تووڕەبوونو هەڵچوونو زۆربلێی . (بەچرپە) کە دەشبنەمێر .. (پێدەکەنێ) ئەویش خۆت دەیزانی .. گرەوەکەت دۆڕاند .. هاها .. ها . داخۆ راستە کەژنان چەنەبازن ؟
**مێرد** : (ساردبووەوە .. بەدڵنەواییەوە) : لەگەڵ پیاواننا .. لەگەڵ هەندێ ژن .. (وەستان) گوێت لێبێ ! جارێ خوێندمەوە کە هەندێ ژنومێردی ئینگلیز کەلەیەك ماڵدا دەژین ، دەبینی چەند مانگان یەکتری نادوێنن .
**ژن** : ئێع !.. بەلام بەمرادەیە قسەی قۆڕە .. باشە ئەدی چۆن لەیەکتری دەگەن ؟
**مێرد** : (بەچەند جوولەیێکی پانتۆمایم قسەی بۆدەکا وەك : ئادەی پالتۆکەم .. دونیاسارده .. نیوروژێکی چاکم دەوێ .. شەپقەو چەترەکەم کوان ؟ درەنگم لێداهات .. دەبێ لەکاتی دیارکراودا بگەمەجێ .. ئای .. کەپاسەکە دواکەوت .. چەتروشەپقەکەی دادەنێ .. ئای کەهیلاکم .. )
**ژن** : (پەنجە بۆ زمانی رادێڵێ) : ئەی ئەمە بۆچییە ؟ ئەو هەموو ناماقوولییە بۆچ ؟
**مێرد** : (فرێك لێدەدا) بەخوێن ساردییەکەوە .. تۆپێش ماوەیێ لەسەر بێدەنگی شەرتت لەگەڵمن نەگرت ؟
**ژن** : بۆنیوسەعات یاسەعاتێك زۆر زۆری ئەگەر بەتووڕە بوونیش بێ رۆژێك زیاترنابا ، وەئەمما بۆسالیك .. ئێع .. ئێع ...
**مێرد** : (پاش بێدەنگی) ئەهاهـ .. کەبێدەنگیش هەندێ جار شتێکی جوانە
**ژن** : هەندێجار ؟؟ (وشەکان لەبەریەك دەکێشێتەوە) هەندێ جار ... راستە .. تەواوە .. بەراست تۆ بێدەنگیت خۆش

